# خاتوونی زەنگین

## پەرتووکێک بۆ تۆی خانم، بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی

چونکە پێم ناخۆشە فرمانم بەسەردا بکرێت




کیم کیۆساکی

بەکوردیکار
تاژان جەبار

چاپی دووەم

ناوی کتێب: خاتوونی زەنگین

نووسینی: کیم کیۆساکی

جۆر: ڕۆشنبیری دارایی

بەکوردیکار: تاژان جەبار

هەڵەچن: ئاسیا ئیحسان

دیزاین: دیدار زانا.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

ساڵ: ٢٠٢٠

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ( ٢٧٧٤ )ی ساڵی ( ٢٠١٩ )ی پێدراوە .**




"ئەم کتێبە، پێویستی سەر شانی هەموو خاتوونێکە کە بیخوێنێتەوە. ئەو خاتوونانەی کە نیازیان نییە دەست لە کەس پان بکەنەوە. ئەمڕۆ، لە هەموو کات زیاتر پێویستیان بە خوێندنەوەی ئەم پەرتوکەیە"

دۆناڵد ترەمپ

سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

## پێشەکی:

دەزانم شتێکی کەمێک نامۆیە! لەم ڕۆژەدا کە بەشێکی زۆری گەنجان دەناڵێنن بەدەست کێشەی بێکاری و بێزاربوونیان لە ماڵەوە، وە خانمان پشکی شێریان بەرکەوتووە لەم کێشەیەدا، دەزانم کە نامۆیە پێتان بڵێم کتێبێک لە نێوانی دەستەکانتایە کە باس لە سەرکەوتنی دارایی و بوونی بزنسی خۆت دەکات. وەلێ لە بنەڕەتدا، هەر ئەو ڕاستییەی کە وای لە تۆ کردووە لاپەڕەی پەرتووکێکی لەم جۆرە هەڵبدەیتەوە، خۆی لە خۆیدا واتای ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ شایەنی ئەو سەرکەوتنەیت.

پێویستی دایکی داهێنانە. هەتا پێویستیەک بوونی نەبێت، داهێنانێک دروست نابێت. بۆیە بە بۆچوونی ئێمە هەر ئەو پێویستیەی خانمان هەیانە بە ئیش و پارە و سەربەخۆیی دارایی، بەسە بۆ ئەوەی کە تێبگەیت تۆ لە هەمووکەس زیاتر، وە ئێستا، لە هەمووکات زۆرتر، تۆی خانم پێویستیت بەوە هەیە خۆت خاوەنی سەرکەوتنی خۆت بن و چاوەڕوان نەبیت هاوسەرەکەت وەک دێوەکەی عەلادین خواستەکانت بۆ بهێنێتە دی.

لەم ڕۆژگارەدا، کە زۆرینەی خانمان وەک کاڵایەک سەیردەکرێن لە شوێنی ئیشەکانیاندا و زۆرینەی خاوەن کارەکان پێش ئەوەی سەیری (سی ڤی)ەکەی بکەن، سەیری لەش و لاری دەکەن. لەم ڕۆژگارەدا کە ڕێژەی جیا بوونەوە هێندە زۆر بووە. لەم ڕۆژگارەدا کە ژیان قورستر بووە لە جاران و پیاو بە تەنها توانای پڕکردنەوەی گشت پێداویستیەکانی نییە، ئێستا و ئەم ڕۆژگارە

باشترین و گرنگترین کاته بۆ ئەوەی تۆی خانمیش قۆڵی لێ هەڵماڵیت و چاونەترسانە خۆت بسەلمێنیت.

ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە کە تۆی خوێنەر تێبگەیت ئێمە ئامانجمان نییە خانمان و پیاوان سەنگەر لەیەکتر بگرن و دژی یەکتر بووەستنەوە. ئەوەی ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین ئەوە نییە کە خانمان هان بدەین دژی پیاوان بووەستنەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە! ئەوەی ئێمە بەدوایدا وێڵین، درووستکردنی ژیانێکە کە مانای تەواوی "ژیانی هاوبەش" بدات. ژیانێک کە تیایدا هەردوولا لە هەوڵدان باری شانی یەکتر سووک بکەن و دەست لەناو دەست بن بۆ گەیاندنی مەشخەڵەکە تا کۆتایی ڕێگا.

هەمان ئەوەی کە لەسەرەوە باسی دەکەین، خۆمان وەک دوو هاوسەفەری ڕێگە لە پرۆسەی جێبەجێکردیداین و تۆش هەرکات ئەم کتێبە بووە مایەی هاندانت، یان بووە مایەی ئەوەی یەکەم هەنگاوی پارەپەیداکردنت پێ بنێت، ئێمە لە پەیجی (زەنگین) چاوەڕوانتین گوێبیستی ئەو مژدە خۆشە بین و دڵنیا بینەوە لەوەی کە ماندووبوونمان بەفیڕۆ نەڕۆیشتووە. چاوەڕوانتین.

**تاژان وتەها**

www.instagram.com/zangiin

# پێرست





Scanned with CamScanner

چەند دەستەواژەیەک، پێش خوێندنەوەی پەرتووکەکە بیانزانە:

**پارەهێن** : واتە هەر شتێک پارەت بۆ بهێنێت. وەک کرێ خانوو، بزنس، قازانجی کار

**پارەبەر** : هەر شتێک کە پارەت پێ خەرج بکات. وەک: کرێی تەکسی، خەرجی ئۆتۆمبێل و پێداویستی ماڵ.

**قازانجی مانگانە** : هەر بڕە پارەیەک کە قازانجی ئیشە و مانگانە دێتە دەستتەوە.

**قازانجی یەکجارەکی** : هەر قازانجێک کە لە ڕێگەی فرۆشتنی کاڵایەکەوە بە یەکجار دەستت دەکەوێت، وەک فرۆشتنی زەوی و خانوو و ئۆتۆمبێل.

**داهاتی ئاگایی** : ئەو داهاتەی کە لە ڕێگەی ئیشێکەوە دەستت دەکەوێت، کە خۆت لە ئیشەکەدایت و ئاگاداریت.

**داهاتی نائاگایی** : هەر داهاتێک کە لە ئیشێک، یان شوێنێکەوە بەدەستت بگات، کە خۆت لە ئیشەکەدا نیت و ئاگات لێی نییە.

**سەربەخۆیی دارایی** : ئەو دۆخەی کە تیایدا هیچ پێویستت بەوە نییە چیتر کار بکەیت.

**داهات** : کۆی گشتی ئەو پارانەی دەستت دەکەوێت.

**قازانج** : ئەو پارەیەی دەستت دەکەوێت، دوای ئەوەی (خەرجی)ی لێ دەردەکەیت.

**بازاڕی ئاڵ و گۆڕ و پشکسازی** : ئەو بازاڕەیە کە تیایدا پشکی کۆمپانیاکان دەکڕیت و دوای ئەوەی کۆمپانیاکان ئاستیان بەرز دەبێتەوە و قازانجێکی باش دەکەن، دەتوانیت پشکەکە بفرۆشیتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە مانگانە قازانجی کۆمپانیا دەدرێت بە خاوەن پشکەکان.

# پێشەکی:

## بۆچی کتێبێک دەربارەی خانمان؟

لە دنیای وەبەرهێناندا، چۆنیەتی ئیش کردن و بازرگانی کردن و کڕینی موڵک و پشک و بازاڕی ئاڵ و گۆڕی دراو و قازانج و زیان، چ لەلایەن پیاوەوە بکرێن و چ لەلایەن خانمانەوە بکرێن هەمان شتە و یەک دەنک فەرق ناکات. چونکە بازاڕ ڕەگەز ناناسێت و نازانێت ئەو کەسەی مامەڵەی پێوە دەکات پیاوێکە، یان خاتوونێکە . ئەی کەواتە بۆچی پێویستمان بە کتێبێکە دەربارەی خانمان بە تایبەت؟

وەڵامەکەی ئاسانە: ئاشکرایە کاتێک باس دێتە سەر بابەتی پارە و مامەڵەکردن، خانمان لە ڕووی مێژووی کارکردن و لە ڕووی دەروونی و مێشکی و هەست و سۆزەوە جیاوزترن لە پیاوان. جا ئەم جیاوازیانە، وای کردووە کە زۆربەی خانمان هیچ بەرچاوڕوونیەکیان نەبێت لە دنیای پارە پەیداکردندا .
هەر ئەو جیاوازیانە، وای کرد کە کتێبێک بنووسم تایبەت بە خانمان و پیاوانمان لێ جیاکردەوە.

پێم خۆش نییە فرمانم بەسەردا بکرێت.

ناونیشانە لاوەکیەکەی کتێبەکە ڕێک و ڕەوان لە قووڵایی دڵمەوە هەڵقووڵاوە. دوانیوەڕۆیەک، لەگەڵ ڕۆبێرتی هاوسەرم و کۆمەڵێک هاوڕێ و ناسیاو، نیوەڕۆخوانێکمان ساز کردبوو. بەدەم نان خواردنەوە باس و خواسی کتێبەکەی من هاتە پێشەوە. خۆم ساغ کردبووەوە لەسەر ناونیشانی سەرەکی کتێبەکە کە "خاتوونی زەنگین" بێت، بەڵام دڵنیا نەبووم لە ناونیشانە لاوەکیەکەی.

ئیتر هەرکەسە و پێشنیاری ناوێک یان دێڕێکی دەکرد. ڕۆبێرت سەیری کردم و ووتی: باشە پێم بڵێ بۆچی هێندە حەزت لە سەربەخۆیی داراییە و خەونی پێوە دەبینیت؟ دەزانم ئەمە خەونێکی تازە نییە و تۆ لەوەتەی هەیت هەر حەزت لە سەربەخۆیی دارایی بووە. بەڵام هۆکارەکەی چییە؟ ئەو پاڵنەرە چیە کە وات لێدەکات بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی هەمووشتێک بکەیت؟

من و (سوزی) هاوڕێم لەپاڵ یەکدا دانیشتبووین. جا من و (سوزی) بیرکردنەوەمان زۆر لەیەکەوە نزیکە. سەیرێکی یەکترمان کرد و پێکەوە ووتمان: چونکە پیمان ناخۆشە فەرمانمان بەسەردا بکرێت! پاشان کەوتینە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانەی کە تیایدا کەسێک فەرمانی بەسەردا کردووین و ئێمەش کاردانەوەمان هەبووە. چونکە پێمان قبووڵ نەکراوە کەسێکی تر ڕێگەی ژیانمان بۆ هەڵبژێرێت. دەزانم کە ئێستا زۆرینەی خانمان لێم تێدەگەن کە مەبەستم چییە. لەوانەیە تۆ یەکێک بیت لەو خانمانە.

قسەکانم کۆتایی هات و سەیرم کرد هەموویان سەیری منیان دەکرد و پێدەکەنین. ڕۆبێرت ووتی: وابزانم ناونیشانە لاوەکیەکەمان دەستکەوت.

## لە تەمەنی منداڵیەوە

هەر لە منداڵیەوە حەزم لەوە نەبووە کە پێم بڵێن چی بکەم و چی نەکەم. بیرمە لە باخچەی منداڵان بووم، لە هەموو منداڵەکانی تر زیاتر لە دەرەوە بووم. نەمدەویست بخەوم، نەمدەویست لەگەڵ هاورێکانم یاری بکەم، دەمویست پەنجەکانم و وێنەکان ڕەنگ بکەم، نەک گوێ لە چیرۆکەکان بگرم. نەمدەویست خواردنە ناخۆشەکانی چێشتخانە بخۆم و لە بری ئەوە، لە ڕاڕەوەکاندا دەمامەوە و نەئەچوومە چێشتخانە.

مامۆستاکان بە کەلەڕەق و لاسار ناویان دەبردم، بەڵام من لاسار نەبووم، تەنها پێم خۆش نەبوو بە فەرمانی ئەوان هەڵسوکەوت بکەم و تەواو. دوو جار لە هەمان ئیش دەرکرام. نەک لەبەر ئەوەی تەمبەڵ بووم، نا، ڕێک بە پێچەوانەوە، بەڵکو لەسەر ئەوە دەرکرام کە زیاد لە پێویست چالاک بووم و کۆنترۆڵ نەدەکرام. جاری یەکەم دەرکرام، دوای ئەوە لەبەر ئەوەی زۆر باش بووم، خۆیان ناردیانەوە بە دوامدا و پاشان بە یەکجاری دەرکرام.

بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە خۆم کارەکانم بکەم و سەربەخۆ بم. هەر بۆیە لە تەمەنی ٢١ساڵیدا بۆم دەرکەوت کە ژیانم ئاوا ناگوزەرێت و ناتوانم ئاوا سەرکەوتوو بم. چونکە بەرگەی ئەوەم نەدەگرت کە کەسێک لە سەروو خۆمەوە هەبێت و فەرمانم بەسەردا بکات.

ئەم خووە هەم لایەنی باشەی هەبوو، هەم خراپە. لایەنە باشەکە ئەوە بوو کە لەسەر پێی خۆم وەستام و مەجبووری کەس نەبووم و سەربەخۆ بووم، بەتایبەت سەربەخۆیی دارایی. لایەنە

خراپەکەشی ئەوە بوو کە لە ژیانی ڕۆژانەمدا توشی کێشەی زۆری دەکردم.

لەوانەیە بیستبێتت کاتێک دەوترێت: کێ پارەی پێ بێت ئەو یاساکان دادەنێت. ئێ منیش ویستم ببمە خاوەنی پارە و من یاساکان دانێم، نەک ببمە جێبەجێکاری یاساکان.

**ئەو شتە بێ مانایانەی دەیکەین.**

دوانیوەڕۆیەک ڕۆبێرت هاتەوە، لە بەردەم تەلەفیزیۆنەکەدا وەستابووم و بە هەموو هێزم هاوارم دەکرد: گەمژە مەبە! بە قسەی مەکە! چاووت بکەرەوە و تۆزێ گەورە بە وەک منداڵ ڕەفتار مەکە گێژە!

ڕۆبێرت پێکەنی و ووتی: ئەوە چیە بۆ وا ئەکەیت؟

ووتم: ڕێک مێشکم تێکدەچی کاتێک دەبینم خانمێک ئەم شتە بێ مانایانە دەکات. ئەوە سەیر دەکەم خانمێک هاتووە پرسیار لە کەسێکی نەدیو و نەناس دەکات کە بەحساب شارەزای بواری داراییە. خانمەکە پرسیاری لێ دەکات کە چی لەو پارانە بکات کە پاشەکەوتی کردووە. ئەویش بە دڵی خۆی قسەی بێ مانا دەکات و خانمەکەش دەڵێت: زۆر سوپاس بۆ ئەو ئامۆژگاریە بەنرخانەت. بێ گومان وا دەکەم و بەقسەت دەکەم.

ئێ باشە بۆ وا دەکەن؟ ئاخێر ناهەقی خەڵکی ناگرم کە دەڵێن خانمان هەموویان وەک یەکن لە بابەتی پارەدا. دووانی وەک ئەمەیە وای کردووە وامان پێ بڵێن.

ڕۆبێرت قاقای لیدەدا و وتی: بابەتێکی باشی بۆ ورووژاندی. لەوانەیە زۆربەی خانمان ئاگاداری ئەوە نەبن کە چی دەکەن و چی ناکەن بە پارەکانیان. بۆچی تۆ بۆیان باس ناکەیت و بە ئاگایان ناهێنیتەوە؟

**لیستی شته بێ ماناکان:**

ئەو خانمه بابەتێکی ورووژاندە ناو مێشکمەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمەی خانمان هەندێک شت دەکەین کە مایەی پێکەنینە. لەو بڕوایەدام کە ئیتر کاتی گۆڕینیان هاتووە و دەبێت لەمەولا زیرەکانەتر بڕیار بدەین. خوانەخواستە من نالێم کە ئێمەی خانمان بێ ئەقڵ و گەمژەین، نەخێر! تەنها کە بابەتەکە دێتە سەر پارە، کۆمەڵێک شت دەکەین کە بێ مانان و مایەی قبووڵکردن نییە.

بۆ نموونە لە خوارەوە لیستێکم درووست کردووە، ئەو شتە بێ مانایەنی تێدایە کە دەیکەین:

- هاوسەرگیری بۆ پارە دەکەین
- بەردەوامین لە ژیان لەگەڵ هاوسەرێکدا کە ژیانێکی زۆر خراپمان هەیە لەگەڵیدا، تەنها لەبەر ئەوەی پێمان وایە کە ناتوانین لە ڕووی داراییەوە پشت بە خۆمان ببەستین و دەمرین لە برسا
- ئێمە وا لە پیاوان دەکەین کە بڕیارە داراییەکان بە تەنها بدەن، چونکە پێمان وایە کە ئەوان لە ڕووی داراییەوە لە ئێمە باشترن.
- کاتێک پیاوان بڕیارێکی دارایی دەدەن، ئەگەر هەڵەش بێت قسەی تێدا ناکەین چونکە نامانەوێ دڵیان زویر بێت.
- ئامۆژگاری لەو بەناو شارەزایانە وەردەگرین، چونکە خۆمان زیرەک نین. بێدەنگی هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی ئارامی ماڵ نەشێوێت
- لە هاوسەرگیریەکدا دەمێنینەوە، ئەگەر زۆر خراپیش بێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە لە ڕووی داراییەوە کەسەکە باشە و پارەمان دەداتێ. خۆمان بە جیلی کۆن دەزانین، تەنها لەبەر ئەوەی کە تەمەنێکمان هەیە.بە هیوای ئەوەین کە پیاوەکە بگۆڕێت.

- بە "باش" ڕازیین، لە کاتێکدا شایەنی "نایاب"ین.
- پیاوەکە ئەگەر ناشارەزاش بێت لە بوارێکدا، ئێمە هەر کوێرانە شوێنی دەکەوین.
 خۆمان لەلا کەمە و بەهای خۆمان نازانین.
- سەرەڕای هەموو نا دادپەروەریەکانیش، هێشتا هەر بەردەوامین لە کارەکەمان تەنها لەبەر دوو دینار مووچە.
- هەرچەندە شایەنی ئەوەین کە پلەمان بەرز بکرێتەوە لە ئیشەکەماندا، بەڵام نایکەن و ئێمەش هەر بەردەوامین و چاوەڕوانی سۆز و بەزەیی خاوەن کارین.
- ڕازین بەوەی کە مووچەی کوڕە هاوپیشەکانمان زیاتر بێت، لە کاتێکدا ئیشەکانی ئەوانیش دەکەین.
- لەبەر ئیشەکانمان، ناتوانین ئامادەی ئاهەنگی منداڵەکانمان بین، کاتێک لە خوێندنگە ئاهەنگی مۆسیقایان هەیە، یان یارییان هەیە، یان هەر چالاکیەکی تر.
- هەر بیر لە داهاتوو دەکەینەوە و دەڵێین: ڕۆژێک دێت........

زۆربەمان یان دانەیەک یان زیاترمان کردووە لەوانەی سەرەوە. وامان لێهاتووە کە ڕۆحمان کردووەتە قوربانی پارە. تاوانی گەورەش لێرەدا ئەوەیە کە بڕوابەخۆبوونمان و بەهای بەرزی خۆمان دەکەینە قوربانی بۆ پارە.

بەڵێ، ڕاستە ئەم کتێبە تایبەتە بە وەبەرهێنان بۆ خانمان، بەڵام لەوە زیاتر فێری کۆنترۆڵکردنی ژیانمان دەکات. باس لە پاراستنی شکۆی خانمان دەکات و فێری خانمان دەکات کە چۆن ڕێز لە بەهای خۆیان بگرن و نرخی خۆیان بە کەم نەزانن.

**پیاو، خێزان، کۆمپانیا، حوکمەت:**

لەڕاستیدا ناونیشانە لاوەکیەکەی کتێبەکە سەرەتا ئەمە بوو. دەمویست بڵێم کە ئەو خانمانەی دەیانەوێت بگەن بە سەربەخۆیی دارایی، نابێت پشت ببەستن بە پیاو و خێزان و کۆمپانیا و حکومەت.

ئێمە بە درێژایی مێژوو وا فێرکراوین و چاوەڕوانی ئەوەمان لێ کراوە کە پشت ببەستین بە کەسێکی تر لە ڕووی داراییەوە. بەڵام ئەم پشت بەستنە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆ شتێکی ترسناکە. لەبەرئەوەی کە ڕۆژگار و زەمان گۆڕاوە. با یەک یەک بۆتان باس بکەم:

**پیاو:**

ئەگەر سەیرێکی مێژوو بکەین، دەبینین کە ناکرێت باسی پەیوەندی نێوان خانمان و پیاوان بکەین، بەڵام خۆمان لابدەین لە بابەتی سێکس. پیاو و سێکس و پارە و خانمان پەیوەندییەکی لێکنەپچڕاویان هەیە. جا زۆر جار ئەم پەیوەندیە نابینین، چونکە وا پەروەردە کراوین کە ئەمە یەکێکە لە ستاندەرەکانی کۆمەڵگا و سروشتی ژیان وایە.

کاتێک دەگەینە تەمەنی ١٦ ساڵان و هەندێک کەس پێش ئەو تەمەنەش، هەست بەوە دەکەین کە خانمان هێزێکی گەورەیان هەیە و ئەو هێزەش دەسەڵاتی سێکسییە. لەو تەمەنەوە تێدەگەین کە ڕەگەزی بەرامبەر بە شێوازێکی جیاواز لێمان دەڕوانن. هەندێک کات منداڵیشین، بەڵام دەبینین کە تەنانەت پیاوی گەورەش بەدەممانەوە پێدەکەنن و دەیانەوێت لێمان نزیک ببنەوە و بماندوێنن. وە هەندێک هێندە سەیرمان دەکەن خەریکە چاویان دێتە دەرەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی قوتابخانە، هەموومان کچێکمان بیرە کە زیاتر لە ئێمە چاوی لەسەر بووە لەلایەن کوڕەکانەوە. لە پۆلەکەی ئێمە ئەو کچە ناوی (مێلۆدی) بوو. مێلۆدی هەر زوو هەستی بە گەورەبوونی خۆی کردبوو و شانازیشی پێوە دەکرد. مێلۆدی کاتێک لە پۆلی ٨ بوو، پەیوەندی لەگەڵ کوڕانی دواناوەندی هەبوو و کاتێک چووە دواناوەندی، لەگەڵ کوڕەکانی زانکۆ پەیوەندی هەبوو. چونکە دەیزانی چۆن سەرنجی کوڕان ڕابکێشێت. هەرچەندە مێلۆدی نمونەیەکی قوتابخانەکەمان نەبوو و جیاواز بوو لە گشت قوتابییەکانی تر، بەڵام ئەگەر وورد بیربکەینەوە، دەبینین کە ئەو هێزە سێکسیەیە بوو کە وای لە کوڕان کردبوو هەمووشتێک بۆ میلۆدی بکەن. ئەوە پێویستی سێکسی پیاوانە کە وامان لێ دەکات لە تەمەنێکی منداڵیەوە هەست بەو چەکە گەورەی خۆمان بکەین و بەکاری بهێنین بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە دەمانەوێت. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە ئەو چەکە ماوەیەکی کەم کار دەکات. واتە هەتا گەنجین و سەرنجڕاکێشین ئەو چەکە کاری خۆی دەکات، دوای ئەوە وردە وردە بەپێی تێپەڕبوونی کات، ئەو چەکە بەهێزەمان بەدەستەوە نامێنێت.

## خاڵی وەرچەرخان (خاڵی گۆڕانکاری)

تەمەنم ١٤ ساڵان بوو، ڕۆژێک لە قوتابخانە گەڕامەوە بینیم دایکم بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی دەکات. هەر بە چاو پێی ووتم کە بڕۆمە ژوورەکەی تر، تا گوێم لە قسەکانیان نەبێت. منیش ڕۆیشتمە چێشتخانەکە و خۆم سەرقاڵ کردبوو بە خواردنەوەی بتڵێک شیرەوە. هەرچەندە نەمدەویست گوێ بگرم، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە دایکم دەیووت چی!

هاوڕێکەی دایکم کە ناوی (گلۆریا) بوو زۆر خەمبار و بێتاقەت بوو و دەیووت: هەرچەندە لەگەڵ هاوسەرەکەم کێشەمان زۆر بوو، بەڵام هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کە بگات بە ئاستێک، من و منداڵەکان بەجێ بهێڵێت.

دایکم ووتی: باشە پێش ئەوەی بڕوات چی پێ ووتی؟

گلۆریا ووتی: پیش ئەوەی بڕوا پێی وتم کە لە شارێکی تر کەسێکی تری ناسیوە کە زۆر گەنج و جوانە و وەک پاڵەوان سەیری ئەم دەکات، لە کاتێکدا گوایە من تەنها مایەی بێتاقەتی و نائومێدی ئەوم.

دایکم ووتی: باشە تۆ بەو پەیوەندیەت دەزانی؟

گلۆریا ووتی: لە ڕستیدا هەستم بە شتێک کردبوو، بەڵام دڵنیا نەبووم. وامدەزانی کە هەر کەمێک ئەمسەراوسەرە و دوای ماوەیەک بۆخۆی باش دەبێتەوە.

دایکم ویستی زیاتر لە بابەتەکە تێبگات و لێی دڵنیا کردەوە: واتە تۆ بە پەیوەندیەکەت دەزانی!

گلۆریا دانی پێدانا و ووتی: ئەتوانم بڵێم بەڵی دەمزانی، بەڵام نەمدەویست دان بەوەدا بنێم کە دەیزانم. خۆی لە خۆیدا ماوەی ٤ ساڵ بوو کە ژیانمان وێران بوو. شەو و ڕۆژ دەمەقاڵی و هات و

هاوار بوو و ڕۆژ بە ڕۆژ خاڵە هاوبەشەکانمان کەمی دەکرد. من بە هۆی منداڵەکانەوە لە ماڵەوە بووم و ئەویش بەهۆی ئیشەکەیەوە بەردەوام گەشتی دەکرد.
دایکم ووتی: باشە کە دەتزانی هاوسەرگیریەکەتان وا خراپ دەڕوات و دەتزانی کە پەیوەندی تری هەیە، بۆچی بەردەوامیت پێدا؟
ووتی: لەبەر منداڵەکانم!
دایکم ووتی: منداڵەکانت؟ کچێ ماشەڵڵا منداڵەکانت شکور گەورەن و وا کوڕە گەورەکەت کۆلێژی تەواو کردووە. منداڵی چی؟ هەر دەبێت هۆکارێکی تر هەبێت.
گلۆریا ووتی: ڕاستت دەوێت، بیرم لەوە دەکردەوە کە لانی کەم کەسێک هەیە لەڕووی داراییەوە ئاگای لێمە و پێویستم بە کەسی تر نییە. دەترسام لەوەی کە خۆم خۆم بژێینم چونکە ئەوە ٢٠ ساڵ دەبێت خۆم دینارێکم پەیدا نەکردووە. چی بێ لە تۆ نهێنی، ئەوە چەندین ساڵە ژیانم ئاوا دەگوزەرێ بەو ناخۆشیە، بەڵام تەنها لەبەر ئەوە مابوومەوە کە لانی کەم باری داراییم باشە. گلۆریا بەدەم گریانەوە ووتی: نازانم چی بکەم! ئاخێر من بەم تەمەنەوە چۆن دەتوانم تازە کار بکەم؟ ئەوە تەمەنم بووە بە ٤٥ ساڵ، تازە چۆن خۆم بژێنم؟ قەت بە خەیاڵمدا نەهاتووە ڕۆژێک لە ڕۆژان تووشی ئەم دۆخەی ئێستا ببم.

شیرەکەم خستەوە ناو بەفرگرەکەو ڕۆیشتمە ژوورەکەی خۆم لە قاتی سەرەوە. کە بە قادرمەکاندا دەرۆیشتم گوێم لێبوو دەیووت: نازانم! باشە چۆن تازە بتوانم پشت بە خۆم ببەستم؟ ئەو ڕستەیەی گلۆریا مێشکی جووڵاندم و هەر بیرم لێ دەکردەوە. لە مێشکی خۆمدا لێکم دەدایەوە: باشە ئەم خاتوونە تەنها لەبەر ئەوە

لەگەڵ ئەو مێردە خراپەی ماوەتەوە، چونکە مێردەکەی بەخێوی دەکات!

لەوەوە بۆم دەرکەوت کە ژیان وەک چیرۆک و فیلمەکان نییە کە دەیبینین. بیرمە لەو ڕۆژەوە بڕیارم دا کە لە ژیانمدا پشت بە هیچ کەسێک نەبەستم لە بابەتی پارە و داراییدا. وە ئەو بڕیارەش بوو بە ڕێگەڕۆشنکەرەوەی ژیانم.

**کاتی گۆڕینی هاوکێشەکەیە:**

**پیاوان:**

تکایە پێش هەمووشتێک لەوە تێبگەن کە من ڕقم لە پیاوان نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوەی من دەیڵێم لە قازانجی پیاوانە، چونکە نامەوێت خانمان پشتیان پێ ببەستن و ببنە بارگرانی بۆیان. چونکە ڕاستی کۆمەڵگەی ئەمڕۆ وایە کە زۆرینەی خانمان پشت بە پیاوان دەبەستن لە ڕووی داراییەوە.

زۆرینەی کات دەبینم کە خانمی وا هەیە تەمەنی سەرو ٤٠ یان ٥٠ساڵە و هەتا بڵێی بەڕێز و خان و مانە، بەڵام بێوەژنە و ئێستا مەجبوورە بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی دەرگا دەکوتێت و بەدەست نەبوونی سەرچاوەیەکی داهاتەوە دەناڵێنێت. بەداخەوە ئەمە چیرۆکی ژیانی زۆر کەسە. تا گەنج بوون دڵخۆش ژیاون، بەڵام ئێستا تەمەنی هەڵکشاوە و مێردەکەی بە هەر هۆکارێک بێت لە دەوریان نەماوە و ئێستا، بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، دەبێت بەرپرسیارێتی ماڵێک هەڵگرێت و ئیش بکات.

من خۆم بەختم هەبوو. دایک و باوکم دوو نموونەی جوانی هاوسەری بە وەفا و بەڕێز بوون بۆ یەکتر، زیاتر لە ٥٠ ساڵ پێکەوە بوون و هەمووکات وەک مامۆستایەک وابوون بۆ من، بۆ فێرکردنی ڕێز و خۆشەویستی و پێکەوە ژیان لە

هاوسەرگیریدا. بەڵام بەداخەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕێژەی جیابوونەوە بەردەوام لە زیادبووندایە. جا من بۆیە ئەم قسانە دەکەم، بۆ ئەوەیە تۆی خانم چاوکراوە بیت و هەر بار و دۆخێکی نەخوازراو ڕووی دا تۆ دەست لەکەس پان نەکەیتەوە. تۆ وەک گلۆریا مەبە. ئەو تەنها یەک پلانی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە لەگەڵ هاوسەرەکەی بمێنێتەوە و تا ماوە قبووڵی هەمووشتێک بکات.

ئەگەر وا دەزانی کە دەتوانیت تا ماوی بەو جوانیەت سەرنجڕاکێش بیت و ئامانجی خۆتی پێ بپێکیت، ئەوە بزانە کە تەنها تا سەر و ٣٥ ساڵی کاری خۆی دەکات. ئەی دوای ئەوە؟ دوای ٤٠ ساڵی چی دەکەیت؟ دامەنیشە و چاوەڕوانی ئەوە بە کە پیاوان بگۆڕێن و ئەوەی تۆ وا نەبێت. لەجیاتی ئەوەی چاوەڕوانی گۆڕانی پیاوان بیت، کاتی ئەوەیە کە خانمان بگۆڕێین و کار لەسەر خۆمان بکەین. ئەو هاوکێشەیەی لە گەنجی و جوانیدا کارت پێ کردووە تەواو بوو، تازە ناخوات. ئێستا دەبێت هاوکێشەکان بگۆڕین و پارەش ڕۆڵێکی زۆ گرنگی هەیە لە ئەم هاوکێشەیەدا. تا گەنجیت گەنجی و جوانی ڕۆڵی خۆی هەیە، بەڵام کە چوینە تەمەنەوە، پارە جیگەی ئەو گەنجی و جوانیەمان بۆ دەگرێتەوە.

ئێستا ژیان گۆڕاوە و ئێمەی خانمانیش دەبێت خۆمان بگونجێنین لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدا. ئەگەر تۆ کەسێکیت کە چاوەڕوانیت تا ماوی مێردەکەت بەخێوت بکات، هیوای بەختێکی باشت بۆ دەخوازم. بەڵام ئەگەر خانمێکیت کە پلانت وایە خۆت بگۆڕیت و قورساییەکت هەبێت لە هاوکێشەکەدا و کلیلی ژیانی خۆت لەدەست خۆتدا بێت، ئەوا لە خوێندنەوە بەردەوام بە و پێکەوە دوو قسە دەکەین.

خێزان:

بەڵی دەکرێت هەندێک کەس چانسی ئەوەیان بۆ ڕەخسابێت کە دایک و باوکیان بەدڵی ئەوانیان بۆ بکەن و داوای هەرچی بکەن لەبەر دەستیاندا بێت، بەڵام زۆرینەمان ئەو چانسەمان بۆ نەڕەخساوە و تەنانەت هەندێک لە هاوڕێکانم نەک چانسی ئەوەیان نییە، بەڵکو بەرپرسیارێتی بەخێوکردنی دایک و باوکیشیان لەسەرە. یەکێک لە هاوڕێکانم لە (هۆنۆلۆلۆ) دایکی بەخێو دەکات. جا ئێستا جگە لەوەی کە بەردەوام خەرجی بەخێوکردنی دایکی لەسەرە، سەرەڕای ئەوەش لە ئیشەکەی مووچەکەیان بۆ کەم کردووەتەوە، چونکە زوو زوو مۆڵەت وەردەگرێت و دەبێت ئاگای لە بەخێوکردنی دایکی بێت.

هاوڕێکەی ترم هەیە کە پارەیەکی زۆر دەدات بە هەقی بەخێوکردنی دایک و باوکی، لە کاتێکدا ڕۆژێک لە ڕۆژان بیری لەوە نەکردووەتەوە کە کاتێک دێتەپێش ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەوێتە سەرشان.

هاوڕێیەکی ترم کاتێک دایکی کۆچی دوایی کرد، بڕیاری دا کە چیتر لە خانووی کرێدا نەبێت و دڵی خۆش بوو کە لە کرێچێتی ڕزگاری بووە. نیازی ئەوەی هەبوو کە بڕواتە خانووەکەی دایکیەوە. کاتێک ڕۆیشت، بۆی دەرکەوت دایکی ماوەی چەندین ساڵە کرێی ئاو و کارەبای هیچی نەیاوە. ئەوەندەی لەسەر کۆبووبووەوە کە مەجبوور بوو خانووەکە بفرۆشێت بۆ ئەوەی قەرزەکان بداتەوە و دووبارە کەوتەوە کرێچی.

هاوڕێیەکی ترم ناوی (سوزەن) بوو. سووزەن بۆی گێڕامەوە کە کاتی خۆی باوکی سەروەت و سامانێکی زەبەلاحی هەبووە. بەڵام دایکی کۆچی دوایی کردووە و باوکی ژنی هێناوەتەوە.

لەم دواییانەدا باوکیشی تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەن بووە ، پێش مردنی باوەژنەکەی دەستکاری وەسێتنامەکەی کردووە و سوزەن و براکانی لێ بێبەش کردووە و هیچ شتێکیان بەرنەکەوتووە.

مەبەستی من لە باس کردنی ئەم قسانە ئەوەیە کە پێتان بڵێم ناکرێت دڵ بە سەروەتی کەس خۆش بکەیت و زۆربەی کات شتەکان بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی ئێمەوە دەڕۆن. بۆیە دەبێت تۆ پلانێکت هەبێت کە هیچ کات گۆڕانکاری بار و دۆخ کاریگەری لەسەر دروست نەکات. وە ئەوەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەیبینین، زیاتر بۆمان شی دەکاتەوە کە پشت بەستن بە خێزان، هەڵبژاردەیەکی درووست نییە.

**حکومەت و کۆمپانیاکان:**

ساڵی ٢٠٠٥، لە یەکێک لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئەمریکا بە گەورەیی مانشێتێک نووسرابوو: "خانەنشینی، کۆچی دوایی کرد". مەبەستی ڕۆژنامەکە ئەوە بوو کە باسی لە یاسایەک کردبوو کە تیایدا هاتووە کۆمپانیاکان دەتوانن کەی ویستیان پەشیمان ببنەوە لەو بەڵێنەی داویانە بە فەرمانبەرەکانیان لەسەر دابینکردنی مووچەی خانەنشینی و بیمەی تەندرووستی. وە (کۆنگرێس)یش پاڵپشتیان بوو. ڕاپۆرتەکە باسی لەو کردبوو کە چۆن حکومەت و کۆمپانیاکان دەستیان تێکەڵ کردووە و دژی خەڵکی ڕەش و ڕووت وەستاوون و پارەکانیان بە ئاشکرا دەخۆن و حکومەتیش نقەی لێوە نایەت.

بەپێی ڕاپۆرتەکە، ئەم بڕیارە بەرژەوەندی ملیۆنان کەس دەکاتە ژێر مەترسییەوە کە زۆربەیان خانمانن. وە وایان لێ دەکات کە

خۆیان خانەنشین نەکەن، هەرچەندە ئەگەر لە ڕووی جەستەییەوە تەواو شەکەت بووبن. ڕاپۆرتەکە باسی چەند کەسێکی کردبوو کە بوونەتە قوربانی ئەو بڕیارە. ئەوەی جێگەی داخ بوو ئەوە بوو هەموویان لە خانمان بوون. یەکێک لەوانە خانمێکی ٦٩ ساڵان بوو کە مووچەی خانەنشینیەکی بڕابوو و ئێستا بەمەجبوور قوتوی ئەلەمنیۆمی کۆدەکاتەوە و دەیفرۆشێتەوە بۆ ئەوەی پاروویەک نان پەیدا بکات و لەبرسا نەمرێت کولەمەرگی پێی بژی.

چیرۆکی هەر یەک لەو خانمانە یەک لەیەک تراجیدی تر بوو. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە هیچ کات هیچ کام لەو خانمانە بیریان لەوە نەکردووەتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەژار بن و بکەونە دۆخێکی ئاواوە. وە من پێتان دەڵێم، هیچ گرەنتیەک نییە کە پلانی خانەنشینی لە داهاتوودا لەمە باشتر ببێت، دڵنیا بن ئەگەر خراپتر نەبێت، باشتر نابێت.

جا ئەم کێشەیە تەنها بۆ خانمان نییە، بەڵکو بۆ پیاوانیشە. یاسا یاسایە و بۆ هەردوو ڕەگەزە. کێشە گەورەکە ئەوەیە ئەگەر تۆ لەو کەسانەیت کە پشتت بە خێزان، یان خانەنشینی هاوسەرەکەت بەستووە، ئەوا دوو جار بیربکەرەوە.

**هەڵبژاردنەکە لەدەستی خۆتدایە**

خۆ لەوانەیە خێزان و هاوسەر و حکومەت و کۆمپانیاکان لە داهاتوودا یارمەتیدەر بن، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە ناکرێ بە هەڵبژاردەیەکی گونجاو دایانبنێیت. چونکە ناکرێت ژیانت لەسەر شتێک بنیاد بنێیت کە جێگەی متمانە نییە و تۆ کۆنترۆڵی لەسەدا سەدت نییە بەسەریدا.

جا ئێستا کاتی ئەوەیە بڕیارە گرنگەکە بدەیت، کار بۆ سەربەخۆیی دارایی خۆت دەکەیت؟ یان پشت بە یەکێک لەوانە

دەبەستیت کە باسمان کردووە. پرسیارەکە ڕوونە! ئەگەر تۆ بڕیار بدەیت پشت بە یەکێک لەوانە ببەستیت، کەواتە ئامادەیت یەکێکی تر بەرپرس بێت لە دۆخی دارایی تۆ و قبوولی هەموو شتە خراپەکانیش بکەیت.

بەڵام ئەگەر سەربەخۆیی دارایی هەڵبژێریت، ڕاستە واز لە خۆشیەکی کاتی دەهێنیت و ماندوو دەبیت، بەڵام دەگەیت بە خۆشیەکی تا هەتایی. تۆ، ئێستا ڕێگەیەک هەڵدەبژێریت کە هیلاکی و بەرز و نزمی زۆری تێدایە، زۆرلە خانمان ناوێرن خۆیانی لێ بدەن. بەڵام لە داهاتوودا پاداشتەکەی وەردەگرنەوە. وە من دڵنیام ئەو خانمانەی کە بە تەواوەتی خۆیان ساغ کردووەتەوە لەوەی کە سەربەخۆیی دارایی هەڵبژێرن، سەرکەوتوو دەبن لە کۆتاییدا.

"ئەم پەرتووکە تایبەتە بە سەربەخۆیی دارایی، چونکە پێم وایە سەرەتاییترین هەنگاوی سەربەخۆیی خانمان، سەربەخۆیی داراییە"

# بەشی یەکەم
# نیوەڕۆخوانێک لەگەڵ خانمان

**"من، پێش ئەوەی هەرشتێک بم، خانمێکم"**

من هەر خۆم هیوایەتم شاری نیویۆرکە. شارێکی تا بڵێی خۆش و دڵڕفێنە و بەردەوام جووڵەو ووزەی تێدایە و هەرگیز بە بێدەنگی نایبینیت. دەستم لە تەکسیەک ڕاگرت و لە (تایم سکوێر)ەوە بەرەو سەرەوە ڕۆیشتین. جادە و شەقامەکان وەک هەمیشە قەرەباڵغ بوون و هەرکەسەو سەرقاڵی بەشێکی ژیانی خۆی بوو. شۆفێرەکە پرسی: بۆ کوێ دەچن؟

ووتم: بۆ هۆتێل پلازا

ڕۆژێکی تا بڵێی خۆش بوو، ئاسمانێکی شین و سامالّی هەبوو و نەسیمێکی فێنک و خۆش دەهات بەلاتا.

لە تەکسیەکە دابەزیم و کرێی کابرام دا. کە دابەزیم هەم دڵم خۆش بوو و هەم هەستیشم بە دڵەڕاوکێ دەکرد. نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەم کە لە ئەریزۆناوە هاتووم بۆ نیویۆرک تەنها بۆ نان خواردنێک. نەمدەزانی لەگەڵ کێ نان دەخۆم و کێ دێت و کێ نایەت. دڵنیا بووم لەوەی کە یان نیوەڕۆخوانێکی زۆر خۆش دەبێت، یان دەبێتە هەڵەیەکی گەورەی ژیانم. ئەو ئیمەیڵەی دوو مانگ لەمەوپێش بۆم هاتبوو، بەم شێوەیە بوو:

" لە کۆتاییدا کۆبوونەوەیەکمان ڕێکخست و ڕێککەوتین لەسەر کات و شوێنەکەی. هەمووتان لە ٢٢ ی مارت، لە هۆتێل پلازا ئامادە بن کاتژمێر ١٢ بۆ نانی نیوەڕۆ. لە هاوڕێیەتی (هۆنۆلۆلۆ)ەوە بۆ (نیویۆرک). وابزانم هەمووشتێک ئێستا گۆڕاوە، بەڵام زۆر بە پەرۆشم بۆ ئەوەی جارێکی تر یەک ببینینەوە و بزانم لەم ماوە دوورودرێژەدا چی گۆڕاوە"

خۆشمدەوێن، پات.

مـن و پـات لە زانکـۆ پـێکەوە بـووین لا هەوایـی. لە وانەی فەلسـەفەدا یەکترمـان ناسـی و سـوتفە لە هەمـان ژووری داخلـی ئەماینەوە. بەڵام ئەوە کەی بوو؟ وا بووە بە ٢٠ ساڵ کە یەکترمان نەبینەوە. لەبەر ئەوە پات داوای لێکردین کە جارێکی تر هەموومان کۆببینەوە وەک گرووپەکەی هەوایی ٢٠ ساڵ لەمەوپێش. گرووپی هەوایی پێکهاتبووین لە ٦ کچ و هەر شەشمان لە زانکۆ یەکترمان ناسی. ئەو کاتەی کە پێکەوە لە دورگەی هانەلۆلۆ بووین و ڕۆژە خۆشـەکانی ژیانمان بەڕێ دەکرد. هەمووماـن خوێندکار بـووین و سەڵت بوین و ژیانی گەنجێتی دەژیاین.

نـازانم پـات چۆن تـوانی ئەو کۆبوونەوەیە ڕێک بخـات، چـونکە کاتی هەریەکەمان جیاواز بوو و هەریەکەمان لە شارێک دەژیاین. هەرچەنـدە ئێسـتا پەیوەنـدیمان نەمـاوە و نـازانین و بێ ئاگـاین لە ژیـانی یەکتـر، بەڵام ئەم کۆبـوونەوەیە وەک بـووژێنەرەوەیەکی پەیوەنـدیەکانمان دەبێت. هەنـدێکمان هاوسـەرگیریمان کـردووە و هیچمـان لە هـانۆلۆلۆ نـاژین ئێسـتا. مـن لەو کـاتەوە چەنـدین جـار شوێنی نیشتەجێبوونم گۆڕیوە و دڵنیام ئەوانیش هەمان شت. بەڵام با ئەم باسە وازلێبهێنین بۆ خاتوونی ڕیکخەر، پات، کە چۆن توانی هەموومان کۆبکاتەوە لە یەک جێگە. نایشارمەوە کە تامەزرۆ بووم بۆ ئەوەی بزانم هەریەکەیان سەرقاڵی چین و ژیانیان گەیشتووە بە کوێ.

کاتێـک چـوومە نـاو هـۆتێلەکە و لەسـەر فەرشـە سـوورەکە ڕۆیشتم، وامدەزانی کات وەستاوە! سـەرم هەڵبڕی پات و لیسلی لەبەردەممـد وەسـتاون. واو! پـات هەر وەک جـاران شـیکپۆش و ڕێکخـراو و کەشـخە بـوو. جلەکـانی هەمـووی لەگەڵ یەکتـر

گونجاندبوو و پووت و دەستکێشی لەدەست کردبوو. پات هەمیشە جددی و لە مەوعیددا بوو. هەمیشە پات ئەم کۆبوونەوانە ڕێکدەخات. زۆر جددیە و کاتژمێرێک پێش کاتی خۆی لەوێ ئامادەیە. بەڵام شێتت دەکات بە پرسیار و لێکۆڵینەوە ئەگەر خولەکێک دوابکەویت.

لێسلی، لەپاڵ پات وەستابوو. ڕێک پێچەوانەی پات جلەکانی شێواو و دووربوون لە یەکترەوە. کە سەیرت دەکرد یەکسەر دەتزای هونەرمەندە. تەنوورەیەکی فشی درێژ و کراسێکی زەق و ڕەفتەیەک و چاکەتێکی گەورەی لەبەردا بوو، ئەتووت ڕەشەبا هێناویتی. جانتایەکی گەورەی لەشاندا بوو، هەرکەس سەیری لێسلی بکردایە دەیوت ئەم کچە حولحولیە گێژە چییە؟ بەڵام لە ناخەوە تا سەرئێسقان کچێکی پاک و بێ گەرد بوو. پیشەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست و بە دڵ و بە گیان دەیکرد. بۆ نموونە ئەگەر ئیشی لەسەر ڕەنگکردنی بینایەکی سەدەی ١٨ بکردایە، دەچوو زانیاری لەسەر مێژووی بیناکە و هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمە کۆدەکردەوە تا بزانێت چییان کردووە. شەیدای ئیشەکەی بوو.

باوەشمان کرد بە یەکدا و خێرا سەری قسەمان دامەزراند. تا لامان کردەوە، جانیس لە دەرگاکەوە دەرکەوت. کاتێک سەیر دەکەین ٢٠ خولەکە خەریکی چەنەبازی کردنین.

جانیس لە (وێست کەوست)ەوە هاتبوو و ڕاستەوخۆ خۆی کردبوو بە هۆتێلەکەدا. داماوە هەناسەی لەبەر بڕابوو و شپرزە بووبوو. لەپڕ کە ئێمەی بینی هاواری کرد: خۆشحاڵم کە ئەمڕۆ دەتانبینم!

گونجاندبوو و پووت و دەستکێشی لەدەست کردبوو. پات هەمیشە جددی و لە مەوعیددا بوو. هەمیشە پات ئەم کۆبوونەوانە ڕێکدەخات. زۆر جددیە و کاتژمێرێک پێش کاتی خۆی لەوێ ئامادەیە. بەڵام شێتت دەکات بە پرسیار و لێکۆڵینەوە ئەگەر خولەکێک دوابکەویت.

لیسلی، لەپاڵ پات وەستابوو. ڕێک پێچەوانەی پات جلەکانی شێواو و دووربوون لە یەکترەوە. کە سەیرت دەکرد یەکسەر دەتزای هونەرمەندە. تەنوورەیەکی فشی درێژ و کراسێکی زەق و ڕەفتەیەک و چاکەتێکی گەورەی لەبەردا بوو، ئەتووت ڕەشەبا هێناویتی. جانتایەکی گەورەی لەشاندا بوو، هەرکەس سەیری لیسلی بکردایە دەیوت ئەم کچە حولحولیە گێژە چییە؟ بەڵام لە ناخەوە تا سەرئێسقان کچێکی پاک و بێ گەرد بوو. پیشەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست و بە دڵ و بە گیان دەیکرد. بۆ نموونە ئەگەر ئیشی لەسەر ڕەنگکردنی بینایەکی سەدەی ١٨ بکردایە، دەچوو زانیاری لەسەر مێژووی بیناکە و هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمە کۆدەکردەوە تا بزانێت چییان کردووە. شەیدای ئیشەکەی بوو.

باوەشمان کرد بە یەکدا و خێرا سەری قسەمان دامەزراند. تا لامان کردەوە، جانیس لە دەرگاکەوە دەرکەوت. کاتێک سەیر دەکەین ٢٠ خولەکە خەریکی چەنەبازی کردنین.

جانیس لە (وێست کەوست)ەوە هاتبوو و ڕاستەوخۆ خۆی کردبوو بە هۆتێلەکەدا. داماوە هەناسەی لەبەر بڕابوو و شپرزە بووبوو. لەپڕ کە ئێمەی بینی هاواری کرد: خۆشحاڵم کە ئەمڕۆ دەتانبینم!

جانیس هەر بەردەوام بوو لە بۆڵەبۆڵ کردن و دەیووت ئاهـ خۆ ڕێگە هەر نەدەبڕایەوە! بەخوا چی بکەم تۆزێکیش دواکەوتم، توخوا ڕۆژێکی خۆش نییە؟ جا ڕێگەی نەدەدا وەڵام بدەینەوە خێرا قسەیەکی تری دەکرد.

بە بێ دەنگی سەیرێکی یەکترمان کرد و وەک ئەوەی بڵێین هەندێک کەس هەیە هەرگیز ناگۆڕێن و هەر وەک خۆیانن. ئەی جانیس لەوەتەی هەیە هەر وا بوو. خوا نەکات دوو دەقە دەمی بووەستێت، دایمەی خوا ئەم کچە قسە دەکات و ووزەیەکی لە ڕادەبەدەری هەیە. قسەت بۆ دەکات هەزار بابەت تێکەڵ دەکات بەسەر یەکدا. بە خێرایی قسەت بۆ دەکات بە خێرایی دەڕوات و مەوزووع دەگۆڕێت. هەرگیز نابینی بە بێدەنگی خۆی بکات بە ژووردا، هەمیشە بڕواتە هەر شوێنێک قەرەباڵغی درووست دەکات.

چەند خولەکێکی تر تێپەڕی و مۆبایلەکەی پات زەنگی لێدا. هەموومان سەیری (پات)مان دەکرد و وەڵامی دایەوە: زۆر عەیبە بۆ تۆ! وا دیارە تۆ بە شەویش کار دەکەیت! زۆر سوپاس، ئەرکت کێشا، خوات لەگەڵ!

تەلەفۆنەکەی داخستەوە و ووتی: ترەیسی بوو. جەنابی ناتوانێ بێت. ئیش لەسەر پڕۆژەیەک دەکات. خۆ پڕۆژەکەی تەواو کردووە، بەڵام ئەم بەیانیە بەڕێوبەرەکەی تەلەفۆنی بۆ کردووە و چەند بەشێکی گۆڕیوە لە پڕۆژەکە. ترەیسی هەموو توانای خۆی لە ئیشەکەیدا سەرف کردووە و ئەوەتا ئەمڕۆ ئیشەکەی ناهێڵێت لێرە بێت. بەداخەوەم بۆی. خۆزگە بهاتایە.

لیسلی ووتی: لە کوێ دەژی؟

پات ووتی: لە شیکاگۆ. لە کۆمپانیایەکی گەورەی مۆبایل کار دەکات.

بە هەرحاڵ. پات پێش ئەوەی بڕۆین جێگەی بۆ هەموومان گرتبوو. تەنانەت لەسەر هەر مێزێک قوتویەک شوکولاتەی دانابوو وەک سەردەمی هەوایی. هەروەها لەبەردەم هەریەکەماندا وێنەیەکی کۆتا کۆبوونەوەمانی دانابوو پێش ٢٠ ساڵ. کە مێزەکەمان بینی، زانیمان کۆبوونەوەیەکی لەبیرنەکراو دەبێت. کاتێک لە وێنەکان وورد بووینەوە، هەموومان هاوڕا بووین لەسەر ئەوەی کە ڕوخسارمان هیچی وا نەگۆڕاوە. جانیس ئاخێکی هەڵکێشا و بە تەعلیقەوە ووتی: تەنانەت ئێستاش جلی ئەو کاتەمان بۆ دەبێت.

پرسیارم کرد: مارسا لە کوێیە؟ نایەت؟

پات ووتی: زۆر حەزی دەکرد ئامادە بێت، بەڵام داماوە دایکی نەخۆشە و بۆی نەدەکرا ٣ ڕۆژ بەجێی بهێڵێت. ئەوەندەی من بزانم باوکی چەند ساڵێک دەبێت کۆچی دوایی کردووە و ئێستا مارسا و دایکی پێکەوە دەژیین چونکە خوشک و برای تری نییە. زۆر ڕێزی هەبوو بۆتان.

پاشان داوای خواردنمان کرد و بەدەم نان خواردنەوە کەوتینە قسەی پڕ چێژ و گفت و گۆ

# بەشی دووەم
# خانمان

گفت و گۆکەمان بەردەوام بوو و دوودوو سەرمان نابوو بەسەری یەکەوە و قسەمان دەکرد. پاشان گفت و گۆکەمان کرد بە گرووپ و گوێمان بۆ ژیانی یەکتر شل کرد کە لەم ساڵانەی ڕابردوودا چی گۆڕاوە و چی بووە.

جانیس هاواری کرد بەسەر لێسلی دا و ووتی: دەی کچێ پێم بڵێ ئەم چەند ساڵە چی تازە ڕووی داوە و سەرقاڵی چی بوویت؟ دەنگە بەرزەکەی جانیس هەموومانی لە قسەکردن وەستاند و خەیاڵی هەموومان ڕۆیشت بەلای وەڵامەکەی لێسلی دا.

**چیرۆکی لێسلی**

لێسلی دەستی کرد بە باسکردنی چیرۆکی ژیانی خۆیی و ووتی: کچینە، بیرتانە کە کۆتاجار نانمان پێکەوە خوارد، بیرۆکەی بەجێهێشتنی هانەلولو هاتبووە مێشکمەوە و دەمویست لە دەرەوەی ئەوێ ژیانێک بۆخۆم درووست بکەم؟
هەموومان سەرمان بۆ لەقاند و ووتمان بەڵێ
ووتی: هەر شەش مانگ دوای ئەوە هاتم بۆ نیویۆرک و بە فرسەتم زانی لەم شارەدا دەست بکەم بە بازرگانی. شانسم هەبوو، هەر کە گەیشتمە ئێرە ئیشێکم دەستکەوت لە دەزگایەکی تایبەت بە دیزاین. کارکردن لەو دەزگایە زۆر یارمەتی دام کە زیاتر شارەزای شارەکە بم و زووتر ڕابێم لەگەڵ نیویۆرک و خەڵکەکەیدا. لە سەرەتاوە زۆر قەلەق و بێزار بووم. چونکە ئاسان نەبوو لە هەواییەوە بێیت بۆ نیویۆرک. منێک بە ژیانم هێڵی شەمەندەفەری ژێرزەویم بەکارنەهێنابوو. ژیان لەم شارە زوو فێری کردم کە

چیتر ناتوانم بەو پێڵاوە بن بەرزانەوە کار بکەم. ئەودەم، کاتی شیکپۆشی نەبوو، بەڵکو کاتی کار کردن بوو. وە بە بۆنەی ئەو ئیشەوە چەندین کەس و ئیشی نوێم ناسی.

لە کاتە بەتاڵەکانمدا سەرقاڵی وێنەکێشان بووم. لە شوقەکەمدا شوێنێکم جیاکردبوویەوە بۆ وێنەکێشان. خۆشترین شت لەلام ئەوە بوو کە کەل و پەلەکانم بپێچمەوە و بڕۆمە دەرەوە سەرقاڵی وێنەکێشان بم. زۆر جار دەڕۆیشتم بۆ پارکی ناوەندی نیویۆرک و لەوێ چەندین کاتژمێر سەرقاڵی وێنە کێشان بووم. چەند ساڵێک لەمەوپێش پێشانگایەکی تایبەت بە خۆمم کردەوە. ڕاستە داهاتەکەی وا نەبوو و چەند تابلۆیەکی کەمم فرۆشت، بەلام گرنگترین شت بۆ من ئەوە بوو کە ڕۆژێکی خۆشم بەسەر برد، پارە گرنگ نەبوو بۆم.

ماوەیەک پێش ئێستا (پیتەر)م ناسی. ئەو کوڕە بوو بە شازادەی خەونەکانم. لەگەڵ پیتەر زۆر یەکترمان خۆش دەویست. ئەویش وەک خۆم هونەرمەند بوو هاوسەرگیریمان کرد و دوو منداڵمان هەیە، کوڕێک و کچێک. بەلام لەڕاستیدا ژیانی هاوسەرگیری دوو هونەرمەند هەر وا ئاسان نییە و ئەوە نییە کە خەونم پێوە دەبینی. پیتەر ستۆدیۆیەکی وێنەکێشانی هەبوو و لەوێ کارەکانی خۆی دەکرد و وانەی هونەری تیا دەوتەوە و هەر لەوێش تابلۆکانی دەفرۆشت. ئەوە کێشە نەبوو کە ئەو خەریکی کارکردن بوو، بەڵکو ئەوە کێشە بوو کە ئێمە، دوو هونەرمەند، ژیانمان خۆڕسکانە هەڵکەوتبوو و هیچ ڕێکخراو نەبووین. ژیانمان تەواو هاوسەنگی لەدەست دابوو. تەنها لە یەک شتدا هاوبەش بووین، ئەویش خەرجکردنی پارە بوو. هەر لەبەر ئەمەبوو هاوسەرگیریەکەمان تەنها شەش ساڵی خایاند. ئێستا تەنها دوو هاوڕێین.

دوای ئەوە، خۆم بە تەنها ئەرکی گەورەکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانم گرتە ئەستۆ. ڕاستە پیتەر جارجارە یارمەتیمان دەدات، بەڵام بەخوا هیچی وا نییە، چونکە ئیشەکەی ئەویش داهاتێکی وای نییە. کچەکەم ١٤ ساڵە و کوڕەکەم١٢ ساڵ. ئێستا وەک پێشتر کاتم نییە بۆ وێنە کێشان. ئێستا لە یەکێک لە گەلەریە هونەریەکان کار دەکەم، هەرچەندە کارێکی قورسە بە تەنها مەسرەفی دوو منداڵت لەسەر شان بێت، چونکە خەرجیان زۆر زۆرە.

سەرەتا لە (مانهاتن) بووین. بەڵام دواتر گواستمانەوە بۆ (نیوجێرسی) بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتر بژین و منداڵەکان بخەمە قوتابخانایەکی ڕێک و پێک. بە گشتی هەر خەریکی ڕاکەڕاکمە بەدوای ژیاندا. قەت ئەو ژیانە ناژیم کە لە بیستەکانی تەمەنمدا خەونم پێوە دەبینی.

جانیس خۆی پێ نەگیرا و ووتی: وەی دایە! قەت نایەتە بەرچاوم دوو منداڵ بەخێو بکەم! من خۆمم زۆر جوان پێ بەخێو دەکرێت، ئینجا نۆرەی دوو منداڵە. ئاخێر لەبەر ئەوەیە من هاوسەرگیری ناکەم. هەرچەندە ژیان لە (لۆس ئەنجلس) ئاسانترە وەک لە (نیویۆرک). وەڵا بژی لیسلی، هەی ئافەرم!

پات تەماشی (جانیس)ی کرد و ووتی: ئەی جانیس ژیان لە لۆس ئەنجلس چۆنە؟ قەت بۆم ڕێک نەکەوتووە لەوێ بژیم.

**چیرۆکی جانیس**

جانیس: ژیان لەوێ زۆر خۆشە و زۆر دڵم بە شارەکە و ئیشەکەم خۆشە. هەروەک پێشتر ووتم، هێشتا هاوسەرگیریم نەکردووە. خەریک بوو هەشت ساڵ پێش ئێستا خۆم تووش بکەم، بەڵام باش بوو زوو خۆی کەشف کرد و ووتی کە ئامادە نییە بۆ

هاوسەرگیری. ووتی کە دەیەوێت باشتر خۆی بناسێت و پاشان سەفەری کرد بۆ ئەوروپا. ئەوەندەی من ئاگام لێی بێت ئێستا لەگەڵ کچێکی ٢٠ ساڵان دەژی. وابزانم خۆی دۆزییەوە! بەڵام کەی؟ لەدوای ئەوەی کە من هیچ پەرۆشیەکم نەما بۆ پرۆسەکە. باوەڕکەن کچینە ڕۆژ بە ڕۆژ شتەکە قورستر دەبێت لەلام. ئێستا وەک جاران تاقەتی کوڕ و شتم نەماوە، هەرچەندە چەندین کەس هەیە کە حەزدەکەن لێم نزیک ببنەوە، بەڵام بەخوا من تاقەتم نەماوە.

هەر لەبەر ئەوەیە کە هەموو سەرنجم لەسەر کارەکەمە. هەر بەو ئیشەوە خەریکم کە لە هەوایی دەستم پێ کرد. سەرەتا لەگەڵ دوو کەس دەستم پێ کرد و دووکانێکمان هەبوو، پاشان کارەکە گەورە بوو و بوو بە سێ دووکان. نزیکەی ٥ ساڵ بەردەوام بووم لەگەڵیاندا و پارەیەکی باشم دەستکەوت. پاشان ووتم کە دەمەوێت جیا ببمەوە و چاونەترس بم و دەست بکەم بە ئیشی سەربەخۆی خۆم. ووتم کە من ئێستا لە کاری فرۆشتن باش شارەزام و دەتوانم لەسەر پێی خۆم بووەستم.

دوایی تێگەیشتم چەند هەڵەم! بیرۆکە زەخمەکەم ئەوە بوو کە دووکانێکی خواردن دابنێم کە هەمووی خواردنی چاک و گران بێت. لە هانۆلولو تەنها یەک دانە هەبوو و ئەویش حسابی خۆی نەدەزانی.

هاتم چی پارەم هەبوو هەموویم کردە ئەو ئیشەوە و هەندێکیشم قەرز کرد. شوێنێکی باشم لەسەر جادەیەکی قەرەباڵغ بەکرێ گرت و کەل و پەلم تیا دانا و دەرگام واڵا بوو بەرەو ڕووی کڕیارەکان. بەڵام ئەوەی تووشی شۆکی کردم ئەوە بوو بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ، تەنانەت یەک کڕیاریش سەری نەکرد بە دووکانەکەمدا. بیرم

کردەوە کە من چاوەڕێم کڕیار جمەی بێت لەناو دووکانەکەدا، کەچی هیچ شتێکم نەکردووە کە وا لە خەڵک بکەم بزانێت کە من ئەم دووکانەم کردووەتەوە. لەوەوە جیاوازی ئەوەم بۆ دەرکەوت کە جیاوزی هەیە لە نێوان کاڵای ئاسایی و خواردندا. خواردن ئەگەر لە کاتی خۆیدا نەفرۆشرێت دەبێت فڕێ بدرێت. لە لایەکی ترەوە ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کردبووەوە ئەوە بوو کە ئەگەر لە کاتی خۆیدا کرێ نەدەم، سزام دەدەن.

زۆر جار ویستم وازبهێنم، بەڵام دواجار ڕووم کردە دەرگای بەڕێوبەرەکەم. سەرەتا تێر پێم پێکەنی و پاشان ووتی: بەخێربێیت بۆ ناو دنیای بازرگانی و کار. ئینجا ئێستا پێم بڵێ چی ڕوویداوە. دواتر کە بۆم باسکرد،ماڵی ئاوا بێت زۆر هاوکاری کردم. بە هاوکاری ئەو توانیم ئیشەکەم هەڵسێنمەوە و جارێکی تر گیانێک بێتەوە بە بەریدا.

دوای ئەوە دەستم کرد بە ڕیکلام کردن و وورد ەووردە بازاڕم ڕووی لە باشی کرد. دواتر لقێکی ترم کردەوە و ئەویش سەرەتا هەمان دەردی دووکانی یەکەمی هەبوو، بەڵام زۆری نەبرد کە ئەویش کەوتە سەر پێی خۆیی و لە هەردووکیانەوە داهاتێکی باشم بۆ دەهات.

دوای ئەوە بیرۆکەیەکی ترم بۆ هات، ئەویش دانانی ساڵۆنێک بوو کە کەل و پەلی ڕازاندنەوەی خانمانی تێدا بێت. جۆرەها کەل وپەلمان هەبوو و تەنانەت کارمەندمان هەبوو کە دەچووە ماڵان بۆ ڕازاندنەوە. دواتر بیرم لەوە کردەوە کە هەوایی بەجێ بهێڵم و بەرەو لۆس ئەنجلس بڕۆم. وامدەزانی هەروا ئاسانە.

جانیس ئاهێکی هەڵکێشا و وەستا: خەریک بوو هەرچی هەمە و نیمە لە لۆس ئەنجلس تیابچێ. ئاخر بازرگانی کردن لەوێ زۆر

جیـاوازتر بـوو لە هەوایـی. داخوازیەکـان، کڕیارەکـان، یاسـاکان، هەمـوو پرۆسـەکە جیـاوازە. وەک ئەوە وابـوو کە لە سـەرەتای ساڵانەوە دەست پێ بکەیتەوە. بەڵام ئەزموونێکی باشم کۆ کردەوە لەوێ.

جا سـەرتان نەیەشێنم، ئێستا سێ کۆگام هەیە و دانەیەکیش لە سـانتیاگۆ. سـەرەتا تەنهـا تـایبەت بـوو بە خانمـان، بەڵام ئێسـتا پیـاوانیش سـەردانم دەکەن. ئێسـتا زیـاتر چـاوم لەسـەر ئەوەیە کە لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە کار بکەم، چونکە سـەردەمەکە گۆڕاوە و وا دەخوازێ.

کـارێکی ئاسـان نییە، قـاچێکم لە لـۆس ئەنجلسـە و قـاچێکم لە سانتیاگۆ. ١٢ کارمەندم هەیە و دەبێت ئاگام لێیان بێت و بەردەوام کەل و پەل بهێنم. دەبێـت سـەردانی هەمـوو پێشـانگاکان بـکەم و کـارەکەم بەرەوپـێش ببەم. ڕاسـتە قـازانجی بـاش دەکەم، بەڵام هەرچی پەیدا دەکەم لە ئیشـەکەدا خەرجی دەکەمەوە. ئاواتەخوازم بگەم بە کاتێک کە پاڵ بدەمەوە و پارەکانم ئیشم بۆ بکەن. بەڵام ئەوەش کاتیکی زۆری دەوێت و هەروا ئاسان نییە.

پاشـان ووتی: چاک بردتـانمەوە بۆ ٢٠ سـاڵ پێش ئێسـتا. ڕۆژە خۆشـەکانی هەواییتـان بیرهێنـامەوە. ئەودەم، هـیچ بەرپرسـیارێتیەکمان لەسـەر شـان نەبـوو. ئـای کـات چەنـدە خێـرا دەڕوات. وا ئەزانم دوێنێیە. خۆزگەم بەو کاتە!

هەموومـان گەڕاینەوە بۆ ئەو کـاتەی کە یەکترمـان تیا ناسـی و ئەو هەموو گەڕان و پیاسە و ئاهەنگ و قسەی خۆش و بازاڕکردن و خواردنە میللیەکان و ئەو هەموو کەسانەی ناسیومانن. بەڕاستی تامەزرۆی ئەو ڕۆژە خۆشانە بووم.

لێسلی پرسی: پات، بیرمە لە سەرەتاوە کارت بۆ ڕۆژنامەیەک دەکرد و زۆر دڵت خۆش بوو. ئێستاش هەر لەوێ کار دەکەیت؟

## چیرۆکی پات:

پات کەسێک بوو زۆر حەزی بە نووسین بوو. خۆی ڕاگەیاندنی تەواو کردبوو و هەر لە منداڵیەوە درکی بە حەزەکەی خۆی کردبوو. پات دەیویست وەک ڕۆژنامەنووسێک بە هەموو دنیادا بگەڕێت و لەسەر ڕووداوەکان زانیاری کۆ بکاتەوە و پاشان لەسەریان بنووسێت. دوای ئەوەی لە زانکۆ دەرچوو، ڕاستەوخۆ سی ڤی پێشکەش بە دوو ڕۆژنامە کرد کە لە پرفرۆشترینەکانی هەوایی بوون. کاتێک پێم ووت چی دەکەیت ئەگەر وەرنەگیرێیت؟ ووتی من چوار ساڵە کار بۆ ئەوە دەکەم، ئەگەر وەرنەگیرێم چەندین هەوڵی تر دەدەمەوە و کۆڵ نادەم.

پات کەمێک گۆشەگیر و بێدەنگە. ئەبێ باسی ڕۆژنامەی بۆ بکەیت بۆ ئەوەی بیهێنیتە قسە. هەمیشە لەسەر مێز و کورسیەکە و نوقمی ڕۆژنامە و کتێب و گۆڤار بووە و بەدوای ڕستیەکاندا وێڵ بوو و چاوی دەگێڕا بۆ دوایین هەواڵەکان. لە پێنج ڕۆژنامە کاری دەکرد و کەناڵێکی تایبەت بە هەواڵی هەبوو و شەو و ڕۆژ کاری دەکرد. هەرکاتێک بتویستایە بزانیت هەواڵی تازە چی هەیە و چی نییە، یەکسەر برۆ لە پات بپرسە. باوەڕێکی زۆری بە خۆی هەبوو و هەموومان پێی سەرسام بووین. زۆر جددی بوو و دەیزانی چی دەکات و چی ناکات. بەڵام مەخابن! هەندێک جار ژیان دەست دەنێتە بینەقاقای خەونەکانت.

پات دەستی کرد بە قسەکردن و ووتی: زۆر بە باشی لە ڕۆژنامەکان کارم دەکرد. تا دەهات ئەرکی زیاترم پێ دەسپێررا و

منیش گورجوگۆڵتر دەمکرد. لە هەردوو ژیانی خۆم و ئیشـەکەمدا چووبوومە سەر سکە. دوای سێ ساڵ لە کارکردنم لە ڕۆژنامەکە، ئەم پیاوەم ناسـی کە ئێستا هاوسـەرمە و هەردووکمـان خاوەنی خەونی گەورە بووین.

دوای ئەوەی (گرانـت)ی هاوسـەرم ئیشـێکی بـۆ هـاتە پێش لە یەکێک لە بانکە بەناوبانگەکانی دالاس، دەبوو هەردووکمان هەوایی بەجێبهێڵین و بەڕێبکەوین بەرەو دالاس. سـەرەڕای ئەوەی دەمزانی کە زۆر بیری هەوایی دەکەم، بەڵام هەلی کارەکە زۆر گرنگ بوو بۆمـان و سـەرچاوەیەکی باشـی داهاتمـان بـوو. بـۆیە خۆمـان پێچـایەوە و بەرەو دالاس بەڕێکەوتـین. هـیچ لە خەیـاڵی ئەوەدا نەبـووم کە لە ڕۆژنامـایەکی دالاس کـار بکەم. بەڵام دواتـر ئەوەی چاوەڕوانی نەبووم ڕوویدا.

بۆم دەرکەوت دووگیانم! بە هیچ شێوەیەک پلانی دووگیان بوون لە مێشکمدا نەبوو. هەموومـان پێکەنینمـان دەهات. ئـاخر ناهەقمـان نەبوو، چونکە ئەوە تاکە شت بووە لە ژیانی (پات)دا کە بەبێ پلان ڕوو بدات. پات هەمووشتێکی بە پلان و ڕێکخراو بوو، مەعقوول نەبوو ئەوە بە بێ پلان ڕووبدات.

ئینجا وەرە بەو حاڵەوە کار بدۆزەرەوە. گاڵتەم لێ دەهات کەس ئـاوا کـارم بـداتێ! هەر واش دەرچـوو. کەس ئـاوا کـاری نەدامـێ. جارێک ئەو کەسـەی چـاوپێکەوتنی لەگەڵ کـردم پێـی وتـم: بـۆچی کاتمان بەفیڕۆ دەدەیت دادە گیان؟ بەنیازی چەنـد مانگ ڕاهێنانت پێ بکەین و پاشان دوای ٦،٧ مانگ بڵێیت دەڕۆم؟

ڕاستیش دەکەن! کێ خانمێکی دەوێت بە منداڵێکی ساواوە؟ لەبەر ئەوە چانسـی دۆزینـەوەی کـارم لەدەسـت دا. جـار جـار شـتم دەنووسی، بەڵام هۆکاری سـەرەکی مانەوەمان مووچەکەی گرانت

بوو. زۆر بێزار بووم لەو دۆخەی تێیدا بووم، زۆر بەرەو دواوەی بردم.

دواتر ووتمان باشە ئێمە وەک پلانمان وایە سێ منداڵمان ببێت، با پێکەوە ببن و گەورە ببن و پێکەوە بکەونە سەر پێی خۆیان و دواتر من دەگەڕێمەوە سەر کارەکەم. ئیتر سەرتان نەیەشێنم، ئەو چەند ساڵە کەمە بوو بە چەند ساڵێکی زۆر و منیش بووم بە ژنی ماڵەوە و ئێستا سێ منداڵی جوانم هەیە. جا لەو ماوەیەدا گرانت چەندین جار پلەی بەرز کرایەوە و مووچەکەی زۆر باش بوو. بۆیە هیچ کات بیرم لەوە نەکردەوە کە من کار بکەم، چونکە پێویستمان نەبوو. ئێستا دووان لە منداڵەکانم وا دەچنە زانکۆ. وابزانم ووردە ووردە کاتی ئەوەیە کە بگەڕێمەوە ناو کارەکەم. هەرچەندە ئێستا گۆڕانکاری زۆر ڕوویداوە لە شێواز و سرووشتی کارەکەم و منیش ئەو ووزە و گڕووتینەی جارانم نەماوە بۆ ئیش کردن.

مێزەکەمان، کە پێشتر گەرموگوڕی قسەی پێوە دیار بوو، ئێستا، دوای بیستینی قسەکانی پات، هەموومان بێدەنگ بووین. نەمانـدەزانی بڵێین چی. پات سەری هەڵبڕی و وەک ئەوەی مێشکمان بخوێنێتەوە ووتی: لە ژیاندا هەموومان چەند هەڵبژاردەیەکمان هەیە. منیش هەڵبژاردەکەی خۆمم هەڵبژارد. ڕاستە چەند شتێک هەبوون کە نەدەبوو ئاوا بڕوات، بەڵام لە کۆتاییدا من دایکایەتیم هەڵبژارد بەسەر کارەکەمدا و کارو پیشەکەم کردە قوربانی دایکایەتی و وە لێی پەشیمان نیم. بەمە کۆتایی بە قسەکانی هێنا.

لیسلی ووتی: کچینە با شتێک بخۆین، ئینجا دوای ئەوە گوێبیستی قسەکانی کیم دەبین.

# بەشی سێهەم
# چیرۆکی من

**"ئەگەر هەموو یاساکان جێبەجێ بکەین، هەندێک لە خۆشیەکانمان لەکیس دەچێت"**

کاسرین هێپبێرن

شاگردەکە هەر گوێی لە قسەکەی لیسلی بوو، یەکسەر خواردنی بۆ هێناین. دوای ئەوە لیسلی ووتی: ئادەی کیم، تۆ پێمان بڵێ چی ڕوویداوە لەم ٢٠ ساڵەی ڕابردوودا؟

ووتم: چیرۆکی ژیانی من چیرۆکێکی دووردرێژە. بیرمە کاتێک ١٣ ساڵان بووم، کتێبێکم دەخوێندەوە لەسەر ژیانی چوار خانم و چوار پیاو کە هەموو ئەوروپا گەڕابوون. کتێبەکە باسی ئەو سەرکەشیانەی دەکرد کە دێتە ڕێگەیان بە باش و خراپەوە. جا منێک کە لە نیوجێرسی لەدایک بووم، ئەو کتێبە پێی ووتم کە لە دەرەوەی نیویۆرک و نیوجێرسی دنیایەک و ژیانێکی تر هەیە. جا هەر لەبەر ئەو هۆکارەش بوو کە گواستمەوە و هاتم بۆ هەوایی.
پات ووتی: بیرمە وتت باوک و دایکم خەڵکی (ئۆریگن)ن.

ووتم: لە ١٤ ساڵیی لە نیوجێرسی ڕۆیشتین بەرەو ئۆریگن. یەکەم جارم بوو ببینم کە لەدەرەوەی نیوجێرسی ژیانی تر هەیە و خەڵکی تر هەیە. ئەو ئەزموونە وای لێ کردم کە حەز بە گەڕان بکەم و بمەوێت شوێنی تر تاقی بکەمەوە. هەر بۆیە کاتێک ڕۆیشتمە زانکۆ، دایبابم پێیان ووتم کە حەزدەکەیت بڕۆیت بۆ کوێ؟ منیش بێ دوودڵی ووتم: هەوایی. پێم وابوو کە ئەوە شوێنێکی گونجاوە بۆ گەڕان و فێربوون و ئەزموونی نوێ.

بەردەوام لێیان دەپرسیم کە چەندە لە پۆلدا دەمێنیتەوە و چەندە لە قەراغ دەریاکە بەسەر دەبەیت؟ چونکە دەیانزانی کە من خوێندکارێکی تەقلیدی نیم و تاقەتی خوێندنم نییە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ڕازی بوون بڕۆمە هەوایی، چونکە ووتیان زوو بێزار دەبێت و خەیاڵ دەداتە خوێندنەکەی.

پات ووتی: هەواییت بەجێ هێشت و پاشان گەڕایتەوە؟

ووتم: بەڵێ، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا ٥ زانکۆم گۆڕی. هەتا لە کۆتاییدا بڕوانامەی (مارکێتینگ)م بەدەست هێنا لە زانکۆی هەوایی.

ئێمە سێ خوشک و برا بووین. دایبابم هەموو شتێکیان کرد تا ئێمە زانکۆ تەواو بکەین. بۆیە کاتێک من بڕوانامەکەم وەرگرتەوە، کردمە زەرفێکەوە و ناردمەوە بۆ ئەوان. ووتم بەخوا ئێوە لە من زیاتر شایەنی ئەم بڕوانامەیەن.

پات ووتی: بیرمە جارێک هاتن بۆ هەوایی، زۆر ڕووخۆش و کراوە بوون.

ووتم: لە ڕستیدا من بەختم هەیە کە خاوەنی ئەو دایبابەم. دایبابم هەمیشە هانیان دەدام و باشترین سەرمەشقی ژیانم بوون. هەمیشە گرەنتییان دەدایە بەرم و دەیانووت دڵنیین لەوەی کە ئەوەی بتەوێت بەدەستی دەهێنیت. هانیان دەدام خۆم لەسەر پێی خۆم بووەستم و بیر لە شتەکان بکەمەوە و خۆم بڕیار بدەم. هەمیشە پێیان دەووتم کە بەلای ئێمەوە گرنگترین شت خۆشبەختی تۆیە.

دایکم چونکە خۆی مامۆستا بوو و وانەی بە کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت دەوتەوە، فێری ئارامی و بەخشندەیی دەکردم و بووبوە مامۆستای منیش. هەمیشە کەسێکی گەشبین و ڕووخۆش

بوو فێری ئەوەی دەکردم کە گوێ بە ناخۆشیەکانی ژیان نەدەم و دەیوت: لە ژیانتدا هەرشتێک ڕووبدات، شایەنی ئەوە نییە کە بۆی تووڕە بیت.

باوکم کابرایەکی بازرگانی کارامە بوو و نموونەی کەسایەتی ڕاستگۆ و شکۆمەند بوو. فێری کردم کە گرێبەستم لەگەڵ هەر کەسێک کرد و بەڵێنم بە هەرکەسێک دا، دەبێت لەپێناویدا سەرم دانێم و ڕێزی بەڵێنەکەم بگرم و هەرچی بوو دەبێت باجەکەی بدەم. ئێستا دایک و باوکم زۆر هاندەری من و (ڕۆبێرت)ن و هەردەم شانازیمان پێوە دەکەن.

جانیس: تۆش وەکو هەموومان حەزت لە جەوی دوورگەکان بوو، بۆیە هەر لەوێ مایتەوە.

کیم: بێگومان، ئەوکاتە هەموومان گەنج بووین و هیچ بەرپرسیارێتیەکمان لەسەر شان نەبوو. ئیتر چۆن خۆش نابێت؟

**یەکەم پیشەم**

بەردەوام بووم لە چیرۆکەکەم و ووتم: یەکەم ئیشم لە دەزگایەکی میدیایی بوو بۆ ڕیکلام لە هانۆلۆلۆ. هاوپیشەکانم هەمووی کەسی باش و ڕووخۆش بوون و لە سەرو هەموویەوە، هانۆلۆلۆ شوێنێکی بچووک بوو و هەر زوو شارەزای وردەکاریەکانی ڕیکلام بووم تیایدا. جا هەر لە ڕێگەی ئەو دەزگایەوە، چوومە ئاژانسێکی تر و لەوێ پلەی یەکەمم وەرگرت بۆ کاری فرۆشتنی ڕیکلام. ئەها ئەو کاتە بوو کە کۆتا جار یەکترمان بینی. ئاخێر ئاسان نییە یەکەم بیت لە فرۆشتنا، لە کاتێکدا هیچ کۆرسێکت وەرنەگرتبێت لەسەر فرۆشتن.

ئەو کاتەی ٢٥ ساڵ بووم، گۆڤارێکم بەڕێوە دەبرد کە خزمەتی لایەنی بازرگانی دەکرد لە هانۆلۆلۆ. سەرئێشەو بەزموڕەزمی

دنیای هەبوو. دەبوو ڕیکلامەکان زۆر بە باشی بکەین و وا بکەین کە ژمـــارەی دوای ئەوە فرۆشـــی هەبێـــت. بەڵام لە کۆتاییـــدا کارەکانمان هەمووی بە سەرکەوتوویی تێپەڕاند.

لێسـلی: واتە ئەو کـاتەی کە یەکترمـان بینـی تـۆ خەریکـی ئەوە بوویت؟ ئەی دوای ئەوە خەریکی چی بوویت؟

دوو ساڵ لەو گۆڤارە بووم، بەڵام دوای دوو ساڵەکە بڕیارم دا کە پـلانەکەم بگـۆڕم. پـلانەکەم بەو شـێوەیە بـوو کە بـڕۆم بـۆ نیویـۆرک و لە ئاژانسـی Mecca کـار بـکەم. دواتـر پـلەم بەرزبکرێتەوە بۆ بەڕێوبەری Madison Avenue .بەڵام جارێکی تر بیرم لێ کردەوە. بە خـۆمم ووت باشـە وا ئەوەشت کرد، خـۆ هێشتا تۆ بەڕیوەبەرێکت دەبێت. ئاخێر لە ئەزموونی کاری خـۆمەوە بـۆم دەرکەوتبـوو کە مـن نـاتوانم قبـووڵی بـکەم ئەمـرم بەسـەردا بکرێت. وەک پێم ووتن خۆم دوو جار لەسەر ئەوە دەرکرابووم کە نەمدەتوانی ئەوە قبووڵ بکەم.

بۆیە دامنا کە ئەوە پلانی دووەمـم بێ. بیرم کردەوە کە دەبێت من کارێک بکەم کە تیایدا خۆم بەڕێوبەری خۆم بم و کار بۆ کەس نەکەم. بەڵام کێشـەکە ئەوە بـوو کە هـیچ سـەرەداوێکم لا نەبـوو. نەمدەزانی چی بکەم و لە کوێوە دەست پێ بکەم. لە دەورووبەرم کەسانێک نەبوون کە ڕێنیشاندەرم بن. نوقمی ئەوە بووبووم، بەڵام تەواو خۆم ساغ کردبووەوە کە دەبێت مـن کار بۆخـۆم بکەم. بەو پەڕی متمانەبوخۆبوونەوە ڕووم کردە نیویۆرک.

**یەکەم ژووانم لەگەڵ ڕۆبێرت**

ڕۆژێکیان کارینی هاوڕێم بانگهێشت کرد بۆ نان خواردن بۆ ئەوەی پرسێکی پێ بکەم لەسەر ڕۆیشتنم بەرەو نیویۆرک. دوای ئەوەی لە قاعەی لەشجوانیەکە هاتینە دەرەوە، لە جێگەیەک یەکمان بینی و لەوێ کارین دەستی ڕاکێشا بۆ ڕۆبێرت و بە یەکتری ناساندین و سڵاومان لەیەک کرد.

جا چیتان بۆ باس بکەم؟ شەش دانە مانگ ئەو ڕۆبێرتە داوای ئیلاقەی لێ کردم و من ڕەتم دەکردەوە و دەمووت کە من دەڕۆم بۆ نیویۆرک، نامەوێت پەیوەندی دامەزرێنم. جا شانسی من کارین و ڕۆبێرت هەشت ساڵ بوو هاوڕێ بوون. بۆیە ڕۆبێرت تەلەفۆنی بۆ کارین کردبوو و داوای لێ کردبوو کە منی بۆ ڕازی بکات.

(کارین)یش هەمیشە دەهات و باسی ڕۆبێرتی بۆ دەکردم. کێشەکە ئەوە بوو ئەوەندە بە باشی باسی ڕۆبێرتی کردبوو لەلام، من لە دڵی خۆمدا دەمووت کە کارین دڵی بە ڕۆبێرتەوەیە و منیش هەستم بە ئازاری ویژدانم دەکرد کە لەگەڵ کەسێک پەیوەندی ببەستم کە هاوڕێکەم خۆشی دەوێت. دوو مانگی بەسەردا ڕۆیشت کە من هەر سەرقاڵی پلاندانان بووم بۆ سەفەرەکەی نیویۆرکم. لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا ڕۆبێرت هەر خەریکی گوڵ ناردن بوو بۆم و جارێکیش کارین هات و ئەوەی بۆ ڕوون کردمەوە کە کارین و ڕۆبێرت تەنها هاوڕێن و ئەو هیچ هەستێکی نییە بۆ ڕۆبێرت. هەر بۆیە ڕۆژێک ڕۆبێرت پەیوەندی پێوە کردم و داوای چونەدەرەوەی لێ کردم و منیش لێتان ناشارمەوە دڵم بۆی لێ دەدا، چونکە سەرسام بووم بەوەی کە ئەوەندە چاوی لەسەرمە. ئیتر ڕازی بووم و ووتم: پێت چۆنە ئەم ئێوارەیە؟

ڕۆبێرت چونکە هاوڕێی کارین بوو، پرسیاری کردبوو و بۆی دەرکەوتبوو کە من حەزم لە پیاسەی کەنار دەریایە. جا لە جێگەیەک یەکترمان بینی و ڕۆبێرت پلانی دانابوو کە من هاتم کارمەندەکان دەرگام بۆ بکەنەوە و پێم بڵێن: تۆ دەبێت کیم بیت، کە بەڕێز ڕۆبێرت چاوەڕوانتە. ئیتر یەکمان بینی و لە چێشتخانەیەکی بەلەزەتی بەناوبانگی هانۆلۆلۆ کە ناوی Michel's بوو، لە کەنار دەریاکە نانی ئێوارەمان خوارد و لەوکاتەوە تا ئێستا پێکەوە دەژین و دڵی ڕازی کردم.

**هەر لە یەکەم بینینەوە، هاوبەش بووین.**

بیرمە ئەو شەوە تا ٣ ی بەرەبەیان سەرقاڵی قسە کردن بووین. ڕۆبێرت لێی پرسیم کە خەونم چییە لە ژیانمدا و دەمەوێت چی بکەم؟ منیش بێ سێ و دوو یەکسەر ووتم: دەمەوێت کاری خۆمم هەبێت و خۆم بەڕێوبەری خۆم بم. حەزم لەوە نییە کەس فەرمانم بەسەردا بکات. دەمەوێت بازرگانی بکەم.

ڕۆبێرت ووتی: ئێ من دەتوانم هاوکارت بم لەوەدا. نزیکەی مانگێک بوو یەکمان ناسیبوو یەکەم سەرکێشی کارمان پێکەوە کرد. لەو کاتەوە تا ئێستا هەم هاوبەشی کارمە و هەم هاوبەشی ژیانم.

هەر ئەو شەوە، ڕۆبێرت باسی ئەو شێوازە کارەی بۆ کردم کە باوکی زەنگین فێری کردبوو. هێڵکاریەکەی بۆ کێشام. وەرەقەیەکی بچووکی لە گیرفانی دەرکرد و هێڵکاری (چوارینەی کار)ی بۆ کێشام.

ڕۆبێرت ووتی: من ناوم ناوە (گۆشەی پارەپەیدا کردن). چوار گۆشە نیشان دەدات کە هەرکەسە و لە گۆشەیەکدا سەرقاڵی پارە پەیداکردنە لەم ژیانەدا.




ڕۆبێرت بۆی شی کردمەوە کە
(E= Employee) واتە فەرمانبەر و کارمەند
(S = small Business) واتە بازرگانی بچووک (کاری خۆت
(B = Big Business) واتە بازرگانی گەورە (خاوەن کار
(I = investment)واتە وەبەرهێنان

کیم: باشە من ئێستا (I) م واتە وەبەرهێنەرم. بەڵام جیاوزی نێوان بازرگانی بچووک و بازرگانی گەورە چییە؟ واتە جیاوازی نێوان کاری خۆت و خاوەنکار چییە؟

ڕۆبێرت وەک هێلکەی پاککراو بۆی ڕوون کردمەوە کە لە کاری خۆتدا تەنها خۆت کار دەکەیت، وەک پزیشک و فیتەر و دەلاک. واتە خۆیان سەرچاوەی داهاتی خۆیانن. بەڵام خاوەن کار خۆی کار ناکات. بەڵکو پشت بە کەسانی دیکە دەبەستێت. وەک مایکرۆسۆفت و ستاربەکس و ماکدۆنالز. جیاوازیەکە ڕوونتر دەبێتەوە کاتێک دەزانین ئەگەر (S) مانگێک بچێت بۆ گەشت و پشوو وەربگرێت، داهات و ئیشەکەشی پشوو وەردەگرێت. بەڵام کاتێک (B) ساڵێک پشوو وەردەگرێت، کاتێک دێتەوە سەر کار، داهاتوەکەی وەک خۆیەتی.

هەرلەبەر ئەوە، نهێنی بوون بە I ئەوەیە کە پارەکانت ئیش بۆ تۆ دەکەن، نەک تۆ ئیش بۆ پارە بکەیت.

کیم: لەبەر ئەوە من دەمەوێت ببم B و I بۆئەوەی پارەکانم ئیشم بۆ بکەن و من نەچم بەلایدا.

ڕۆبێرت: پلانەکە ڕێک ئاوایە!

دوای دوو مانگ من و ڕۆبێرت یەکەم کارمان دەست پێ کرد. لۆگۆمان دیزاین کرد و لەسەرمان نووسی (بردنەوە و متمانە) ئەو دیزاینەمان لەسەر کراس و چاکەت و جلو بەرگەکان چاپ کرد و و سیمینار و کۆرسەکانمان لە سەرانسەری ئەمریکادا دەفرۆشت. بەبۆنەی ئەم کارەمانەوە، دەمانویست خەرجی ئەو گەشت و تێچووانە دەرکەینەوە کە بۆ کاری گەورەتری داهاتوو دەمانکرد.

### ١٩٨٥ ئەو ساڵەی دۆزەخمان بە چاوی خۆمان بینی

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ دا، ئەوەی هەمانبوو فرۆشتمان و کردمان بە پارە. هانۆلۆلۆمان بەجێهێشت و ڕۆیشتین بەرەو کالیفۆرنیا بە ئامانجی دامەزراندی کاری داهاتوومان لەوێ. پیش ئەوەی شتەکانمان بفرۆشین زۆر بێ حاڵ بووین و وەزعمان شڕ بوو.

تەنانەت هەندێک کات لەناو تویێتاکەماندا دەخەوتین و شوێنی مانەوەمان نەبوو. هەتا بڵێی گوزەرانمان خراپ بوو. ئەتوانم بڵێم دۆزەخمان بە چاوی خۆمان بینی. یاخوا دوژمنەکەشم ئەوەی بەسەر نەیەت.

پات: تێناگەم، واتە چۆن؟

کیم: قەت بیستووتە دەڵێن ناتوانی بە پارە خۆشبەختی بکڕیت؟

پات: بەڵێ بیستوومە

کیم: بەڵام من وا ناڵێم. باوەڕکەن ئەوکاتە لە گوزەرانێکدا بووین کە بەهۆی هەژاریمانەوە زۆربەی کات شەڕمان بوو و دەمان خستە ئەستۆی یەکتری. شەڕمان بەیەکتر دەفرۆشت. بێزاربووین و باوەڕمان بە خۆمان نەمابوو. من خۆم کەسێکی گەشبینم، بەڵام لەو ماوەیەدا ڕەشبینترین کەسی سەرزەوی من بووم و گومانم لە خۆمان هەبوو و گومانم لەوە هەبوو کە بگەین بە ئامانجەکانمان. سەیری خۆمم دەکرد و هیچ ترووسکاییەکم لە خۆمدا نەدەبینی.

پات: ئەی چۆن خۆتان ڕزگار کرد لەو نەگبەتیانەی باسی دەکەیت؟

کیم: سەرەڕای ئەو دۆخەی تیایدا بووین، هێشتا من و ڕۆبێرت لە دەرگای کەسمان نەدا و نەچوینە لای هیچ خزم و کەس و کار و ناسیاوێک. تە ئەمرم بیرم ناچێتەوە کە جارێک هاوڕێیەکمان گەیاندینیە هەرزانترین هۆتێلی سانتیاگۆ. ئەوکاتە هەمووکەس ئەو ئامێرەی نەبوو کە سەیری کارتی پێ بکات بۆ ئەوەی بزانێت پارەی تیا ماوە یان نا. ڕۆیشتینە ژوورەو و کارتەکەم نیشانی کارمەندی هۆتێلەکە دا و دووعام دەکرد کە سەیری نەکات بزانێت پارەی تیایە یان نا. کارمەندەکە کۆپیەکی لە کارتەکەم گرتەوە و کلیلی ژوورێکی پێ دام. دەمویست لە خۆشیدا هاوارکەم و لەو ناوەدا باز بدەم. بەڵام نەدەکرا چونکە کارمەندەکە پێی دەزانی. لە

خۆشیا ڕۆیشتمە دەرەوە و پێم ووتن کە ژوورمان دەستکەوت. لە خۆشیا خەریک بوو باڵ بگرم.

شەوەکەی لەگەڵ ڕۆبێرت ڕۆیشتینە دەرەوە و پیاسەیەکی ئەو ناوەمان کرد و KFC مان خوارد و دواتر ڕۆیشتین هەندێک میوەمان کڕی و ڕۆیشتینەوە بۆ هۆتێلەکە. ئەو هۆتێلە یەکێک بوو لە خراپترین و هەرزانترین هۆتێلەکان، بەڵام ئەو شەوە بۆ ئێمە وەک بەهەشت وابوو. هەرچەندە نەماندەزانی دەبێت بەیانی چی بکەین، بەڵام گرنگ ئەوە بوو ئەو شەوە شوێنێکمان دەستکەوت تیایدا بحەوێینەوە.

زۆر دڵنیام، ئەگەر من و ڕۆبێرت یەکترمان نەناسیایە، هیچ کام لەمانەمان بەسەر نەدەهات. بە درێژایی ئەو ماوەیە هاوڕێ و خزمەکانمان پێیان دەووتین کە بۆ ناچن ئیشێک بکەن و مووچەیەکتان هەبێت هەتا وورده وورده ئیشەکەی خۆتان دەکەوێتەوە سەرپێی خۆی. بەڵام ئێمە دەمانزانی ئەگەر ئیش بۆ کەسێک بکەین، ئەوا هەنگاوێک دێینە دواوە. ووتمان تا ئێرەمان هێناوە، با بەردەوام بین. دەمانزانی کە ئەگەر ئیش بۆ کەسێک بکەین و مووچەمان هەبێت، ئەوا لەوانەیە هەرگیز دەست نەکەینەوە بە ئیشی خۆمان. چونکە فێری تەمبەڵی دەبین و نامانەوێت ئەو ئاسوودەییە لە خۆمان تێک بدەین.

کاتێک ئاوڕێک بۆ ڕابردوو دەدەمەوە، بۆم دەردەکەوێت کە ئەوە ئەو ڕابردووە سەختە بوو وای لێ کردین ڕێگەچارەیەک بدۆزینەوە و خۆمان ڕزگار بکەین. ئەو ڕۆژە سەختانە بوو هانی داین ببین بەم کەسەی ئێستا. ئێمە خۆمان ساغ کردبووەوە کە دەبێت کاری خۆمان هەبێت.

## کاتی کەوتنە سەر پێی خۆمان

لە کۆتاییدا هەردووکمان هەرچی ناخۆشی دنیا بووب چەشتمان، کە هەر خۆمان هۆکارەکەی بووین. ڕۆبێرت گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە کەسی تر ناتوانێت لەم دۆخە خراپە ڕزگارمان بکات خۆمان نەبین. منیش بڕیاری ئەوەم دابوو کە لۆمەی کەس نەکەم بۆ ئەم دۆخە. بە کورتی هەردووکمان بڕیاری ئەوەمان دابوو کە خۆمان کار بۆ ڕزگاربوونی خۆمان بکەین، وە کردیشمان.

جانیس: کارەکەتان چی بوو؟

کیم: کۆمپانیایەکی پەروەردەییمان دامەزراند. بەو پێیەی کە ڕۆبێرت کاتی خۆی ڕێگای فێربوونی وانەووتنەوەی خوێندبوو و لە هەمان کاتدا ئەوکاتە لە هانۆلۆلۆ چەند پرۆژەیەکی بازرگانی خۆی هەبووبوو. بۆیە وردە وردە ئەم کۆمپانیایەمان دامەزراند و دواتر بە پێی ڕۆژگار، بوو بە ١١ لق لە ٧ وڵاتی جیاواز.

لێسلی: ئەی کەی هاوسەرگیریتان کرد؟

کیم: لە مانگی یانزەی ساڵی ١٩٨٦. هەرچەندە دەمانزانی کە هیچ لەبار نییە دۆخەکە، بەڵام گەشبین بووین بەوەی کە داهاتوویەکی باش لەپێشمانە.

پات: ئەی دوای ئەوە پرۆژەکەتان چی لێهات؟ هەر بەردەوامە؟

کیم: بۆ ماوەیەکەی زۆر بەردەوام بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٤ من و ڕۆبێرت خۆمان خانەنشین کرد و فرۆشتمان. من ٣٧ ساڵ بووم و ڕۆبێرت ٤٧ ساڵ. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو ئەوکاتە هەردووکمان سەربەخۆ بووین.

پات: سەربەخۆیی دارایی؟

کیم: بەڵێ. چیتر پێویست نەبوو کار بۆ پارە بکەین. هەستێکی زۆر بێ وێنە بوو، نازانم چۆن بۆتان باس بکەم.

لیسلی: واتە کۆمپانیاکەتان بە پارەیەکی وا فرۆشت کە تا کۆتایی تەمەنتان لێی بخۆن و هێشتا تەواو نەبێت؟

دامە پڕمەی پێکەنین: نەوەڵا وا نەبوو. زۆربەی خەڵک وا دەزانێ وامان کردووە. جا خۆ ئەگەر بە پارەی کۆمپانیاکە پاڵمان بدایەوە، ئەوا بەشی دووساڵی دەکردین و دەکەوتینە سەر ساجی عەلی.

لیسلی: وەڵا تێناگەم، واتە چۆن؟

کیم: ئێمە ساڵی ١٩٩٤ هەردووکمان خۆمان خانەنشین کرد و چیتر پێویستمان نەبوو کار بکەین. پارە کاری بۆ دەکردین. مانگانە پارە دەهاتە حسابەکەمانەوە بێ ئەوەی خۆمان کار بکەین. بەتایبەتی لەڕێگەی موڵکەکانمانەوە. ئێستا تێدەگەیت مەبەستم چییە؟

**یەکەم وەبەرهێنانم**

پات: من هیچ دەربارەی وەبەرهێنان نازانم. ئەمانە هەمووی تازەن بۆ من.

کیم: منیش هەر وا بووم. کاتێک لە سەرەتای ڕێگەکەدا بووم هیچم دەربارەی وەبەرهێنان نەدەزانی. تووشی چەندین نشێوی و ناخۆشی بووم هەتا فێربووم و شارەزاییم پەیدا کرد. من سەرەتا لە موڵکەوە دەستم پێ کرد چونکە ئەقڵم ئەوەی دەبڕی. خانوویەکی بچووکی خنجیلەم لە ئۆریگن کڕی ساڵی ١٩٨٩. دوو کۆڵان دوور بوو لە ماڵی خۆمانەوە. کڕین و فرۆشتنی ئەو مەڵکە یەکێک بوو لە قورسترین کارەکانی ژیانم. زیرەم کردبوو ئەوەندە دەترسام. نەمدەزانی زەرەر دەکەم یان قازانج.

لە سەرەتاوە زۆر قەلەق بووم، بەڵام دوای ئەوە شاگەشکە بووم لە خۆشیا کاتێک هەمووی مانگێک نەدەبوو خانووەکەم کڕیبوو، کەچی ٥٠ وەرەقە خێریان دەدامێ ئەگەر بیفرۆشمەوە. ئەو کاتە

زۆر کەم ئەزمـــوون بـــووم، بەڵام ئێســـتا توانـــای بەڕێـــوەبردنی ملیارەهـــا دۆلارم هەیە. حـــاڵی حـــازر کە قســـەتان بـــۆ ئەکەم، مـــن سەربەخۆیی داراییم بەدەست هێناوە و پارەکانم کارم بۆ دەکەن و من پاڵم لێ داوەتەوە.

جـانیس: کاتێک گـوێم لە وەبەرهێنـان دەبێت، یەکسـەر خەیـاڵم بـۆ پرۆژەی بازرگانی گەورە و پارەی زەبەلاح دەچێت. نەک بۆ کڕین و فرۆشتنی خانوو و زەوی. ئەو بابەتە هیچ قازنجێکی تیایە؟

کیم: نەخێر! قازانجەکەی لە کڕین و فرۆشتنیدا نییە، بەڵکو لە کڕین و هێشـتنەوەدایەتی، هەتـا کـاتی خـۆی. جـا ئەم هەویـرە ئـاو زۆر دەکێشێت و قسە زۆر هەڵدەگرێت، ئەگەر حەزت کرد دواتر قسـەی لەسەر دەکەین.

**کۆمپانیای باوکی زەنگین**

لێسلی: ئەی دوای ئەوەی کە خانەنشین بوون چیتان کرد؟ بڕوا نـاکەم هەمـوو ڕۆژێـک خەریکـی وەرزش بیـت و لە مەلەونـگە کەوتبیت. ئەمە تۆ نیت!

قاقایەکم لێدا و ووتم: حاشا ئەوە من نیم. ئەوساڵە بەو پارەیەی کە پێمـان بـوو، ٨٥ پـارچە زەویمـان کـڕی لە چیاکـانی باشـووری ئەریزۆنا. ناوچەیەکی هونەری زۆر جوان بوو و تەنها کوخێکی تیا بـوو. کوخەکەمـان ڕووخانـد و دووبـارە دانەیەکـی جوانترمـان درووست کردەوە. ناوچەیەکی تـا بڵێی بێدەنگ و ئارام و دوور لە ژاوەژاو و قەرەباڵغی.

لەو نـاوچە ئـارامەدا بـوو کە ڕۆبێـرت کتێبـی (بـاوکی زەنگین و بـــاوکی هەژار)*ی نووســـی، کە کتێبـــێکە بـــاس لەوە دەکـــات زەنگینەکـان چـی فێـری منداڵەکانان دەکەن کە هەژارەکـان لێـی بێ

ئاگان. کاتێک ڕۆبێرت سەرقاڵی نووسینی ئەو کتێبە بوو، من لە (فینیکس) بووم. سەرقاڵی ئەوە بووم هۆتێلێکی بچووکم هەبوو دەمکرد بە بەڵاخانەیەک. پرۆژەیەکی سەرەتام بوو، بەڵام زۆر دڵم پێی خۆش بوو و سەرکەوتوو بووم تیایدا.

ئەو کتێبەی ڕۆبێرت کە بۆم باس کردن، ئێستا یەکێکە لە پرفرۆشترین کتێبەکانی مێژوو. پێش دەستپێکردنی کتێبەکە، یاریەکمان درووست کرد بە ناوی cash flow بۆئەوەی لە ڕێگەی ئەو یارییەوە خەڵک فێربکەین چۆن سەربەخۆیی دارایی بەدەست بهێنن. شتێک هەیە پێی دەڵێن (چەماوەی داخراو) ئەو دۆخەیە کە تیایدا داهات و خەرجیەکانت وەک یەکە و ناتوانیت خۆت بنیاد بنێیت. ئەو یاریە هانی دەدایت کە فێربیت چۆن لەو چەماوەیە خۆت ڕزگار بکەیت.

من و ڕۆبێرت و شارۆن لەسەر گیرفانی خۆمان کتێبەکەمان چاپ کرد. سەرەتا پێمان وابوو فرۆشتنێکی خەیاڵی دەبێت، بەڵام هیچ دەزگایەک ئامادە نەبوو لێمان وەربگرێت. مەجبوور هاوڕێیەکمان شۆرگەی ئۆتۆمبێلی هەبوو، لەوێ دامانـنا. لەوێ وورده وورده لێی دەفرۆشرا و دوای ٢ ساڵ، چووە لیستی پرفرۆشترین کتێبەکانەوە. لە خۆشیدا خەریک بوو باڵمان دەگرت.

لە ڕاستیدا پلانمان دانەنابوو کە کۆمپانیای تر درووست بکەین. بەڵام کۆمپانیای Rich Dad مان دانا و گەشەیەکی کرد کە بە خەیاڵی کەسماندا نەدەهات. بەبۆنەی کتێبی (باوکی زەنگین و باوکی هەژار)ەوە پرۆژەکەمان زۆر باش ناسرا و ئێستا ئەو کتێبە بە ٤٦ زمانی جیهانی نووسراوە و لە سەرتاسەری جیهاندا دەفرۆشرێت.

لیسلی: ژیانێکی سەیرە! چەندین ناخۆشی هاتۆتە ڕێگەت. تەنانەت بێ لانە و ماڵ و حاڵ بوویت. کەچی ئێستا خانەنشین بوویت و خاوەنی کۆمپانیایەکی جیهانیت. زۆر بەبەختیت، خۆزگەم بە خۆت.
کیم: بێگومان بەختم هەیە، بەڵام بڕوا ناکەم هەموو کەس بەرگەی ئەو ناخۆشیانە بگرێت تا دەگات بەم ڕۆژە. من و ڕۆبێرت بەرگەمان گرت. ئێمە ڕێگەیەکمان هەڵبژارد کە زۆربەی خەڵک ناوێرن خۆیان لە قەرەی بدەن. ئێمە بە هیوای داهاتوویەکی گەش هەڵمانبژارد و دواتر پاداشتەکەیمان وەرگرت.
ئەمە چیرۆکی من بوو، ناخۆش نەبوو.

**تێبینیەکی گرنگ بۆ خانمان**

بەهۆی کۆمپانیای (باوکی زەنگین)ەوە، زۆربەی کات خانمان دێنەلام و دەڵێن ئامۆژگاریمان بکە کە خانمان چۆن دەستپێبکەن. ئامانجی سەرەکیم لە نووسینی ئەم کتێبە هەر ئەمەیە کە هانی خانمان بدەم دەست بکەن بە وەبەرهێنان و کاری خۆیان. دەمەوێت کە خانمان لەوە تێبگەن ئەمە عیلمی زەڕڕە نییە و هەمووکەس دەتوانێت بیکات. بەڵام کەمێک کاتی و زانیاری دەوێت.
خاڵێکی تر کە دەمەوێت بۆ خانمانی ڕوون بکەمەوە ئەوەیە کە چیتر خانمان ناتوانن پشت بە هاوسەر و خێزان و حکوومەت ببەستن بۆ بابەتی دارایی. ئەوەی بۆ دایک و نەنکمان گونجاوە، چیتر بۆ ئێمە ناگونجێت. بە بۆچوونی من، خانمان پێویستە کۆنترۆڵی باری دارایی خۆیان لەدەست خۆیاندا بێت بۆ ئەوەی، خوا نەخواستە، بە هەر هۆکارێک، سەرچاوەی داهاتی چواردەوور نەما، ئێمە بتوانین ژیانی خۆمان و منداڵەکانمان دەستەبەر بکەین.

ئیتر بە حەزی خۆمان نییە، دەبێت لەمەولا بیر لەوە بکەینەوە، خۆشی بێ و ترشی بێ ئەمە ژیانە و ناتوانی لەم ڕاستیانە ڕابکەیت. ئێستا سەردەمەکە گۆڕاوە و کاتی ئەوەیە کە کلیلی سەرکەوتنی خۆمان، بەدەستی خۆمانەوە بێت.

کیم

## بەشی چوارەم

## بیست ساڵ پێش ئێستا، لە دوورگەکان

دوای ئەوە گوێبیستی چیرۆکی هەریەکەمان بووین، دەستمان کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهات و ڕۆژە خۆشەکانی سەردەمی زانکۆ و هەر دەمانووت "بیرتە؟....." "بیرتە.....؟"
پات: باشە کێ کۆتا نیوەڕۆخوانی بیرە؟
هەمووان بۆ ٣٠ چرکەیەک بێدەنگ بووین و بیرمان دەکردەوە. ڕاستە کەسمان لە هەوایی لەدایک نەبووین، بەڵام بە خەیاڵ هەمووان ڕۆیشتینەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی لەوێ بەسەرمان بردوون لە کەنار دەریا و دەنگی شەپۆلەکان و کەش و هەوا دڵڕفێنەکەی. بیرمە یەکەم جار کە ڕۆیشتم بۆ هەوایی لەگەڵ دایک و باوکمدا بووم، لە ناوەندی بووم. هێندە بەلامەوە جوان بوو، بڕیارم دا جارێکی تر بێمەوە و ئەمجارە لێرە بمێنمەوە. هەمووان نغرۆی ئەو خەیاڵانە بووین. سەردەمانێک کە گەنج بووین و هیچ بەرپرسیارێتیەکمان لەسەر شان نەبوو.
لەپڕ جانیس بێدەنگیەکەی شکاند و ووتی: بیرم کەوتەوە! لە Tahitian Lanai بووین.
لێسلی: وا بوو! بیرمە ڕۆژێکی هەتاوی خۆشی مانگی یەک بوو. جانیس کڵاوێکی گەورەی لەسەردا بوو و مارسا جلەکانی پەمەیی بوو.
پات: بیرمە لە دەرەوە دانیشتبووین لە کەنار دەریاکە. بۆنی کرێمی دژەخۆرەکان دەهات و شنەی با بەلاماندا گوزەری دەکرد. بەڕاستی ڕۆژانێکی خۆش بوو. بێ خەم و خەفەت و بەرپرسیارێتی. پارەشمان پێ نەبوو و خۆشیش دەژیاین.
جانیس: جا لەش و لارێکی ڕێک و جوانمان هەبوو!

کیم: ڕۆژەکانمان زۆر خۆش بوون و یادگاریەکان زۆرن. خۆزگە ترەیسی و مارساش بهاتنایە. بەڵام بە ڕاسی ئافەرین بۆ تۆ پات کە توانیت هەموومان کۆبکەیتەوە. بەڕاستی قەرزاری تۆین.

**چیرۆکی مارسا:**

لێسلی: بیرمە مارسا هەمیشە بە خاولیەک و تەختەی ئاوەخلیسکێکەیەوە لەو کەنار دەریایە بوو. ئێ ئەو خۆی لە باشووری کالیفۆرنیا لە کەنار دەریاکان گەورە بووبوو، دیار بوو بۆ ئەوەندە دڵی بە کەنار دەریاکان دەکرێتەوە. هەر لەبەرئەوەش بوو چووە بەشی زەریاناسی.

جانیس: بیرمە کۆتا جار کە مارسام بینی زۆر دڵی خۆش بوو چونکە وەرگیرابوو لە پەیمانگای ژیانی ژێردەریایی. حەزی دنیای لەو بوارە بوو. ئەو کچە خەونی بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ Jacques Cousteau کاربکات لەسەر بەلەمە بەناوبانگەکەی کە ناوی Calypso بوو. پات، تۆ زیاتر ئاگاداری، وەک بزانی گەیشتووە بە خەونەکەی؟

پات: وەڵا کەم کەم قسە دەکەین. کۆتا جار کە قسەمان کرد لێم پرسی کە بۆچی گەڕاوەتەوە بۆ کالیفۆرنیا؟ ووتی هاوکاری باوکم دەکەم لە پرۆژەیەکی بازرگانیدا. کارمەندێکی باشی باوکم وازی لە کارەکەی هێناوە و دەبێت من شوێنەکەی بۆ پڕبکەمەوە. ووتی کە لە سەرەتدا بۆ ماوەی دوو مانگ ڕۆیشتووم، بەڵام ئێستا بڕیاری داوە بۆ هەتاهەتایە لەوێ بمێنێتەوە.

سەبارەت بە خەونەکەشی، ووتی ئەوە جاران بوو. ئێستا باوکم کۆچی دوایی کردووە و من و دایکم بە تەنها ماوینەتەوە، بە دەنگیدا دیار بوو کە هیچ ئاسوودە نییە. وەک پێشتر ووتم، دایکی

نەخۆشــە و هەر لەبەر ئەوەش بــووە نەیتــوانی لێرە ئامــادە بێت. چــونکە خــۆی ئاگــاداری دایکیەتــی و کەســی تریــان نیــیە. ئەرکی قورسە داماوە.
کیم: واتە نەگەڕاوەتەوە بۆ دەریاناسی؟
پات: بەخــوا بە قســەکانیا دیــار بــوو کە نــا. چــونکە باســم کرد هەوڵی دا بابەتەکە بگۆڕیت و باسی نەکات.
جانیس: ئەی نەتزانی هاوسەرگیری کردووە؟ منداڵی هەیە؟
پات: نەوەڵا باسی ئەوەشمان نەکرد.

**چیرۆکی ترەیسی**

کیم: ئەی ترەیسی چۆنە؟ خەریکی چییە؟ کەس ئاگای لێیەتی؟
پات: زۆر تــوڕە و بێ جەو دیــار بــوو ئەم بەیــانیە کە قســەم لەگەڵ کــرد، دیــار بــوو جەویــان گرتبــوو کاتێــک نەیتوانیبــوو ئامادەبێت لەگەڵمــان. زۆر پەســت بــوو لەم دونیــایە. جــا ئیتــر نــازانم هەر ئەو دەقەیە ئاوا تــووڕە بــوو، یان هەر وایە. بەڵام چەند جارێکی تریش قســەم لەگەڵ کــردووە هەر خۆشــبەخت دیــار نەبــووە. ئاگــاداری ئەوەم کە هاوســەرگیری کــردووە و دوو منــداڵی هەیە. جــا بــۆیە ئەرکی دوو منداڵ و کۆمپانیا و ژیانی هاوسەرگیری کارێکی ئاسان نییە. ئازایە کە دەتوانێت هەرسێکی بکات.
کــیم: واو! وا دیــارە ترەیســی دوای حەزەکەی کەوتــووە. مــن و ترەیســی هەردووکمــان حەزمــان لە ئــیش کــردنە. بیرتــانە شــەوانی هەینی لە هــانۆلۆلۆ، شــەقامەکان لەبەر پیادە و خەڵک ڕێگە نەبوو پیایدا بڕۆیت. ڕێستۆرانت و بارەکان تا درەنگانی شەو کراوە بوون و گرووپەکان لەسەر شەقامەکان مۆسیقایان دەژەنی. جادە و بان جمەی دەهات. من لەوێ، لەناو ئەو هەرا و بەزمەیا ترەیسیم ناسی.

خێرا بووین بە هاوڕێ و دواتر هەردووکمان چووینە کۆلێژی بازرگانی.

ترەیسی باش خۆی دەگونجاند لەگەڵ بارودۆخەکەدا و هەمیشە ئارەزووی سەرکەوتنی زیاتری هەبوو و بەدەستی هێنا. ئاگادار بووم کە ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی زانکۆی تەواو کرد ئیشی دەستکەوت لە کۆمپانیایەکی خۆراک و چەندین جار پلەی بەرز کرایەوە. بەردەوام باسی گەشتە بازرگانیەکانی بۆ دەکردم کە دەیکرد و زۆر دڵی بە کرپارەکانی خۆش بوو. زۆر حەزی لە ئیشەکەی بوو، دڵنیام ئێستاش هەر وایە.

پات ئاهێکی هەڵکێشا و ووتی: ئاهـ کە ئاوڕ دەدەیتەوە بۆ ئەو ٢٠ ساڵەی تێپەڕیوە، سەیر دەکەیت ژیان زۆر گۆڕاوە. ژیانی خۆم ١٨٠ پلە پێچەوانەی ئەوە بوو کە خەونم پێوە دەبینی و پلانم بۆ دانابوو. شتی وا ڕوویداوە هەرگیز پێشبینیم نەکردووە. باشە دەبێت بیست ساڵی تر چی ڕووبدات؟

لیسلی: واز لە ئەوە بهێنن، قابیلە بیست ساڵی تر چی دەبێت؟ هەمووومان پیر دەبین و تەواو.

هەمووومان دامانە قاقای پێکەنین. نەماندەویست بیر لە داهاتوو بکەینەوە. دەمانویست چێژ لە نان خواردنەکە وەربگرین.

بەڵام پات سوور بوو لەسەر پرسیارەکەیی و ووتی: دەی داوەشێن پێم بڵێن، دەتانەوێ داهاتووی خۆتان چۆن بێت؟ دەتانەوێ چی بکەن و ببن بە چی؟

جانیس: حەزدەکەم لە ڕووی دارایییەوە سەربەخۆ بم و پێویستم بە کەس نەبێت و عاشقی یەکێک بم و بە دڵی خۆم گەشت بکەم.

هەمووومان ووتمان جوانە. ئێمەش دەمانهەوێت وا بین. بەڵام بیرتان بێت لە منداڵیەوە ئەم پرسیارەمان لێ دەپرسن. دەتەوێت ببیت بە

چی لە داهاتوودا؟ واز بهێنن کچینە با چێژ لە ڕۆژەکەمان وەربگرین.

پات ووتی: بووەستن با ئەم قسەیەش بکەم. من دڵنیام پاش بیست ساڵی تر یەکتر دەبینینەوە و هەریەکە و خەریکی شتێکین. ئەڵێن چی بیست ساڵی تر دووبارە یەکتر ببینینەوە و باس لە بیست ساڵی ڕابردوو بکەینەوە جارێکی تر؟

بۆ ئەوەی پات قسەکەی کۆتایی پێ بهێنێت، هەموومان ووتمان ڕازین. بیست ساڵی تر جارێکی تر کۆدەبینەوە. نازانین لە کوێ و کێ ڕێکی دەخات، بەڵام قسەیەک بوو و کردمان. ووتمان یەکتر دەبینینەوە.

لیسلی ووتی: توخوا کچینە وەعدم بدەنێ کە چیتر باسی ئەو بابەتە جددیانە نەکەن. دە وازبهێنن با چێژ لەم ڕۆژە خۆشە و لەم نیوەڕۆ خوانە وەربگرین.

لەم قسانەدا بووین و شاگردەکە ووتی: کەس حەزی لە شیرینی نییە؟

# بەشی پێنجەم
## " بابەتەکە لە پارە گرنگترە "

هەر شاگردەکە ڕۆیشت و لیسلی لێی پرسیم: ئەریێ تۆ ووتت چەند ساڵێک پێش ئێشتا خانەنشین بووم، وابوو؟
ووتم: بەڵێ ساڵی ١٩٩٤ بوو.
لێسلی: نایەتە بەرچاوم کە تۆ دوای خانەنشینی سەرقاڵی کەیف و سەفا و گەڕان بیت. ئێستا ئەگەر من خانەنشین بم، بە دڵنیایەوە بەس ئەگەڕێم و یاری گۆڵف دەکەم و دەڕۆمە گەشتە دەریاییەکان. بەڵام بەخوا بڕوا ناکام تۆ وا بیت. دڵنیام لە جاران زیاتر ئیش دەکەیت.
دامە قاقای پێکەنین و ووتم: بێگومان من باوەڕم بەوە نییە کە دوای خانەنشین بوون پاڵ بدەیتەوە. کێشەکە ئەوەیە کە زۆربەی خەڵک کاتێک گوێیان لە ووشەی خانەنشین دەبێت، یەکسەر خەیاڵیان بۆ دوو هاوسەر دەچێت کە پیربوون و بۆخۆیان خەریکی گەڕان و قەراغ دەریا و گەشت کردنن.
جانیس: ئەوە خوا دایناوە بۆ من. ئەی کە حەزم لە گەڕان و گەشتی دەریایە.
کیم: ئێ منیش حەزم لەوەیە. بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم کە خانەنشین بوون لای من واتای کۆتایی ژیانی کار کردن نییە. من بەردەوام حەزم لە فێربوون و تاقیکردنەوەی شتی نوێیە. خانەنشین بوون لای من واتای ئەوەیە کە چیتر پێویستم بەوە نییە کار بکەم و هەوڵ بدەم داهاتێکی مانگانەم چنگ بخەم.
لێسلی: هەرچەندە ئەوە بابەتێکی شەخسییە. بەڵام دەتوانی تێمبگەیەنیت کە چۆن گەیشتیتە ئەو ئاستە؟ ،مەبەستم ئەوەیە چۆن

گەیشتیت بە ئاستێک کە چیتر پێویست نەکات کار بکەیت و لە پرۆژە بازرگانیەکانتەوە پارەت بۆ بێت؟

کیم: پرۆسەی گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی پرۆسەیەکە، شتێک نییە لە شەو و ڕۆژێکدا ڕووبدات. وەک چۆن باوکی زەنگین هەمیشە ئامۆژگاری ڕۆبێرتی دەکرد و دەیووت کە فێربە وا بکەیت چۆن پارە ئیشت بۆ بکات، بۆ ئەوەی تۆ ناچار نەبیت ئیش بۆ پارە بکەیت. دەیووت: ئەگەر فێری ئەوە نەبیت کە پارە کارت بۆ بکات، ئەوا دەبێت هەمیشە کار بۆ پارە بکەیت بۆ ئەوەی کەم نەکات.

جانیس: مەبەستت چییە لە باوکی زەنگینی ڕۆبێرت؟

کیم: باوکی زەنگین، باوکی یەکێک بوو لە نزیکترین هاوڕێکانی ڕۆبێرت. لە تەمەنێکی کەمدا وازی لە خوێندن هێنابوو بۆ ئەوەی هاوکاری خێزانەکەی بکات. یەکێک بوو لە زەنگینترین پیاوەکانی هەوایی. ڕۆبێرت هەرچی فێربووە دەربارەی پارە و وەبەرهێنان، لە چاوی باوکی زەنگینی دەبینێت و لەوەوە وەری گرتووە. من ئەو وانەیە لە ساڵی ١٩٨٩ فێر بووم کە چۆن وا بکەم پارە کارم بۆ بکات، نەک من کار بۆ پارە بکەم.

لێسلی ووتی: کیم، تۆ چەندجارێک باسی وەبەرهێنانت کرد. من وەبەرهێنان بە کارێکی پرمەترسی دەبینم. چەندین کەسم بینیوە کە بەهۆی وەبەرهێنانەوە مایەپووچ بوون و زەرەریان کردووە. دەبێت مێشکێکی زیرەکی پارەناست هەبێت کە وات لێ بکات لە وەبەرهێنانەکەدا زەرەر نەکەیت. بەڵام من هونەرمەندێکم. تەنانەت ناتوانم هاوسەنگی پلانەکانی ڕۆژانەشم ڕابگرم، ئێستا چۆن دەتوانم بێم وەبەرهێنان بکەم. قەت نایەتە بەرچاوم.

پات: بەخوا منیش وام. هیچ تاقەتی ئەو بوارەم نییە. ئەوە ئیشی من نییە. هاوسەرەکەم سەری لەو بوارە دەخورێ. بوارێکی زۆر

ئالۆزە. هەرگیز تێناگەم ئەو دەلاڵ و ئابووریناسانە باسی چی دەکەن. سەرم تەقەی دێت کاتێک گوێیان لێ دەگرم. باشە کیم تۆ لە بواری بازاڕی ئاڵ و گۆڕدا کار دەکەیت؟ قازانجی باشی هەیە؟ چونکە هاوسەرەکەم هەمیشە زەرەری تیا دەکات.

جانیس: منیش جار جارێک پشک دەکرم. بەڵام تاقەتم لێی نییە. دەبێت بیکرپیت و چاوەڕوان بیت نرخەکەی بەرز بێتەوە. ئێ خوا ئەیزانێ کەی بەرز دەبێتەوە. جگە لەوەش من کاری خۆمم هەیە و کاتم نییە بۆ ئەو کارانە.

جوان گوێم لە قسەکانیان گرت و ئەوانیش دوای تەواوبوونی قسەکانیان، چاوەڕوان بوون کە من وەلامیان بدەمەوە. منیش هەوڵم دا بە باشی وەڵامیان بدەمەوە. بۆیە وشەکانم هەڵدەبژارد و ووتم: جوان گوێم لە هەرسێکتان گرت. هەریەکەتان بە شێوەیەک باسی وەبەرهێنانتان کرد. لێسلی ووتی مەترسیدارە و پات ووتی ئاڵۆزە و جانیس ووتی کاتم نییە بۆی. ئێوە خۆتان بە قسەکانتان پێم دەڵێن کە وەبەرهێنان بۆ ئێوە نابێت و پارووی ئێوە نییە.

با جارێکی تر بۆتان ڕوون بکەمەوە. من ئامانجم ئەوە نییە بە تەنها وەبەرهێنان بکەم، بەڵکو ئامانجی من ئەوەیە کە بگەم بە سەربەخۆیی دارایی. واتە ئامانجەکەم لەوە گەورەترە کە تەنها وەبەرهێنان بکەم. من هەر لە منداڵییەوە حەزم لەوە نەبووە کە پشت بە کەسانی چوواردەوور ببەستم. جا بۆ من، سەربەخۆیی دارایی واتە سەربەستی ڕەها. هەتا ئەو کاتەی سەربەخۆی دارایی نەبیت، سەربەست نیت. جا سەربەخۆیی دارایی، بۆ ئەوەی لای هەمووتان ڕوون بێت، ئەو دۆخەیە کە داهاتی مانگانەت زیاتر بێت لە خەرجیەکانت، بێ ئەوەی خۆت کار بکەیت.

جا ئەم سەربەخۆییە دەتوانی بە چەندین ڕێگە بەدەستی بێنیت، بۆ نموونە بە یانسیب. بەڵام من دەمزانی کە شانسم نییە. وا نەهاتم لەبەر پارە هاوسەرگیری بکەم.

جانیس پێی بڕیم و ووتی: (ئێریکا)تان بیرە؟ شووی کرد بە کابرایەک ٣٠ساڵی ڕێک لە خۆی گەورەتر بوو، تەنها لەبەر پارەکانی.

هەموومان لە جانیس وورد بووینەوە!

جانیس: ببورن! خۆم هەڵدایە ناو بابەتەکەوە.

کیم: وەک ووتم من نەمدەویست لەبەر پارە هاوسەرگیری بکەم. بۆیە کاتێک هاوسەرگیریم کرد لەگەڵ ڕۆبێرت، بڕیارمان دا پێکەوە زەنگین بین. ئێمە لە ڕێگەی پڕۆژە بازرگانیەکەمانەوە دەستمان کرد بە پڕۆسەکە. هەرچەندە گرەنتی سەرکەوتنمان نەبوو، بەڵام چاومان کرایەوە لەگەڵ دنیای وەبەرهێنان و حەزێکی زۆرمان بۆی درووست بوو.

لیسلی ووتی: من دڵنیام کە ڕەش و سپی لە دنیای وەبەرهێنان جیا ناکەمەوە.

منیش زەردەخەنەیەکم کرد و ووتم: منیش وەک تۆ وا بووم خەمت نەبێت. لە ڕاستیا من ووشەی "وەبەرهێنان" سەرنجی ڕانەکێشام، بەڵکو ئەوە سەرنجی ڕاکێشام کە کار ناکەم و مانگانە پارە دێتە گیرفانمەوە. خۆ ئەگەر پلانم وا بوایە کە لەسەر پاشەکەوت بژیم، ئەوا پاشەکەوت ڕۆژێک هە تەواو دەبوو. بۆیە بڕیارم دا کە لەڕێگەی وەبەرهێنانەوە زەنگین بم.

پات ووتی: کەواتە پارەیەکی کەمی مانگانە کە بێتە سەر حسابەکەت، باشترە لەوەی کە پاشەکەوتێکی زۆرت هەبێت؟

کیم: بە دڵنیاییەوە. ئەوە پێی دەڵێن قازانجی مانگانە. هەموو مانگێک پارە خۆی دێتە سەر گیرفانت بێ ئەوەی خۆت ئاگات لێی بێت.
پات: پێویستە مانگی چەندە بێتە سەر حسابەکەت؟
کیم: پرسیارێکی جوانە! تۆ کار بکەیت و کار نەکەیت، پێویستت بە پارەیە، چونکە خەرجییت هەیە. هەرکاتێک ئەو قازانجەی کە مانگانە دەستت کەوت، زیاتر بوو لە خەرجیکانت، ئەوە تۆ گەشتوویت بە سەربەخۆیی دارایی. من بیست ساڵ لەمەوپێش لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کە بگەم بە سەربەخۆیی دارایی چونکە ئەوەم پێ قبووڵ نەدەکرا فەرمانم بەسەردا بکرێت. من دەمهەویست حەزم لە کوێ بوو بچم و دڵم بە چییەوە بوو بیکەم. وە ئەمەش بەوە دەکرا کە بگەم بە سەربەخۆیی دارایی. سەربەخۆی دارایی هەم هەڵبژاردەی زیاترت بۆ دەستەبەر دەکات، هەم ئازادی زیاتر.
یان شتێکی تر، ڕۆژانە من خانمان دەبینم کە درێژە دەدەن بە پەیوەندیەکی ناخۆشی هاوسەرگیری، تەنها لەبەر ئەوەی کە مێردەکەی پارەدارە و دۆخی دارایی باشە. یان قبووڵی کارێک دەکات کە هیچ حەزی لێی نییە چونکە مووچەکەی باشە. لای من ئەو کەسانە، سەلامەتی هەڵدەبژێرن و باوەڕبەخۆ بوون فەرامۆش دەکەن. بەڕای من ئەوە گەورەترین ستەمە لە خۆت دەکەیت. خانمێک ژیانێکی هاوسەرگیری دۆزەخیی هەڵدەبژێرێت لەبەر پارە و لە کۆتاییشدا دەڵێت "پارە گرنگ نییە" پارە چۆن گرنگ نییە؟ هەموومان دەزانین کە پارە کاریگەری لەسەر زۆربەی شتە گرنگەکانی ژیان هەیە. پارە کاریگەری لەسەر ژیانی هەمووان هەیە، بەتایبەت خانمان. پرسیار لە خۆت بکە کە ئەگەر پارەی زیاترت هەبوایە چیت دەکرد؟ لەوانەیە ئەمە هەندێک خانم بکاتە تەڵەکەوە و هەندێک ئازاد بکات. ئەوەیان کەوتۆتەوە سەرخۆت.

هەرسێکیان واقیان وورِ مابوو. وابزانم تەواو سەرنجیانم بۆخۆم ڕاکێشابوو.

**بۆچی پێویستە خانمان ببن بە وەبەرهێنەر؟**

لەم ڕۆژانەی پێشوودا ڕۆژنامەنووسێکی گەنج کە کەمێک ناسراو بوو، هاتە لام و زۆر بە پەرۆشەوە پێی ووتم: دەبێت خانمان هۆشیار بکەینەوە کە چیتر کاتی ئەوە نەماوە پاڵ بدەنەوە و پشت بە کەسانی تر ببەستن و بێ خەم لێی بخەون. دواتر بۆم دەرکەوت بۆ ئەوەندە بە پەرۆش بوو. دایکی لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا جیابووبووەوە و هاتبوو بۆلای کچەکەی. کچەکەی ئێستا مەسرەفی دەکێشێت و لای خۆی داینـاوە. جا ئەو دۆخەی دایکی ئەمی ڕاچڵەکاندبوو و هاتبووەوە هۆش خۆی کە دەبێت ئەمیش کار بکات. بیری کردبووەوە چی دەبێت ئەگەر مووچەکەی خۆی ببڕن؟ تەنها ٧٠٠ دۆلار پاشەکەوتی هەیە و هیچی تر. بۆیە ئەویش کەتبووە خۆی کە بیر لە سەرچاوەیەکی تر بکاتەوە.

جا هەروەکو لە پێشەکی کتێبەکەدا باسی "چۆن"مان کرد، بۆ نموونە چۆن وەبەرهێنان بکەم لە کڕین و فرۆشتنی بازاڕی ئاڵوگۆڕ، یان چۆن موڵکەکانم بەڕێوەببەم، یان چۆن پرۆژەکانم بەرەو پێش بەرم. هەموو ئەمانە بۆ خانمان و بۆ پیاوانیش هەمان شتە. هەرچەندە هۆکاری گرنگی وەبەرهێنان کردن بۆ خانمان زۆر جیاوازە لە هۆکاری وەبەرهێنان کردن بۆ پیاوان.

هەموومان دەزانین ئەو ژیانەی دایک و باوکمان بەڕێیان کرد و ژیان، هیچ بۆ سەردەمی ئێمە دەست نادات و ناگونجێت. لە خوارەوە باس لە شەش هۆکاری گرنگ دەکەم کە بۆچی گرنگە خانمان بێنە ناو بواری وەبەرهێنانەوە:

ئامارەکان: ئامارەکانی تایبەت بە خانمان لە بواری داراییدا، زۆر ڕاچڵەکێنەرە، هەرچەندە ئەو ئامارانەی بەردەست من کەوتن تایبەتن بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵام دڵنیام لە وڵاتانی تر ئەگەر خراپتر نەبێت باشتر نییە.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکان:

٪٤٧ ئەو خانمانەی لە سەروو پەنجا ساڵەوەن، سەڵتن، واتە تەنها خۆیان بەرپرسن لە بەڕێوەبردی ژیانیان و دەبێت تەنهاپشت بە خۆیان ببەستن.

موچەی خانەنیشینی خانمان کەمترە لە موچەی خانەنیشینی پیاوان، چونکە ساڵانی خزمەتی خانمان کەمترە بەهۆی ئەرکی ماڵەوە.

٪٥٠ هاوسەرگیرییەکان بە جیابوونەوە کۆتای دێت، وە دایکەکەش منداڵەکان دەگرێتە ئەستۆ، هەرچەندە لە بنەڕەتدا هۆکاری سەرەکی جیابوونەوەکە پارە و دارایی بووە.

لە دوای جیابوونەوە، ٪٧٣ خانمان، شێوازی ژیانیان بەرەو خراپیی دەڕوات.

بە پێی توێژینەوەکان، خانمان بە نزیکەی دە ساڵ زیاتر لە پیاوان دەژین، بۆ ئەمەش پێویستیان بە داهاتێکی زیاترە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو خانمانەی لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٨ بۆ ١٩٦٤ لە دایکبوون، بەردەوام دەبن لەسەر کارەکانیان تا تەمەنی ٧٤ ساڵی، چونکە موچەکەیان بەشی بژێوی ژیانیان ناکات.

بەشێوەیەکی گشتی کەمرۆڤەکان دەچنە تەمەنەوە ڕووبەڕووی هەژاری دەبنەوە، ٤/٣ یان خانمانن.

٪٨٠ خانمان پاش ئەوەی هاوسەرەکانیان کۆچ بکات توشی هەژاری و کەم دەرامەتی دەبنەوە.

لەم ئامارانەوە بۆمان دەرئەکەوێت، زۆرینەی خانمان کە دەچنە تەمەنەوە لەژێر هێڵی هەژاریەوە ژیان دەکەن بەهۆی نەبوونی پەروەردەیەکی دارایی بەهێز و پشت بەستنیان بە پیاوان و حکومەت لە سەرەتاکانی تەمەنیان و خەریک بوون بە ماڵ و منداڵ و خەمێک لە داهاتووی خۆیان ناخۆن، هەمیشە بێ خەمن، تا کاتێک دەزانن کار لە کار ترازاوە و دەسەڵاتی هیچیان نییە.

**پشت بەکەس مەبەستە**

بۆ ئەوە هاوسەرگیری ناکەیت تا جیابیتەوە، بۆ ئەوە دەست ناکەیت بە کارێک تا شکست بهێنیت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەندێک جار جیابوونەوە و شکستیش ڕوودەدات. بۆیە وەک هەمیشە دەیڵێمەوە، ئەگەر تا ئەم دەقەیە پشتت بە هاوسەرەکەت یان موچەی خانەنشینی حکومەت بەستووە بۆ ئەوەی بتژیەنێت، ئەوە جارێکی تر بیربکەرەوە، چونکە لەوانەیە ڕۆژێک بێت کەس نەبێت بەخێوت بکات. زۆربەی کات کەسمان هەست ناکەین کە پستبەستووی حکومەت و خیزانەکانمانین، هەتا ئەکەوینە کێشیەکەوە و لەو خەوە خەبەرمان دەبێتەوە.

لە خوارەوە چیرۆکی خۆم و ڕۆبێرتتان بۆ باس دەکەم. من و ڕۆبێرت هەر لە یەکەم مانگی پەیوەندیەکەمانەوە هاوبەشی کاری یەکترین. توانیومانە چەندەها پرۆژە بخەینە سەر پێی خۆی لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا.

ماوەی شەش ساڵ بوو کۆمپانیایەکی پەروەردەیی تایبەت بە زەنگین بوونمان دانابوو. کۆمپانیاکەش لە شەش ولات لقی هەبوو، ئوستراليا، نیوزلەندا، هۆنگ کۆنگ، سەنگافورە، مالیزیا و کەنەدا. من و ڕۆبێرت کۆمپانیەکەمان بەڕێوەدەبرد کارمان تێدا دەکرد.

ڕۆژێکیان من و ڕۆبێرت بوو بە دەنگەدەنگمان بەهۆی ئەوەی لەسەر بابەتێک هاوڕا نەبووین، لە دوای ئەوە من زۆر تووڕەبووم و بە تووڕەییەوە ڕۆشتم بۆ شاخەکەی نزیک ماڵی خۆمان، لەوێ هەر سەرقاڵی بیرکردنەوە بووم و بیرم لە ڕووداوەکە دەکردەوە.

بیرم لەوە دەکردەوە من بەخۆم دەڵێم و سەربەخۆمم چونکە هەر لە قۆناغی ناوەندییەوە خەریکی ئیش و کارکردن، بەڵام ئێستا ئەوەتا لەگەڵ ڕۆبێرت بووە بە ناخۆشیمان و منیش خاوەنی هیچ نیم، چونکە ڕۆبێر خاوەن کۆمپانیەکەیە و کۆمپانیاکە بە ناوی ڕۆبێرتەوەیە. بیرم کردەوە کەواتە من سەربەخۆ نیم، چی ئەبێت ئەگەر من و ڕۆبێرت جیابینەوە؟ وە ئەگەر جیاش نەبینەوە من ناتوانم بەو شێوەیەی ئەو دەیەوێت کاری لەگەڵ بکەم.

هەرکامیانم هەڵبژاردایە ڕاستیەکی تاڵ بوو، نەمدەتوانی خۆمی لێ ڕزگار بکەم. ئەگەر ئەو شەڕە نەبوایە ئەوا هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە من تا ئەو دەقەیە پشتم بە ڕۆبێرت بەستووە. خۆشم نەمدەتوانی بڕوا بەوە بکەم، هەرچەندە دڵنیابووم ڕۆبێرت هەرگیز وابیرناکاتەوە، بەڵام من دووربینتر بیرم دەکردەوە. ئەو شەڕە وەک زللەیەک وابوو بەخەبەری هێنام.

دوای ئەوە من و ڕۆبێرت زیاتر لەسەر ئەو کێشەیە قسەمان کرد وهەردووکمان دەمانویست بە درێژای ژیانمان پێکەوە کار بکەین. بەڵام ئەو ڕووداوە کاریگەری لەسەر من هەبوو، لەدوای ئەوە چەند موڵکێکم کڕی بۆئەوەی وەک حەز و خولیایەک ئیشی لەسەر بکەم. لەدوای ئەو کاتە بۆم دەرکەوت کە وەبەرهێنان کردن بۆ حەز و خولیا و چێژلێوەرگرتن نییە، بەڵکو پیویستیەکی گرنگی ژیانمانە.

دوای ئەوەی چەند وەبەرهێنانێکم کرد و قازانجم لێدەکرد، بۆم دەرکەوت چیتر پشت بە ڕۆبێرت نابەستم و سەربەخۆم. بەڵام دەمویست لەگەڵ ئەو درێژە بەژیان بدەم وەک دوو هاوسەر نەک لەبەر ئەوەی پشتی پێبەستم. لەدوای ئەوەوە پەیوەندیەکەمان مانایەکی تری هەبوو، ئێمە پێکەوە بوون چونکە دەمانویست پێکەوە بین، نەک لەبەر ئەوەی پێویستمان بەیەکە.

وە سودێکی تری ئەوەبوو، هەستی متمانەبەخۆبوونم زیادی کرد، وە ڕۆژبەڕۆژ خۆشەویستی و ڕێزی نێوانمان زیاتر دەبوو.

**نێر و مێ جیاوازیان نییە**

یەکێکی تر لەو بەربەستانەی یەتە بەردەم خانمان لە کاتی دەستکردن بە وەبەرهێنان کردن، ئەوەیە لە کۆنەوە وا باو بووە خانمان ناتوانن لە ئیش و کارەکانیان ئاستێکی با پێشکەش بکەن. بەڵام من دڵنیاتان دەکەمەوە لە وەبەرهێنانکردندا ئەمە بوونی نییە. کوڕی یان کچ، ڕەشیت یان سپی، دەرچووی زانکۆی یان نەخوێنەوار ئەمانە گرنگ نین، ئەوەی گرنگە زیرەکی و لیهاتوویی خۆت و ئەزموون و زانیاریە. تازیرەکانەتر مامەڵەبکەیت لەگەڵ کارەکەدا، ئەوە قازانجی زیاترت دەستدەکەوێت.

**قازانجی بێ ئەندازە**

لە کۆنەوە وا باوو بووە کە خانمان توانایان کەمترە و داهاتیان سنووردارترە. وتوویانە ئەگەر خانمێک و پیاوێک بهێنین هەمان بڕوانامە و شارەزاییان هەبێت، ئەوە تا خانمەکە ڕوبعێک پەیدا دەکات، پیاوەکە دوو دیناری پەیدا کردووە. بەڵام لە وەبەرهێناندا ئەمانە نییە، هەمووی کەوتۆتە سەر خۆت داهاتت چەند دەبێت، بێ ئەندازە یان سنووردار؟

## زیادبوونی هەستی متمانە بەخۆبوون

بە بڕوای من یەکێک لە سوودەکانی وەبەرهێنان کردن زیادبوونی هەستی متمانە بەخۆبوونە. لات سەیر نەبێت ئەگەر متمانەبەخۆبوونی خانمێک بەسترابێتەوە بە توانای کارکردنی. بەلام پشت بەستن بە کەسانی دیکە، متمانەبەخۆبوون کەمدەکات.

نموونەی زیندووم لایە، خانم ئەناسم کاتێک دەستی کردووە بە ئیش و وەبەرهێنان، هەستی متمانەبەخۆبوونی دەهێندە بووە. وە کاتێک متمانەبەخۆبوونمان زیادی کرد، پەیوەندیەکانمان لەگەڵ دەوربەرمان باشتر دەبێت، چونکە هەست بە باشی و دڵخۆشی دەکەین. هەر سەرکەوتنێک کە بەدەستی دەهێنین، ڕێژەی متمانە بەخۆبوونمان چەند هێندە دەکات، وە ئاسوودەتر دەبین.

## کۆنترۆڵکردنی کات

یەکێکی تر لەو کۆسپانەی خانمان دێتە بەردەمیان، نەبوونی کاتە، پیاوان کەمتر توشی ئەم کیشەیە دەبنەوە.بەتایبەت ئەو خانمانەی دایکن و ئەرکی ماڵ و منداڵ بەخێوکردنیان لەسەرە. کاتێک لە سەر کارەکانیان دەگەڕێنەوە، دەبێت خەمی ئامادەکردنی نانی ئێوارەیان بێت، پاشان یارمەتی منداڵەکان بدەن لە ئەنجامدانی ئەرکی قوتابخانە، پاشان ماڵ پاککردەوە، دەبیت چاوەڕێ بکەن تا منداڵەکان دەنوون، ئەگەر بیانەوێت کاتی بەتاڵیان هەبێت، کاتێکیش کە منداڵەکان دەنوون، هیچ ووزەی پێنامێنێت.

بەڵام وەبەرهێنەر دەبێت کۆنترۆڵی کاتەکانی بکات و پلانی هەبێت، دەتوانیت پرۆژە و کارەکانت لە ماڵەوە، یان ئۆفیس بەریوەبەریت، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە دەبێت کاتی بۆ تەرخان بکەیت.

وەبەرهێـان بـوارێکە تەنـانەت دەتوانیـت منداڵەکەشـت بەشـداری پێبکەیـت. هەنـدێک لە دایکـان منداڵەکانیشـیان بەشـداری پێدەکان و ئەرکیـان پێدەسـپێرن. لە هەمـووی گرنگتـر بەشـداری پێکردنـی منداڵەکەت واتە ڕۆشنبیرکردنی دارایی منداڵەکەت، واتە بۆ داهاتوو ئامادەیان دەکەیت و دەبێت بە مامۆستای دارایی منداڵەکەت، وەک باوکی زەنگین.

مـن خـۆم منـداڵم نیـیە، بەڵام لەو هەسـتە تێـدەگەم کە دایکـان هەیانە. دایکان دەیانەوێت زۆرترین کات لەگەڵ منداڵەکانیان بن و ئاگایان لە گەورەبوونی منداڵەکانیان بێت. بوون بە وەبەرهێنەر ئەو هەلەت دەخاتەبەردەست، کاتـت دەبێـت نەک تەنهـا بـۆ منـداڵەکانت، بەڵکو بۆ هاوژین و دەستگیران و خێزانەکەشت. واتە کۆنترۆڵی کاتی خۆت، لە دەستی خۆتدایە.

# بەشی شەشەم
# کاتم نییە

من مامۆستایەکم، بەدیار کۆمەڵێک وەرەقەی تاقیکردنەوەوە واقم وڕماوە و دووعا دەکەم کە، خۆیان سەح بکەن

پات لەپێش هەموویانەوە ووتی: قسەکانت وەک ئەوە وایە لە خەوێک من ڕبچڵەکێنن. ئێستا هەستی پێ دەکەم کە من چەند وەختە پشتم بە هاوسەرەکەم بەستووە و قەت ویژدانم ئاسوودە نەبووە بەبێ ئەو بڕیارێک بدەم یان شتێک خەرج بکەم. چونکە لە ڕاستیا ئەو سەرچاوەی داهات و ئەو پەیدای دەکات ڕۆژ تا ئێوارە. دەغیلەیەکی بچووکم هەیە و جار جار شتێکی لێ خەرج دەکەم، ئەوەی لێ دەرچێ هەرگیز دەست بۆ دینارێک نابەم.

جارێک هاوڕێیەکم بینی بار ودۆخی زۆر خراپ بوو. دوای ٢٢ ساڵ، لە هاوسەرەکەی جیا بووبووەوە و بێ پارە و پوول مایەوە. تەنها مانگانە شتێک پارەی لە مێردەکەیەوە بۆ دەهات بۆ خەرجی منداڵەکان. لە هەمووشی خراپتر ئەوە بوو کە ١٨ ساڵ بوو ئیشی نەکردبوو. ئێستا دەست و پێ سپییە و نازانێت لە کوێ وە دەست پێ بکات.

جانیس کەمێک دەموچاوی تێکچووبوو و خۆی پێ نەگیرا: باشە شتێک، من ئەوەتا کاری خۆمم هەیە و نیازم وایە بەردەوام بم تێیدا و کارەکەیخۆم زۆر خۆشئەوێ و پارەیەکی باشم لێی دەست ئەکەوێت. وە لە داهاتوودا دەتوانم بە قازانجێکی خەیاڵی بیفرۆشمەوە. ئێستا بۆ دەبێت وەبەرهێنان بکەم؟

ووتم: پلانەکەت زۆر باشە، بەڵام ئەوەی من لام گرنگە ئەوەیە کە چەند بژاردەیەکت هەبێت، نەک تەنها یەک بژاردە. ئێستا ئەگەر پلانەکەت وەک خۆی ڕۆیشت ئەوە شتێکی باشە. بەڵام دەبێت بیر

لەوە بکەیتەوە کە لە حاڵەتی نەخوازراودا چی دەکەیت؟ ئێستا بۆ نموونە کۆمپانیای (باوکی زەنگین) لەسەرەتاوە کاتێک دامانناا، ئێمە گەیشتبووین بە سەربەخۆیی دارایی. واتە کاتێک بوو کە خەیاڵی سەرەکیمان لەسەر ئەوە نەبوو کە چەندە قازانج دەکەین. هەمان شت بۆ (شارۆن)ی هاوبەشمان. ئەویش خەیاڵی لای ئەوەیە کە چی بکەین بۆ ئەوەی داهاتی کۆمپانیاکە زیاد بکەین و باش بڕوات بەڕێوە. هەر ئەمە وای لێ کردین کە چەند بژاردەیەکمان هەبێت بۆ سەرکەوتن.

با نموونەیەکت بۆ باس بکەم ڕێک تێدەگەیت: هاوڕێیەکم هەیە بە ناوی کارۆڵ. کارۆڵ پزیشکی ددانە و ئیشەکەی باشە و کارەکەی خۆی زۆر خۆش دەوێت. دووربێ لێتان، لەم ماوەیەی پێشوودا کارۆڵ تووشی شێرپەنجەی مەمک بوو! سوپاس بۆ خوا زوو پێی زانی و چارەسەری کرد. دواتر پەیوەندی پێوەکردم و ووتی: ئەزانی ئەو نەخۆشیە خێری تێدا بوو و زەنگێکی ئاگادارکەرەوە بوو بۆ من. بیرم لەوە دەکردەوە باشە ئەگەر من نەتوانم کار بکەم، وردە وردە هەموو پاشەکەوتەکەم دەخورێت و دوای ئەوە چی بکەم؟ خۆ ناتوانم چیتر کار بکەم. واز لەوە بێنە کە نەخۆش بووم، قوڕم بۆ دەگیرایەوە کاتێک بێ ئیش و بێ سەرچاوەی داهات دەبوومەوە.

دوای ئەوە کارۆڵ چاوی کرایەوە و ئێشتا خاوەنی چەندین موڵکە و مانگانە کرێکانی وەردەگرێت و ئیشەکەی خۆشی هەر بەردەوامە و ئەگەر دووربێ جارێکی تر نەخۆش بکەوێت، خەمی ئەوەی نییە کە ناتوانێ پارە پەیدا بکات. بۆیە منیش دووپاتی دەکەمەوە کە پشت بە یەک سەرچاوە مەبەستە، با هەمیشە چەندین بژاردەت هەبێت.

جانیس سەری بۆ لەقاندم و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا.

بەربڵاوترین بیانووی خانمان

ووتم: جانیس تۆ لە سەرەتای دانیشتنەکەدا پرسیارێکی جوانت ورووژاند، کە هەمووکەس پێویستە لە سەرەتای کاریدا ئەو پرسیارە بکات.

جانیس ووتی: پرسیاری چی؟ وەڵا بیرم نایەت!

ووتم: پرسیارێکت کرد، کە ئەگەر ڕاستگۆیانە وەڵامی نەدەیتەوە، بە تەمەنت تامی سەرکەوتن ناکەیت. من ئەمرۆ لێرە نیم تا هەمووتان بکەم بە وەبەرهێنەر، هەرچەندە ئەگەر ببن ئەوە شت لەوە باشتر نابێت. ئێمە ئەمرۆ لێرەین تا پێکەوە کاتێکی خۆش بەسەرببەین و باسێک لە ڕۆژە خۆشەکان بکەین و نانێک پێکەوە بخۆین.

پرسیارەکە چییە؟

جانیس قسەکانی پێ بڕیم و ووتی: بوەستە بوەستە، پەلە مەکە. وتت پرسیارێکی گرنگم کرد؟ پرسیارەکەم چی بوو؟

سەیرێکی لێسلی و پاتم کرد و ووتم: ئەرێ کچینە ئێوە ڕازین باسی ئەمە بکەین؟ ئەگەر حەزتان لە بابەتەکە نییە زۆر ئاساییە من و جانیس دواتر باسی دەکەین پێکەوە.

لێسلی ووتی: نا نا شتی وا نییە، منیش زۆرم پێ خۆشە گوێم لە وەڵامەکەی بێت، چونکە منیش دەمێکە وێڵم بەدوایدا.

پات ووتی: هەرچەندە لەوانەیە بەشێکی بابەتەکە دژی من بێت، بەڵام سەرنجی منیشتنا ڕاکێشا بەلای بابەتەکەدا. بەردەوام بن.

کیم: باشە، پێش ئەوەی پرسیارەکەی جانیس وەڵام بدەینەوە، با من پرسیارێکتان لێ بکەم بزانم ئێوە دەڵێن چی؟ ئەگەر بڵێم کچینە

بە هەفتەی سێ ڕۆژ بڕۆین بۆ قاعەی ئاسن و گرنگی بدەین بە لەش و لارمان، ئێوە دەڵێن چی؟
جانیس: من زۆر سەرقاڵم، ناتوانم کارەکەم بەجێ بهێڵم.
لیسلی: منیش ناتوانم کارەکەم بەجێبهێڵم بۆ سێ ڕۆژ. سێ ڕۆژ زۆر زۆرە.
پات: ئەگەر کاتم هەبوایە بێگومان دەهاتم، چونکە لەش و لارم زۆر تێک چووە.
کیم: کات؟ کەواتە هەمووتان کێشەی کاتتان هەیە، وایە؟
ووتیان بەڵێ:
ووتم: هەموومان سەرقاڵین و کاتمان نییە. تەنانەت ئەگەر شتەکە باشیش بێت و سوودی هەبێت هەر ناتوانین. کەواتە کات پێویستیەکی سەرەکیمانە.
لیسلی: ئێ ئێستا ئەتەوێ بڵێیت چی؟
کیم: زۆربەی جار ئێمە (بیانوو) دەهێنینەوە، بەڵام بە (هۆکار) دایدەپۆشین. ئەگەر خۆمان نەمانەوێت، هەزار و یەک بیانوو دەهێنینەوە. ئێمە دەڵێین "تاقەتمان نییە ئەو کارە بکەین" بەڵام لە ڕاستیدا کێشەکە ئەوەیە کە خۆمان نامانەوێت ئەو کارە بکەین و بیانوو دەهێنینەوە.
لیسلی: ئاخر کاتم نییە!
کیم: لەگەڵتام. زۆربەمان خشتەی ڕۆژانەمان هێندە ئاڵۆزە، لەخوامان ئەوێت هیچ ئیشێکی تری بۆ زیاد نەکرێت و هیچی تر نەیەتە ناوی. جاری وایە دەڵێین خۆزگە شەو ڕۆژ ٢٤ کاتژمێر زیاتر بوایە. هەست دەکەین ئەو کاتە بەشی هیچ ناکات. بەڵام ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە کە کاتێک دەڵێین "کاتمان نییە" تەنها قسەیەکە و دەیکەین. ئەگینا لە ڕاستیا ئێمە کات دەدۆزینەوە بۆ ئەو

شتانەی کە بۆمان گرنگە. کاتێک دەڵێین "کاتمان نییە" زیاتر وەک وەڵامێکی ئۆتۆماتیکی وایە بۆ ئەو شتەی کە ناتەوێ بێتە ناو ژیانتەوە و ناتەوێ هیچی تر بۆ خشتەی کارەکانت زیاد بکەی.
جانیس: باشە ئەی ئەگەر هەر بە ڕاستی لە ئیش و کاردا تا بینەقاقات هاتبێت و هیلاک بیت و هیچ کاتت نەبێت، ئەوکاتە چی؟
کیم: پرسیارێکی جوانە!
جانیس بە پێکەنینەوە: پرسیارەکانم بەدڵە، بەڵام وەڵامەکان نا.
کیم: وەڵامێکی جوانە بۆ دەستپێکی ئەو پرسیارەی کە کردت. بیانووی یەکەم بۆ ئەوەی وەبەرهێنانە نەکەین، هەمیشە ئەوەیە کە دەڵێین کاتمان نییە. وەک تۆ باست کرد، ئەگەر کاتت نیە، چۆن کاتت هەیە بۆ خێزان و چوونەدەرەوە و گەڕان و کارەکانی تر؟ ئێمە ناتوانین کاتژمێرێکی تر زیاد بکەین. کەواتە ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەیە ئەوەیە کە دەبێت بڵێین: کات بدۆزەرەوە.
ئەو پرسیارە گرنگەی کە کردت ئەوە بوو کە ووتت: بۆچی پێویستم بە وەبەرهێنانە؟
لێسلی بە سەرسوورمانەوە ووتی: بۆ ئەو پرسیارە هێندە گرنگە؟

**هۆکاری تۆ چییە بۆ وەبەرهێنان؟**

کیم: زۆربەی خەڵکی پێی وایە کە یەکەمین هەنگاوی دەستکردن بە وەبەرهێنان، وەڵامدانەوەی پرسیاری "چۆن" و "بۆچی"ە. کاتێک باسی وەبەرهێنان دەکەیت، خەڵک یەکسەر دەڵێ "چۆن فلان ئیش بکەم؟ چۆن ئەو کەسە بناسم؟ چۆن ئیشێکی باش بدۆزمەوە؟" وەڵامدانەوەی "چۆن"ەکان قورس نین. تەنها پێویستمان بە هەندێک کات و شارەزایی هەیە بۆ وەڵامدانەوەیان. بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە وەڵامی "بۆچی" بدۆزیتەوە. بۆچی وەبەرهێنان

دەکەیت؟ بۆچی ئەو کارە قورسە دەکەیت؟ چی وات لێ دەکات ئەو ئەرکە قورسە بخەیتە سەرشانی خۆت؟

لێسلی: من بۆیە دەمەوێت ببم بە وەبەرهێنەر، بۆ ئەوەی پێویست نەکات هەموو ڕۆژێک بڕۆمە سەر کار.

کیم: باشە پەیدا کردنی پارەیەکی زۆر و نەچوون بۆسەر کار، وات لێ دەکات کە خەریکی کتێب خوێندنەوە و زانیاری کۆکردنەوە و چوون بۆ سیمینار و گەڕان بەدوای شارەزایی و چاوپێکەوتن بیت؟

لێسلی: ئاهـ ماڵت ئاوا بێ هەر بە بیرلێکردنەوەیان هیلاک بووم. ئەو هەموو ئیشە چییە؟

کیم: کەواتە هۆکارەکەت بەهێز نەبوو. ئەگەر لەپێناو زەنگین بووندا ئامادە نەبیت ئەو شتانە بکەیت کە بۆم باس کردی، کەواتە حەزەکەت بەهێز نییە و ناتەوێ زەنگین بیت.

پات: کەواتە ئەو هۆکارە گەورەیە چیە کە وات لێ دەکات دەست بکەیت بە کاری وەبەرهێنان؟

کیم: بیرتانە دەقەیەک پێش ئێستا پێم وتن دەتوانن هەفتەی سێ ڕۆژی تەواو، بەیانی تا ئێوارە، بڕۆن بۆ وەرزش کردن؟ ووتیان بەڵێ. ووتم لە ڕاستیا ئێوە هیچ هۆکارێکتان نەبوو بۆ ئەوەی هەفتەی سێ ڕۆژ بڕۆن بۆ وەرزش کردن، بۆیە نەڕۆیشتن. بەڵام ئەگەر تۆ بڕۆیت بۆلای دکتۆرێک و پێت بڵێ کە نەخۆشیەکی دەگمەنت هەیە و دەبێت هەفتەی سێ ڕۆژ بڕۆیت بۆ وەرزش کردن، ئێستا هۆکارێکت هەیە کە بڕۆیت.

هەرسێ خانمەکە حەپەسابوون.

جانیس ووتی: ڕێک وایە. ئێستا هەمووشتێک دەکەم بۆ ئەوەی هەفتەی سێ ڕۆژ بڕۆم بۆ تەمرین.

کیم: ئۆخەی شکور لێم تێگەیشتن. لە ئێستادا وەرزش کردن گرنگ نییە بۆتان چونکە پاڵنەرێکی گرنگتان نییە بۆ وەرزش کردن. بەڵام ئەوکاتەی پاڵنەرێکی گرنگ دەدۆزنەوە، دەبێتە گرنگترین کارتان. جا لەبەر ئەوەیە کە دەڵێم پاڵنەر و هۆکارێکی گەورە بدۆزنەوە بۆ ئەوەی واتان لێ بکات وەبەرهێنان بکەن.

پات: واتە ئەگەر هۆکارێک نەدۆزینەوە، نابێت بە شتێکی گرنگ و کاری بۆ ناکەین.

کیم: کێشەکە ئەوەیە کە ئەگەر هۆکارێکمان نەبێت، لەوانەیە لە کاتی بوونی کێشە و بەرز و نزمیەکاندا واز بهێنیت و کۆڵ بدەیت. چەند جار ڕێککەوتووە کە بە دڵ وبە گیان دەستمان کردووە بە کارێک، بەڵام لە نیوەیا تاقەتمان نەماوە و وازمان هێناوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە دەبێت هۆکارێک بدۆزیتەوە، وات لێ بکات بەردەوام بیت.

ئەگەر تۆ پاڵنەرەکەت تەنها ئەوە بێت کە زەنگین بیت، یان پارەت دەستبکەوێت. ئەوا بەردەوام نابیت. یان هەرکاتێ ئامانجەکەت بەدەست هێنا واز دەهێنیت. نا، دەبێ پاڵنەرەکەت هێندە مەزن بێ، هەرکاتێک بیرت کەوتەوە، لە جاران باشتر هەوڵ بدەیت.

**چەند هۆکارێک بۆ دەستپێکردن**

کیم: لەم ڕۆژانەدا گوێم لە کابرایەک بوو ناوی پیتەر بوو. پیتەر هۆکارێکی زۆر جوانی هەبوو بۆ زەنگین بوون. پیتەر ووتی: من باوکی کوڕێکی حەوتساڵانم و ئەندازیارم. هەموو ڕۆژێک پێش هەڵسانی کوڕەکەم من دەڕۆمە سەر کار و شەوان کە دێمەوە، کوڕەکەم خەوتووە. هەمیشە باوکی کوڕێکی تر دێت بەدوای کوڕەکەمدا بۆ خوێندنگە.

پیتەر ووتی: هەموو کارێکم بۆ ئەوە بوو کە ئۆتۆمبێلێک بکڕم و خەمی کارم نەبێت و بەیانیان من خۆم کوڕەکەم ببەم بۆ

خوێندنگە. ووتی هێندە کارم کرد تا گەیشتم بەوەی داهاتی خۆمم دەستکەوت و ئێستا کە بەیانیان لەو ترافیکلاّیتە قەرەبەڵغانەی لۆس ئەنجلسدا دەوەستم، من تاکە کەسم کە زەردەخەنە لەسەر لێومە، چونکە خۆم کوڕەکەم ئەگەیەنمە قوتابخانە.

لێسلی ووتی: ئەزانی بەو قسەیەی تۆدا دراوسێییەکی خۆمانم بیرکەوتەوە. هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ بەخێوکردنی منداڵەکانی. دەڵێت کاتی خۆی بەخێوکەرەکانی من هیچ گرنگیان بە من نەداوە و هەر لە خواییەوە گەورە بووم. ئێستا من نامەوێت وەک منداڵیی خۆم، منداڵەکانم گەورە ببن. بەڵام کێشەکەی ئەوەیە کە ئەو کار دەکات و دەبێت بژێوی ژیانی منداڵەکانی پەیدا بکات، هەندێک کات تا درەنگانی شەو کار دەکات. ئێستا کاتی خۆیەتی ئەم خانمە دەست بکات بە وەبەرهێنان و کاری خۆی، بەڵام نازانێت دەبێت لە کوێوە دەست پێ بکات.

پات ووتی: با باسی خوشکەکەمتان بۆ بکەم. خوشکەکەم لە منداڵییەوە هیوایەتی ئەوەیە کە زانیاری کۆ بکاتەوە لەسەر وڵاتانی دیکە. هەمیشە دەخوێنێتەوە لەسەریان و کاتێک ناوی وولاّتێکی گوێ لێ دەبێت، دەڕوات و زانیاری لەسەر کۆ دەکاتەوە. ئاواتی منداڵیەتی کە سەردانی وڵاتانی دیکە بکات و لە نزیکەوە بیانبینێت. ئێستا ئەو هۆکارێکی بەهێزی هەیە کە دەست پێ بکات. دڵنیام لێرە بوایە زۆر حەزی بەم دەمەتەقێیە دەبوو.

کیم: بە دڵنیاییەوە هەموومان هۆکارمان هەیە ئەگەر یەک تۆز بیر بکەینەوە. بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە کەسمان تاقەتی بیرکردنەوەمان نییە و نامانەوێت ئەو هۆکارە بدۆزینەوە. تا زۆرمان بۆ نەیەت و ڕووداوێکی ناخۆش خەبەرمان نەکاتەوە.

جانیس: مەبەستت چییە لەوەی کە شتێک خەبەرمان بکاتەوە؟

کیم: نموونەی دکتۆرەکەی هاوڕێمتان بیرە؟ دکتۆری دانەکە دەڵێم. ئەو کاتێک تووشی شێرپەنجەی مەمک بوو، دوو جار خەبەری بووەوە. یەکەم تێگەیشت کە شێرپەنجە چییە و هۆکارەکانی چین و دەبێت چی بکات بۆ ئەوەی تووش نەبێت و چ خواردنێک بخوات و چۆن ئاگای لە خۆی بێت. دووەم تێگەیشت کە کارکردن بە تەنها پڕمەترسییە و دەبێت سەرچاوەی داهاتی دیکە بدۆزێتەوە و ئەگەر خوا نەخواستە تووشی دۆخێکی وا بووەوە، کیسەی پارە و داهاتی نەبێت.

جانیس: زۆر ڕاستە، زۆربەمان لەبەر ئیش ئاگامان لە تەندرووستی خۆمان نییە.

کیم: من خۆم چەندین جار زەنگی مۆبایلەکە لێی داوە کە هەڵسم بۆ وەزش کردن، بەڵام خەوتوومەوە. وەبەرهێنانیش هەمان شتە، دەبێت هۆکارێکی گەورەت هەبێت. کاتێک ئەو هۆکارەت دۆزییەوە، بیانووی "کاتم نییە" ئۆتۆماتیکی خۆی نامێنێت.

لێسلی: زۆر ڕاستە. ٢٠ ساڵ لەمەوپێش هەموو خەیاڵ و ووزەیەکمان تەرخان کردبوو بۆ کار کردن. لە کاتێکدا دەمانتوانی بە سەیران و گەڕان بیبەینە سەر. بەڵام چونکە کارکردنمان بەلاوە گرنگ بوو، ئەوەمان هەڵبژارد. دەکرا چێژ لە ژیان وەربگرین، بەڵام هەمووومان وەلانا و کارمان دەکرد. ئای ژیان چی لێ بەسەرهێناوین.

جانیس بە گاڵتەوە ووتی: تۆ سەیری ئەو هەموو فەلسەفەیە. بەڵام وەڵا بە جددی بابەتێکی گرنگە. من ئێستا بۆم دەردەکەوێت کە تەنها یەک بژاردەم بۆ ژیانی خۆم دیاری کردووە. واتە داهاتووم سنووردار کردووە. خۆ خوا نەخواستە ئەگەر شتەکان وەک خۆیان نەڕۆن لە کارەکەمدا، ئەوا مایەپووچ دەبم و دەکەومە سواڵ کردن. ئێستا حەزم لەوەیە کە مانگانە پارە بێتە سەر حسابەکەم و خۆم

کار نەکەم. کیم هەندێ زانیارم بدەرێ لەسەر ئەوە، من فرم پێوەی نییە. خۆم هەوڵ ئەدەم "بۆچی"ەکەی خۆم بدۆزمەوە و سەربەخۆیی دارایی بەدەست بهێنم. دەمەوێت جگە لەو کارەی ئێستام پارەی ترم دەستبکەوێت و نەجاتم بێت لەم ڕاکەڕاکەیە.
پات: ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە من تا ئێستا بۆ هیچ شتێکی ژیانم پرسیاری "بۆچی"م لە خۆم نەکردووە. ئەگەر شتێک پێویست بووبێت بیکە، کردوومە و تەواو. قەت لە خۆمم نەپرسیوە کە بۆچی من ئەوە دەکەم. هیوادارم ئەم گفت و گۆیە هاندەرم بێت کە لەمەولا باشتر ژیانم کۆنترۆڵ بکەم.
لیسلی بە دەنگی بەرز ووتی: باشە کێ ئەم بابەتەی کردەوە؟ لە نان خواردنی نیوەڕۆوە بابەتەکە ڕۆیشت بۆ ئەوەی کە ژیانمان بگۆڕین. هەموومان بێدەنگ بووین. پاشان لیسلی ووتی: کێشە نییە، من سوپاسی ئەو کەسە دەکەم کە ئەم بابەتەی کردەوە. ئەوەی کە دەبوو بیبیستم، بیستم.

دوای نان خواردن، هەموومان ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە بەردەوام بین لەم کۆبوونەوانە و لەمەولا هەوڵ بدەین جانیس و مارساش بهێنینە ناو بازنەکەوە. جارێکی تر هەموومان سوپاسی (پات)مان کرد کە ئاوا هەموومانی کۆکردەوە و پاشان بەڕێکەوتینە دەرەوە و ویستمان تەکسی بگرین و بڕۆین بەلای ئیشمانەوە. هەر کە یەکەم تەکسی هات، جانیس هاواری کرد ووتی: من زۆر دواکەوتووم، دەبوو پێش نیوکاتژمێر لە جێگەیەک بوومایە. من ئەم تەکسیە دەگرم. خۆی هەڵدایە ناو تەکسیەکەوە و ووتی: ڕۆژێکی خۆش بووووو. ئێمەش سەیری یەکترمان کرد و ووتمان: هەندێک کەس هەیە هەرگیز ناگۆڕێن

چۆن وەڵامی "بۆچی" خۆت دەدەیتەوە؟

بڕۆ ژوورێکی بێدەنگەوە کە هیچ شتێک بیرکردنەوەت نەپچڕێنێت. بڕۆ ناخی خۆتەوە و خۆت بدوێنە. کاتی باش بۆ ئەم پرۆسەیە دابنێ و پەلەی لێ مەکە. پرسیار لە خۆت بکە و وەڵامی "بۆچی" بدەرەوە. لەوانەیە یەکسەر وەڵامەکە نەیەت، بۆیە پەلە مەکە و بەردەوام بیربکەرەوە.

پرسیار لە خۆت بکە کە هۆکاری ڕاستەقینە چییە تۆ دەتەوێت سەربەخۆیی دارایی بەدەست بهێنیت؟

بیری لێ بکەرەوە:

+ چی دەکەی ئەگەر پێویستی نەکردایە کار بکەیت؟
+ چی دەکەی ئەگەر ئەو کاتەی هەتە بۆ خۆتی بەسەر ببەیت؟
+ ژیان چ جیاوازیەکی دەبوو ئەگەر کێشەی پارەت نەبوایە؟

هەرچی بە مێشکتدا هات بینووسە.

پاشان دووبارە پرسیار لە خۆت بکەرەوە. ئەو هۆکارە بەهێزە چییە کە پاڵ بەتۆوە دەنێت بۆ ئەوەی بگەیتە سەربەخۆیی دارایی؟ زیاتر بیری لێ بکەرەوە و هەرچی بە مێشکتدا هات بینووسە.

پرسیار لە خۆت بکەرەوە و زیاتر قووڵبەرەوە لە ناخی خۆتدا. من بۆ دەبێت لەڕووی داراییەوە سەربەخۆ بم؟ هەرچی بە مێشکتدا هات بینووسە.

بەردەوام بە لەسەر ئەو پرۆسەیە و جار بە جار قووڵتر ببەوە هەتا وەڵامی تەواوەتی خۆت دەستدەکەوێت کە سەربەخۆیی دارایی چ سوودێک بە تۆ دەگەیەنێت؟ بۆچی شایەنی ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونەیە لای تۆ؟ ئەو هۆکارە چیە هێندە پاڵنەرێکی گەورەیە؟ بەردەوام بە هەتا وەڵامی ڕاستەقینەت دەستدەکەوێت.

# بەشی حەوتەم
## سەربەخۆیی دارایی بە واتای چی دێت

"هەرگیز خۆزگە ناخوازم خانمان بەهێزتر بن لە پیاوان. تەنها خۆزگە دەخوازم کە بەهێزتر بن بەسەر خۆیاندا"

بە دەقیقی واتای سەربەخۆیی دارایی چییە؟ بە مانای چی دێت؟ ئایا بە واتای ئەوە دێت کە پیشەیەکی خۆتت هەبێت و داهاتێکی مانگانە و خۆتی پێ بەخێو بکەیت؟ یان بەشی ٣٠، بۆ ٤٠ساڵ پاشەکەوتت هەیە؟ یان سەروەتێکت بۆ ماوەتەوە؟ بۆ بەشێکی زۆری خەڵک سەربەخۆیی دارایی مانای ئەوەیە کە تا ٦٥ ساڵی ئیش بکەن و دوای ئەوە بە کوێرەمووچەیەکی خانەنشینی ژیان بەرێ بکەن.

چەندین بۆچوون هەیە کە واتای سەربەخۆیی دارایی ڕوون دەکاتەوە، بەڵام من بە جۆرێکی دیکە بیری لێ دەکەمەوە و هەر ئەو بیرکردنەوەیە بوو کە وای لێ کردم بە ٣٧ ساڵی خانەنشین ببم و پاڵی لێ بدەمەوە.

سەرەتا، ئەوەی کە دەمەوێت پێتان بڵێم ئەوەیە کە هەرچیتان کردووە کتێبی "باوکی زەنگین و باوکی هەژار" بخوێننەوە کە لەلایەن هاوژینەکەمەوە نووسراوە، ڕۆبێرت. کتێبەکە باس لە چیرۆکێکی ڕاستەقینە دەکات کە لەسەر دوو باوکە. باوکی هەژار، کە باوکە ڕاستەقینەکەیەتی، باوکێکی ڕۆشنبیری خاوەن بڕوانامەیە. سەرپەرشتیاری گشت قوتابخانەکانی هەواییە. ڕۆبێرت بە باوکی هەژار ناوی دەبات، چونکە هەرچەندێک پەیدا بکا، سەری مانگ دینارێکی پێ نەماوە.

باوکە زەنگینەکەی، باوکی نزیکترین هاوڕێی ڕۆبێرت بوو. خوێندەوارییەکی سەرەتایی هەبوو و هەر لە سەرەتاکانی تەمەنییەوە

دەستی کردبوو بە کاری خانووبەرە لە هەوایی. جا ئەو کتێبە، باس لە ئامۆژگاریە جیاوازەکانی ئەو دوو باوکە دەکات، بۆ کوڕەکانیان، ڕۆبێرت و مایک.

زۆرینەی فەلسەفە و بیرکردنەوەکانم لەسەر پارە و سامان و سەربەخۆیی دارایی لەو کتێبە فێربووم. جا با قسەی کەس نەچێت بە گوێتا پێش ئەوەی ئەو کتێبە نەخوێنیتەوە. ئەگەر ئامانجت سەربەخۆیی داراییە و دەتەوێ بگەیت بەو ژیانەی کە دەتهەوێت، ئەوا خوێندنەوەی ئەو کتێبە مەرجە و نابێت فەرامۆشی بکەیت.

ئەوەی زۆر بەلامەوە سەیر بوو، ئەوە بوو کە ئەو قسانەی باوکی زەنگین دەیڵێت و ئەو ئامۆژگاریانەی ئەو دەیکات، تەواو جیاوازە لە ئامۆژگاری کەسانی بەناو ئابووری ناس و شارەزایانی بواری دارایی. لە دوای ئەو کتێبە تێدەگەیت کە بابەتەکە زانستی فەلەک نییە و ئەو شتە قورسە نییە کە باسی دەکەن. تەنها کەمێک زانیاری و کات و پەروەردەی مێشکی دەوێت.

جا با بگەڕێینەوە سەر باسی سەربەخۆیی دارایی. من باسی پێناسەکەی خۆمتان بۆ دەکەم. زۆر کەسی تر قسەیان هەبووە لەسەر سەربەخۆیی دارایی. من ناڵێم ڕاستن یان هەڵە. تەنها دەڵێم کە من ئەو بیرۆکەیەتان پێ دەڵێم کە منی گەیاندە ئەم ڕۆژە. ئەو قسانەی من، هەمان ئەو قسانەن کە باوکی زەنگین فێری ڕۆبێرتی کردووە. جا بۆیە هێندە سوورم لەسەر ئەوەی کە کتێبی باوکی زەنگین و باوکی هەژار بخوێننەوە.

**هاوکێشەکە بەم جۆرەیە:**

هەموو هەوڵت با بۆ ئەوە بێت کە لیستی (پارەهێن)ەکانت زیاد بکەیت و ئەو سەرچاوانە زیاد بکەیت کە پارەت بۆ دەهێنن. بە شێوەیەک کە ئەو پارانەی لە ڕێگەی پارەهێنەوە بەدەستت دەگات،

یان یەکسان بێت بە خەرجیەکانت، یان زیاتر بێت لە خەرجییەکانت.
من گەیشتووم بە سەربەخۆیی دارایی، چونکە پارەهێنەکانم هێندەم پارە بۆ دەهێنن کە لە خەرجییەکانم زیاترە.

**پارەهێن چییە؟**

باوکی زەنگین، کە هەمیشە ڕێگەیەکی ئاسانی دەدۆزیەوە بۆ ئەوەی شتەکانت تێبگەیەنێت، بەم شێوەیە پێناسی پارەهێنی کردووە.

پارەهێن: سەرچاوەیەکە کە پارەت بۆ دەهێنێت، بێ ئەوەی هیلاکی خۆتی بوێت و بێ ئەوەی خودی خۆت لەناو ئیشەکەدا بێت. واتە ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی، پارەهێن پارەت بۆ دەهێنێ.
باشە ئەگەر خۆمان کار نەکەین، ئەی لەکوێوە پارەمان بۆ دێت؟
ڕاستە ئەگەر کار نەکەیت بێ پارە دەبیت.، جا پێش ئەوەی بۆتان ڕوونتر بکەمەوە، با ئەم چیرۆکەتان بۆ بگێڕمەوە:
جارێک ئەم بابەتەم بۆ هەندێک خانم باس دەکرد،
یەکێکیان ووتی: مستیلەیەکی ئەڵماسم هەیە، ئەوە بە پارەهێن حسابە؟
ووتم: بەنیازی بیفرۆشیت؟
ووتی: نەوەڵا فرۆشتنی چی؟
ووتم: کەواتە پارەت بۆ دەهێنێت یان نا؟
بە دەنگێکی نزمەوە ووتی: نەخێر!

کەواتە زۆر ئاسانە. هەر بە پێی پێناسەکەی باوکی زەنگین، مستیلە نابێتە پارەهێن چونکە پارەت بۆ ناهێنێت. بەڵام ئەگەر فرۆشتت و پارەی بۆ هێنایت، ئەوە قسەیەکی ترە. یان جاری وایە پارەهێن موڵکێکە کە داوتە بە کرێ و مانگانە پارەت بۆ دەهێنێت.

یان بزنسێکە و قازانجی لێ دەکەیت. یان پشکە، یان ئاڵ و گۆڕی دراوە. چوزانم!، هەر شتێک کە پارەت بۆ بهێنێت، ئەوە پارەهێنە.
لە بەرامبەر پارەهێندا، شتێکی تر هەیە کە پێی دەڵێین (پارەبەر). واتە هەموو ئەو خەرجییانەی کە پارە لە گیرفانت دەردەهێنێت. ئەگەر وازت لە ئیش هێنا، ئۆتۆمبێلەکەت پارەبەرە. چونکە خەرجی بەنزین و چاککردنەوەی هەیە و ئەمانەش پارەی دەوێت. یان خانووەکەت، مەسرەفی ئاو و کارەبا و چاککردنەوەی هەیە، کەواتە پارە لە گیرفانت دەردەهێنێت و ئەویش دەبێتە (پارەبەر).
وەک باوکی زەنگین دەیووت: کێشەی خەڵک ئەوەیە کە جیاوازی ناکات لە نێوان پارەهێن و پارەبەردا. پارەبەر دەکرێت و وا دەزانێت پارەهێنە. دۆزینەوەی ئەو جیاوازیە، یەکێک بوو لە گەورەترین وانەکانی ژیانم کە لە باوکی زەنگینەوە فێری بووم. جا کەواتە وانەی یەکەم ئەوەیە کە پارەهێن زیاتر بکەیت و لەوێوە قازانج زیاتر بکەیت.

**قازانج چییە؟**

کاتێک پارەیەک دەکەیتە ئیشێکەوە، وە لەو ئیشەوە مانگانە پارەت دەستکەوت. لەو پارەیە، هەموو خەرجی و باج و کرێ و ووردەکاریەکانی لێ دەربکە. هەرچی مایەوە، ئەوە قازانجە. یان کرێ خانوو وەردەگریت و دوای ئەوەی کە خەرجی ئاو و کارەبا و ووردەکاریەکانی لێ دەردەکەیت، هەرچی مایەوە ئەوە قازانجە.
جا لێرەدا دوو جۆر قازانجمان هەیە:

- قازانجی یەکجارەکی
- قازانجی بەردەوام

قازانجی یەکجارەکی ئەو قازانجەیە کە بە یەکجار دەستت دەکەوێت. بۆ نموونە خانوویەک بە ١٠ دەفتەر دەکڕیت و

دەیفرۆشیتەوە بە ١٢ دەفتەر. ئەو دوو دەفتەرە دوای ئەوەی پارەی نووسینگە و تاپۆ و ووردەکاریەکنت لێ دەرکرد، ئەوەی مایەوە قازانجی یەکجارەکییە. یان ئاڵ و گۆڕی دراو دەکەیت، بڕێک پارە دەکڕیت و دوای ماوەیەک دەیفرۆشیتەوە. مایەی لێ دەربکە و هەرچی مایەوە ئەوە قازانجی یەکجارەکییە.

بۆ ئەوەی قازانجی یەکجارەکی بکەیت، دەبێت پارەهێنەکانت بفرۆشیت. بۆ نموونە خانوویەکت داوە بە کرێ، ئەو خانووە چونکە پارەی بۆ هێناویت، بە (پارەهێن) هەژمار دەکرێت. ئێستا تۆ دەیفرۆشیت چونکە نرخەکەی بەرز بووەتەوە. ئەو پارەیەی دەستت دەکەوێت بەهۆی فرۆشتنی پارەهێنەکەتەوە بووە و بە یەک جار دەستت دەکەوێت.

بەڵام (قازانجی بەردەوام) ئەو قازانجەیە کە مانگانە، یان هەفتانە بە بەردەوامی دەستت دەکەوێت. بۆ نموونە خانوویەکت داوە بە کرێ و مانگانە پارەت بۆ دەهێنێت. ئەو پارەیەی دەستت دەکەوێت، لەبەر ئەوەی مانگانەیە و بەردەوامە، پێی دەڵێین قازانجی بەردەوام. بەڵام هەرکاتێک خانووەکەت فرۆشت، قازانجی بەردەوام کۆتایی دێت و دەبێت بە قازانجی یەکجارەکی.

**چۆن حساباتی قازانجی یەکجاریی دەکەیت؟**

پرۆسەی حسابکردنی پرۆژە و وەبەرهێنانەکانت کارێکی قورس و گران نییە. بۆ نموونە کاتێک پشکێک دەکریت، پشکەکە مانگانە چەندی بچێتە سەر، واتە ئەوە قازانجی مانگانەکەیە. هەر ئەوەندەیە.

حسابات کردنی قازانجی پرۆژەیەکیش بەهەمان شێوەیە. سەرەتا بڕێک پارە دەخەیتە ئیشەکەوە. دوای ئەوە مانگانە بڕێک قازانج وەردەگریت کە بەم قازانجە دەوترێت **قازانجی مانگانەی بەردەوام.**

قـازانجی مانگـانەت لە کـۆی گشـتی داهـاتی پـرۆژەکەوە دەسـت دەکەوێت.

لەوانەیە بڵێن ئەی جیاوازی چییە لە نێوان ئەمە و دانانی پارە لای بانک و دەستکەوتنی بڕێک سودی مانگانە لە بەرامبەر ئەوەی پارەت لە بانک داناوە؟ بەڵی ڕاستە بەو برە پارەش کە لە بەرامبەر دانانی پارەکات لە بانک وەریدەگریت، دەتوانیت پێی بڵێیت قازانجی مانگانە، بەڵام بڕی قازانجەکە زۆر کەمە ١٪ بۆ ٢ دەبێت، کە بڕێکی زۆر کەمە، تۆ دەتەوێت پارەکانت بە باشترین و خێراترین شێوە ئیشت بۆ بکەن، نەک بۆ ئەو ڕێژە کەمە قازانجە.

بەهەمـان شـێوازیش دەتوانیت حسـابات بکەیت بـۆ هەر ئیش و کـار و پرۆژەیەکـت، ئیتـر ئایـا خـانووی کـرێیە، نوسـینگەیەکی بازرگانییە یان بازار و دوکانێکە.

پارەی داهاتی مانگانە - خەرجییەکان = قازانجی مانگانە

لە هەمووی گرنگتر داهاتی مانگانەکەت دەبێت زۆرتربێت، ئەگەر نا ئەو کاتە لە زەرەردا دەبیت و قازانجت بە (-) دەبێت.

**بۆچی قازانجی مانگانە گرنگە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی؟**

سـەربەخۆیی دارایـی مـن لە یەک وشـەدا کـورتی دەکەمەوە ئەویش (ئـازادیی)ە. کاتێـک سـەربەخۆ دەبـم لە ڕووی دارایـیەوە، ئەوکاتە ئازاد دەبم لەوەی چیدەکەم چی ناکەم. ئازاد دەبم لەوەی چۆن بژیم یان چی بکرم و چی نەکرم. ئازاد دەبم لەوەی پلانی ڕۆژەکەم چۆن بێت و لەگەل کێ بەسەری بەرم. کاتەکەم تەنها بۆ خۆم دەبێت، نەک بۆ ئیش، دەتوانم چۆنم بوێت ئاوا بەکاری بهێنم. ئازادیی دارایی بەواتای هەڵبژاردەی زیاتر دێت.

کاتێک بە فرۆکە گەشت دەکەیت، لە بزنس کلاس دابنیشیت خۆشە یان جێگەیەکی ئاسایی؟ زۆرینەی خەڵک هەڵبژاردەکە بەدەست خۆیان نییە، چونکە پارەکەیان بڕیاردەدات لەکوێ دادەنیشن. هەربۆیە زۆرینەیان شوێنی ئاسایی هەڵدەبژێرن چونکە پارەکەیان هەر ئەوەندەیە، کەواتە ئازادنین لە هەڵبژاردندا.

باشە ئەگەر دوو هەڵبژاردەت بخەنە بەردەم و بڵێن کامیان هەڵدەبژێریت؟ نان خواردن لە ڕێستۆرانتێکی خۆشی پێنج ئەستێرە یان سەرعەرەبانەیەک؟ لەوانەیە من بڵێم سەر عەرەبانەکە! چونکە زیاتر حەزم لەوەیە، بەڵام زۆرینەی خەڵک ڕێستۆرانتە پێنج ئەستێرەکە هەڵدەبژێرن.

هەتا پێویستت بە کارکردن هەبێت بۆ ئەوەی بژێوی ژیانت پەیدابکەیت، کەواتە تۆ سەربەست نیت. لەوانەیە من هێشتا کارکردن هەڵبژێرم بەڵام بۆ حەزی خۆم نەک لەبەر ئەوەی پێویستە کاربکەم بۆ ئەوەی بژیم.

خۆشی هەبوونی قازانجی مانگانە لەوەدایە کە تۆ ئیش بکەیت و نەکەیت مانگانە، بڕێک پارە دێتە سەرحسابەکەت بێ ئەوەی تۆ هیچ هیلاک بیت. بۆ نموونە من مانگانە کرێی شووقەکانم دێنە سەرحسابەکەم بێ ئەوەی من هیچ بکەم. موڵک و پارچە زەویەکانم مانگانە پارەم بۆ پەیدا دەکەن بێ ئەوەی من هیچ هیلاک بم. بەهەمان شێوە، ڕۆبێرت، مانگانە قازانجی کتێبەکانی دەچێتە سەر هەژماری بانکیەوە، کەواتە چیتر پێویستی بە کارکردن نییە. ڕاستە یەکجار کتێبەکەی نوسی و ماندوو بوو پێوەی، بەڵام هەتا ئێستاش قازانجی لێدەکات چونکە کتێبێکی بەسودە و سەرنجڕاکێشە بۆیە خەڵکی بۆ یەکتری پێشنیار دەکەن.

یەک خـاڵی زۆر گرنـگ هەیە، دەبێـت ئاگاداربیـت داهـاتی مانگانەکەت زیاتر بێت لە خەرجیەکانت. من خۆم هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەم کە زیاتر ئیش لەسەر ئەو پرۆژانەبکەم کە قازانجێکی زۆرم بۆ دەهێنێت، بۆ نمونەی پارەهێن زۆر دەکرم.

مـن دەمەوێـت لە ڕێـگەی لیسـتی پارەهێنەکـانمەوە پـارە پەیـدابکەم، نەک خـۆم ئـیش بـکەم و پـارە پەیـدا بـکەم. لەبەر ئەوە **قـازانجی یەکجـاری** ئامـانجی یەکەمـم نیـیە، بەڵکـو سـەرچاوەی دووەمـی داهـاتمە نەک سـەرچاوەی سـەرەکی. چـونکە کە بـۆ ئەوەی قـازانجی یەکجـاریم دەسـتبکەوێت پارەهێنەکـانم بفرۆشـم و بەو پـارەیەی دەسـتم دەکەوێـت لێـی پێـێ دەگوترێـت **قـازانجی یەکجـاری** واتە یەکجـار وەری دەگـرم. بـۆ نمـونە خـانویەکم هەیە، دەیفرۆشـم و بەو بـڕە پـارەیەی پێیدەفرۆشـم دەوترێـت قـازانجی یەکجـاری. دواتـر پـارەکە خەرجـدەکەم و دەبێـت جـارێکی تـر وەبەرهێنـانێکی تـر بـکەم بۆ ئەوەی قـازانجم دەسـتکەوێت و دواتـر پـارەهێنی تـر بکـڕم و دواتـر دەیفرۆشـمەوەو ئیتـر بەم شـێوەیە بەردەوام دەبێت و منیش ناتوانم بگەم بە سەربەخۆیی دارایی.

لەوانەیە هەندێک کەس بڵێن ئەوە کەی کێشەیە تا سەری خۆمی پیوە بیەشـێنم؟ لە بـری ئەوە بڕێـک پـارە کـۆدەکەمەوەو بەشـی هەمـوو تەمەنـم بکـات. باشـە، بەڵام بـا تۆزێـک وردتـر بیـری لێبکەینەوە. چەندێکت دەوێت تا بتوانی ئەو بڕە پارەیە کۆبکەیتەوە؟ بە نیازیت ئاگـاداری دینـار بە دینـار بیت کە خەرجـی دەکەیت بـۆ ئەوەی لەو حسـاباتە لانەدەیت کە کـردووتە؟ بە نیازیـت شـێوازی ژیانـت بگـۆڕێـت و خـەرجیەکانـت کەمبکەیـتەوە بـۆ ئەوەی پـارەت

لێنەبڕێت؟ ئەمانە تەنها کەمێکن لەو پرسیارانەی کە پێویستە لە خۆتی بکەیت.

من و ڕۆبێرت تەنها یەک ئامانجمان هەیە، ئەویش زیادکردن و فراوانکردنی ستوونی پارەهێنەکانمانە بۆ ئەوەی خەرجیەکانمان بۆ دابین بکات، نەک هەوڵی کەمکردنەوەی خەرجیەکان بدەین. واتە ئێمە کار لەسەر زیادکردنی سەرچاوەی داهات دەکەین، نەک کەمکردنەوەی خەرجی.

دەتوانم بڵێم من ورۆبێرت لە ساڵی ١٩٩٤ ەوە خانەنشین بووین، خانەنشین بەو واتەیا نا لەماڵەوا دانیشین و بخۆین و بخۆینەوە، بەڵکو بەو واتایەی کە کارمان بکردایە و نەکردایە گرنگ نەبوو، چونکە پارەکانمان لەبری خۆمان کاریان بۆ دەکردین و لە ڕووی داراییەوە توانیمان سەرکەوتووبین.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە، پێویست ناکات قازانجی مانگانەت خەیاڵی بێت بۆ ئەوەی بتوانی سەربەخۆ بیت، بەڵکو تەنها پێویستت بەوەیە قازانجی مانگانەکەت لە خەرجی مانگانەت زیاتر بێت. ئەگەر داهاتی مانگانەت لە خەرجیەکانت زیاترە، کەواتە پیرۆزە تۆ سەربەخۆیت. لە ساڵی ١٩٩٤، داهاتی مانگانەمان دەفتەرێک بوو، بەڵام خەرجیەکانمان ٣٠ وەرەقە بوو، کەواتە توانیمان سەربەخۆ بین. بێگومان لەو خاڵەشدا نەوەستاین، بەردەوام لە هەوڵی زیادکردنی ستوونی پارەهێنەکانمان بووین. کاتێک پارەهێن زیاد دەکات، واتە قازانج زیاد دەکات، کە قازانج زیادی کرد، دەتوانی خەرجیەکانت زیاد بکەیت و کوالیتی ژیانیشت باشتر بکەیت.

ئەو خاڵەی کە لە دوای قازانجی مانگانە گرنگە و پیویستە گرنگی پێبدرێت چییە؟ دوو خاڵ هەیە پێویستە ئاگاداریان بیت،

**یەکەم قازانجی مانگانە ، دووەم دەستکەوتنەوەی مایە.**

## مایە چییە؟

مایە واتە ئەو بڕە پارەیەی کە خەرجت کردووە لە پرۆژەکەتدا. دەستکەوتنەوەی مایە واتە پاش چەندێک ئەو پارەیەت دەست دەکەوێتەوە. یان بە واتایەکی دیکە، تا چەندێک پارەکەت ئیشت بۆ دەکەن بۆ ئەوەی زوتر مایەکەت دەستبکەوێتەوە.

چەند ڕێگەیەک هەیە بۆ ئەوەی حساباتی دەستکەوتنەوەی مایە بکەیت. کاتێک باسی دەستکەوتنەوەی مایە دەکەم، واتە لە ماوەی چەندێکدا دەتوانیت مایەی ئیشەکە لە قازانجی مانگانە وەربگریتەوە. قازانجی مانگانە دیاری دەکات، چەند کاتت دەوێت تا بگەیتەوە مایە.

## چۆن حساباتی دەستکەوتنەوەی مایە دەکەیت؟

با بڵێین تۆ موڵکێکی بازرگانی دەکڕیت، نرخەکەی ۱۰۰۰۰۰$ە، وە دەبێت پێشەکی ۲۰۰۰۰$ بدەیت. واتە دەبێت پێشەکی ٪ی۲۰ ی نرخەکەی بدەیت. وە قازانجی مانگانەی بریتیە لە ۲۰۰$. واتە قازانجی ساڵانەت ۲٤۰۰$ە. کەواتە قازانجی ساڵانە دابەش بکە بەسەر ۲۰۰۰$ دا، دەکاتە ٪۱۲ ، واتە لە ماوەی ساڵێکدا ٪۱۲ی مایەت وەرگرتۆتەوە.

نموونەیەکی تر با باسی بازاڕی ئاڵوگۆڕ بکەین، بۆ نمونە تۆ پشکێک دەکڕیت بە ۲۵۰۰$ و ساڵانە ۱۰۰$ دەچێتە سەر، واتە قازانجی ساڵانە بریتیە لە ۱۰۰$. کەواتە ۱۰۰$ دابەش بکە بەسەر ۲۵۰۰، واتە لە یەک ساڵدا ٪٤ ی مایەت دەستدەکەوێتەوە.

یان با باسی پارەی پاشەکەوت کراوی بانک بکەین. بۆ نمونە تۆ ۱۰۰۰$ دادەنێیت لە بانکدا، ساڵانە ٪۲ دەچێتە سەر، واتە تۆ ساڵانە

بۆ ١٠٠٠$، بڕی ٢٠$ دەچێتە سەر، واتە ٢٠$ مایەت دەستدەکەوێتەوە ساڵانە.

هاوکێشەکە زۆر ئاسانە، تەنها پێویستە دوو ژمارە بزانیت، یەکەم بڕی ئەو پارەیەی لە پرۆژەکەدا خەرجت کردووە و دووەم بڕی قازانجی ساڵانەت.

هۆکاری ئەوەی کە زۆر گرنگە ئاگاداری قازانجی مانگانە و ساڵانە بیت بۆ ئەوەیە بتوانیت بە زووترین کات مایەی ئیشەکەت دەستبکەوێتەوە کە ئەویش لە ڕێگەی قازانجی ساڵانە و مانگانەوە دەبێت، تا قازانجی ساڵانەت زیاتر بێت واتە زووتر مایەت دەستدەکەوێتەوە.

وە کاتێک ئاگاداری قازانجی پرۆژەکەتیت، ئەو کاتە دەتوانیت پرۆژەکەی خۆت بەراورد بکەیت بە پرۆژەکانی هاوشێوەی پرۆژەکەت بۆ ئەوەی بزانیت تا چەندێک پرۆژەکەت سەرکەوتووبوە.

ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا توانیت تەنها ٢٪ ی مایەت دەسبکەوێتەوە، کەواتە پارەکانت بە باشی کارت بۆ ناکەن، بەڵام ئەگەر زیاتر بوو لە ٥٠٪ واتە پرۆژەکەت سەرکەوتووبووە.

**زیاتر بزانە**

ئەو ڕێگایەی من هەڵمبژاردووە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی زۆر ئاسانە و هیچ ئاڵۆزیەکی تێدا نییە. سەرەڕای ئەوەی کە ئاسانە بەڵام پێویستی بە هەبوونی کات و پەروەردە و ڕۆشنبیری هەیە. واتە پرۆسەکە لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا ڕوونادات. بەڵام ئەو کاتەی قازانجی پرۆژەکەت دەبینی، ئەو کاتە

هەوڵ و ماندووبوونەکانت بیردەچێتەوەو دەبێتە یاریەکی چێژبەخش.

ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە ئەگەر ڕێگەکە هێندە ئاسانە کەواتە بۆ هەموو کەس هەوڵی بۆ نادات و دەست ناکەن بە وەبەرهێنان و بتوانن کۆنترۆڵی باری دارایی خۆیان بکەن؟

وەک پێشتر ئاماژەم پێدا زۆرینەی خەڵک یەکەم بیانووی ئەوەیە دەڵێت "کاتم نییە." بەڵام خۆیان باش دەزانن ئەگەر شتێک گرنگ بێت ئەوە کاتی بۆ تەرخا دەکەن، بەڵام "کاتم نییە" تەنها بیانویەکە و هیچی تر.

ئەگەر هەر بەڕاست کاتیان نەبێت بۆی، ئەوە بەدەست خۆیانە کە کاتیان بۆ ئەوە نەبێت و بەڵام کاتیان بۆ شتی تر هەبێت. ئەگەر هەر بەڕاست کاتمان نەبێت بۆی، ئەوە خراپتر، واتە تا ئێستا هۆکارێکمان نەدۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی هەوڵی سەربەخۆیی دارایی بدەین. بەڵام ئەبێت ئەوە باش بزانین کە کاتێک هەوڵ دان بۆ سەربەخۆیی دارایی دەکەین بە ئامانجی ژیانمان، ئەو کاتە هیچ بیانوویەک ناتوانێت ساردمان بکاتەوە. ئەوە مایەی خۆشحاڵیە، لە ئێستادا ژمارەیەکی زۆری خانمان سەرقاڵی کار و پرۆژەی خۆیانن و هەوڵی سەربەخۆبوونی دارایی دەدەن.

هۆکارێکی تری دیار کە لە زۆر خانمەوە گوێم لێدەبێت کاتێک باسی ئیش و سەربەخۆبوونی داراییان بۆ دەکەم، هۆکارێکی تا بڵێی نا لۆژیکییە، ئەویش ......

## بەشی هەشتەم
## " من ئەوەندە زیرەک نیم."

نـزیکەی دوای هەفـتەیەک لە نیوەڕۆخـوانەکە، ڕۆژێکیـان لە تاکسـیدا بـووم بەرەو شـوێنێک دەڕۆشـتم کۆبـونەوەم هەبـوو، مۆبایلەکەم زەنگی لێدا.
وتی: کیم، چۆنی؟ من لێسلیم، کاتت هەیە تۆزێک قسەبکەین؟
کیم: بێگومان.
لێسـلی: ئەوەی ڕاسـتی بێـت زۆر بیـرم لە قسـەکانی ئەو ڕۆژەت کردەوە دەربارەی پارە و سەربەخۆبوونی دارایی، هەستەکەم ڕێک ئەوەیە کە مـن بەدوایـدا دەگەڕێـم، بەڵام هەر کاتێـک بیـری لێدەکەمەوە توشی هەمان کێشە دەبمەوە.
کیم: کام کێشەیە؟
لێسـلی: مـن هەمـوو ژیـانم خەریکی هـونەر و شـێوەکاری بـووم، هەمیشە لەناو ڕەنگ و بۆیە و تابلۆدا بووم، دەتوانم بڵێم تەنها لەو بوارەدا شارەزام، بەڵام بەخوا مێشکم تەقەی دێت کاتێک دێتەسـەر باسی پارە و ئەو بابەتـانە. هەر کاتێک بیری لێدەکەمەوە، بێ هیوا دەبم، هەستەکەم ئەو کەسانەی لەو بوارەدا باشن و سەرکەوتوون، ئەوە بەهرەیە و خوا پێیبەخشیون، من هیچ ئەو بەهرەیەم تێدانییە.
هەستم بە بێتاقەتیەک و وەڕسیەکەی زۆر کرد لە لێسلدا، هەر بۆیە بە هێمنی لەگەڵی ڕۆشتم و گوێم بۆ گرت، هێندەی تر بابەتەکەم لەلا قورس نەکرد.
کیم: باشـە بـا پرسـیارێکت لێبکەم. ئایـا بیرت لەوە کـردۆتەوە بـۆ دەتەوێت دەست بە ئیش و وەبەرهێنان بکەیت؟
لێسـلی: هۆکـارەکەی مـن زۆر ڕوون و ئاشـکرایە. خـۆت بـاش دەمناسـی و دەزانـی هەمـوو حەز و خولیـای مـن وێنەکێشـان و

ڕەنگکردنە. بەڵام بەهۆی بژێوی ڕۆژانەوە دەبێت بەردەوام ئیش بکەم بۆ ئەوەی بتوانین بژین. هەر بۆیە هیچ کاتم نییە بۆ ئیش کردن لەسەر حەز و خولیاکانم. بۆ نموونە حەزدەکەم لە دیمەنی و سروشتیی و دڵفڕێندا وێنە بکێشم لە بری ئەوەی لە گەلەریەکدا وێنەبکێشم. یان بۆ نموونە دەمەوێت گەشت بکەم بۆ ئەوروپا لەوێ سەرقاڵی خوێندنی ماستەر و وێنەکێشان بم. بەڵام بەهۆی ئیشکردنەوە هیچ کاتم بۆ ئەوانە نییە. ئەگەر لە ژیاندا پێم بڵێن تەنها یەک شت هەڵبژێرە، ئەوە وێنەکێشان هەڵدەبژێرم. کەواتە بەڵێ زۆر چاک دەزانم بۆ دەمەوێت دەسپێبکەم.

کیم: پیرۆزە! کەواتە پڕۆسەکە لێرەوە دەستپێکرد.

لێسلی بە وەڕسیەوە وتی: کام پڕۆسەیە؟

کیم: زەنگین بوون هەروا بە ئاسانی لە شەو و ڕۆژێکدا ڕوونادات. هەرکاتێک بتەوێت فێری شتێکی نوێ بیت، ئەوە چەماوەیەکی فێربوون هەیە دەبێت پێیدا تێپەرببیت، لەسەرەتادا چەماوەکە زۆر ناخۆش و وەڕسکەرە، بەهۆی ئەوە ئەزموونێکی نوێ یە و هیچ زانیایت لەسەری نییە. بەڵام بەتێپەڕبوونی کات، ئاسایی دەبێتەوە.

لێسلی: وابزانم وەکو ئەو کاتە وایە کە بۆ یەکەمجار فێری شۆفێری کردن دەبووم. سەرەتا زۆر بە خێرایی قاچم دەنا بە بەنزیندا، یان زۆر بە ڕەقی و خێرایی ئیستۆپم دەگرت، وا ئیستۆپم دەگرت خەریبوو دەچوومە جامەکەوە، هەر یەکەم جار کە چوومە سەر جادە، توشی پێکدادانێک بووم.

کیم: دەمخۆش! ڕێک منیش باسی ئەوە دەکەم. سەرەتا زۆر قورس و گران بوو شۆفێری کردن بەڵام ئێستا وەکو ئاو خواردنەوە وایە بۆت. کاتێک دەتەوێت شۆفێری بکەیت، بیر لەوە ناکەیتەوە بەنزین

لە کوێدایە، یان ئیستۆپ، پرۆسەکە وەک شتێکی ئۆتۆماتیکی لێهاتووە.
لێسلی: کەواتە ئەمەش پرۆسەیەکە و هێشتا زۆرم ماوە فێربم؟ بەڵام هێشتا من وادەزانم ئەوەندە زیرەک نیم تا وەبەرهێنان بکەم و سەرکەوتووبم. هەستەکەم پیاوان زیرەکتر و باشترن لە پارەپەیداکردن و حساباتدا. وا نازانم بتوانم شانبەشانی ئەوان خەریکی یاریەکەبم.
کیم: ڕاستە، پیاوان باشترن لە حسابات و ژمارەکان. بەڵام بۆ وا هەستدەکەیت وەبەرهێنان کردن تایبەت بێت بە پیاوان؟
لێسلی: چونکە ڕۆژێک لە ڕۆژان نەمبینی لە ڕۆژنامەکاندا باسی خانمە وەبەرهێنەرێک بکرێت. هەموو وەبەرهێنەرە باشەکان پیاوانن، من کاتێک بیر لە وەبەرهێنان دەکەمەوە هیچ پێشەوایەکی خانم لە بوارەکەدا نابینم تا بتوانم لاسای بکەمەوە. لەبەرئەو هۆکارانەیە هەستەکەم پیاوان لە ئێمە باشترن لەو بوارەدا.
کیم: باشە با پرسیارێکت لێبکەم، ئایە هۆکاری ئەوەی لە ڕابردوودا تەنها پیاوان مافی دەنگدانیان هەبوو، ئەوەبوو کە پیاوان لە ئێمە باشتر بڕیاردەدەن و هەڵدەبژێرن؟ ئایا هۆکاری ئەوەی کە لە کۆندا تەنها پیاوان مافی خوێندنیان هەبوو، ئەوەبوو کە پیاوان لە خانمان زیرەکترن؟
ئایا هۆکاری ئەوەی جاران تەنها پیاوان بۆیان هەبوو لە دەستەی بڕیاردانی دادگاکاندا بن، لەبەر ئەوەیە ئەوان لە خانمان وردتر و ژیرترن؟
لێسلی: بێگومان نەخێر.

کیم: سێ کلیلی زۆر گرنگ هەن کە بیرکردنەوەت دەگۆڕێ لەسەر ئەم بابەتە. لە ڕاستیدا منیش سەرەتا بیرکردنەوەم وەک تۆ بوو، بەڵام توانیم لە ڕێگەی ئەو سێ کلیلەوە کۆتای بەو بیرکردنەوانە بهێنم.

**ئێمەی خانمان فێری چی کراوین؟!**

Jargon

پرۆسە و ئەنجام

پەروەردە

**١: پەروەردە:** ڕاشکاوانە بیڵێم، تا ئێستا فێری پەروەردەیەکی دارایی باش نەکراوین لە بابەتی پارەدا، ئەوەی فێرکراوین تەنها شتی سەرەتایی بووە، چۆنیەتی کەمکردنەوەی خەرجیەکانمان و چۆنیەتی کردنی بیمەی ئۆتۆمبێل و چۆنیەتی دەستگرتنەوە بە پارە لە کاتی شتکڕیندا. بەڵام ئێمەی خانمان زۆر لەوە زیرەکترین.

ڕاستە دەبێت باری داراییت ڕێکخراو بێت و ئەو شتە سەرەتاییانە بزانیت، کەس گلەی لەوە نییە. بەڵام ئەوانە بە تەنها گرنگ نین. ئەوانە شتی سەرەتایین بۆ دروستکردنی بناغەیەکی باش. کاتێک لە شتە سەرەتاییەکان گەیشتی، ئیتر کاتی ئەوەیە ڕۆڵی کارات هەبێت لە هەوڵدان بۆ ئامانجە داراییەکانت.

ئەگەر ڕۆژێک گوێم لێبێت پیاوێک بڵێت هاوژینەکەم ئاگاداری هەموو کارەداراییەکانە و ئەو ئەرکەکەی گرتۆتە ئەستۆ، ئەوە لە خۆشیا دەفڕم. چونکە ٩ لە ١٠ ی خانمان نایانەوێت ئەو بەرپرسیاریەتیە هەڵبگرن. ئەوەی دەیکەن بریتیە لە پارەدانی پسوڵەکان، ئاگاداری دەفتەر کاشەکە، ئەوە هەموو ئەو کارانەیە کە دەیکات. ئیتر ئەوەی مایەوە هەموو لە ئەستۆی پیاوەکەیە، هەر لە کڕین و فرۆشتنی موڵک و ئاڵوگۆڕی دراو و بڕیاردان لەسەر

بابەتە پەیوندیدارەکانی سەبارەت بە پارە. وە کاتێک پیاوەکە لە ژیاندا نامێنێت، هەموو ئەرکەکە دەکەوێتە سەر خانمەکە، و خانمەکەش هیچ ئەزموون و زانیاریەکی نیە و نازانێت چی بکات و چۆن مامەڵەبکات. بۆیە یان بڕیاری هەڵە دەدات، یان بریکارێک دەگرێت و داوای یارمەتی لێدەکات و ئەو لە جیاتی خانمەکە بڕیار دەدات و پێی دەڵێت کە هیچ خەمی نەبێت کاکی بریکار هەموو ئەرکەکان دەگرێت ئەستۆ.

بەڵام لێرەدا با پرسیارێک بکەین، باشە خانم گیان ئەگەر تۆ ئاگات لە پارەکانت نابێت، چۆن خەڵک ئاگای لێدەبێت؟

ئەوەی جێگەی تێڕامانە، ٪٨٠ ی ئەو خانمانەی ئێستا کەمدەرامەتن، پێش ئەوەی هاوسەرەکانیان کۆچی دوایی بکات، هەژار نەبوون. لەبەر ئەوە ئاگادار بە، ٪٩٠ مان، ڕۆژێک دێت بە تەنها دەمێنینەوە و هەموو ئەرکەکە دەکەوێتە سەرشانی خۆمان، بۆیە دەبێت خۆتی بۆ ئامادەبکەیت.

با چیرۆکێکی کارەساتبارتان بۆ بگێڕمەوە لەسەر ئەم بابەتە، کە خانمێکە باسی خۆی دەکات:

" من خانمێکی تەمەن ٦٨ ساڵم، هاوسەرەکەم بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو و کتوپڕ کۆچی دوای کرد. دوای مردنی نەمدەزانی چیمان هەیە و چیمان نییە، چونکە هەمیشە ئەو ئاگای لە کار و بارە داراییەکان بوو و ئەو ئەرکەکەی گرتبووە ئەستۆ. ئەو ئاگای لە پاشەکەوت وپارەهەڵگرتن بوو. بۆیە من هیچ کات لە خەمی ئەوەدا نەبووم و هیچ کاتێک بابەتی گفتووگۆی نێوانمان نەبووە.

ئێستا ئەو خوا لێی خۆش بێ گیانی سپاردووە و منیش بە تەنها ماومەتەوە، وا هەستدەکەم منداڵێکی یەک ساڵانم تازە پێدەگرم

ولەگەڵ هەر هەنگاوێکدا دەکەوم و شکست دەهێنم. ئێستا تێدەگەم من چەند ساڵە لە تاریکیدا بووم. کاتێک هاوژینەکەم مرد خێرا هانام بۆ هاوڕێیەکم هێنا و پێم وت چۆن پارەی پرسەکەی پەیدابکەم."

لەبەر ئەوە ئەگەر دەتەوێت کۆنترۆڵی بواری دارایی بکەی و وەک ئەو خانمەت لێنەیەت، ئەوە هەر ئێستا دەست بکە بە پرۆسەی فێربوون و ئەوەش بزانە پرۆسەکە پیویستی بە کاتە. هەروەها لە شەو و رۆژێکدا ناتوانیت فێربیت. بەڵام یەک ئامۆژگاریت دەکەم، تکایە بەو هەڵەیەدا مەچۆ کە پیاوان باشتر و زیرەکترن لە تۆ. هەر لەبەر ئەوەی کەسێک ناوی لە خۆی ناوە "شارەزای بواری دارایی" مانای ئەوە نییە ئیتر هەموو شتێ دەزانێت دەربارەی ئەوەی چی بۆ تۆ باشە و چۆن ئیش بە پارەوە بکەیت. ئەگەر وابزانیت ئەو باشتر لە تۆ دەزانێت چۆن ئیش بە پارەکانتەوە بکەن، ئەوە دەبیتە نێچیرێکی باش بۆ کاکی یارمەتیدەری دارایی و تاماویت ناتوانیت خۆت کۆنترۆڵی دارایت بکەیت.

هەربۆیە یەکەم هەنگاو پەروەردە و خۆڕۆشنبیرکردنی خۆتە. کەواتە ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە، خۆڕۆشنبیرکردن بە مانای چی دێت؟ ڕاستە یەک دونیا زانیاری هەیە و دەتوانیت بە ئاسانی دەستت پێیبگات، بەڵام کەی و لە کوێوە دەستپێبکەین؟

سەرەتا خاڵی دەستپێکردن بە پێی کەسەکان جیاوازە. دەتوانیت سەرەتا بەوە دەستپێبکەیت کە خۆت فێری جۆرەکانی وەبەرهێنان بکەیت، دوای ئەوە دەتوانیت بڕیاربدەیت لە کام جۆرەیانە کاربکەیت. بۆ نموونە من حەزم لە وەبەرهێنانە لە بواری موڵک و زەوی و خانوبەرەدا. هاوڕێیەک ترم حەزی لە دروستکردن و

دامەزراندنی کۆمپانیایە. لە کاتی پرۆسەی فێربونەکەدا دەتوانیت بڕیاربدەیت لە کام جۆرەدا کار بکەیت بەپێی گونجان و حەزی خۆت.

ئەم لیستەی خوارەوە پێکهاتووە لە چەند سەرچاوەیەک کە دەتوانیت زانیاریان لێوەربگریت بۆ خۆڕۆشنبیرکردن لە بوارەکەدا.

**کتێب خوێندنەوە** : ژمارەیەکی زۆر کتێب بەردەستن دەربارەی پارە و چۆنیەتی دەستکردن بە وەبەرهێنان کردن و تازەکردنەوەی زانیاریەکانت دەربارەی وەبەرهێنان کردن.

**گوێگرتن** : چەند ڤیدیۆیەک لە ئینتەرنێت دابەزێنە نێو مۆبایلەکەتەوە دەربارەی پارە و چۆنیەتی کۆنترۆلکردنی بواری داراییت، لە کاتی شۆفێریکردندا گوێیان لێبگرە. دەتوانیت سود لەو کاتانە وەربگریت کە لە ترافیکدا وەستاویت.

**بەشداریکردن لە سیمینار و کۆنفرانس و کۆبونەوەکان:** بەشداری هەر سیمینار و ۆرکشۆپێک بکە دەربارەی بواری دارایی و وەبەرهێنان کردن، هەندێکیان دەبێت پارەبدەیت و هەندێکیان بە بەلاش پێشکەش دەکرێن. هەندێک لە ڕێکخراوەکان ئەم جۆرە سیمینارانە ڕێکدەخەن و هەندێکیان هەر تایبەتن بە خانمان.

**خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری دارایی:** هەوڵ بدە ڕۆژنامە و گۆڤاری بواری دارایی بخوێنیتەوە تا زیاتر ئاشنا بیت بە بوارەکە و زانیاری زیاتر وەربگریت. ئەگەر لە هەموو وشە و ڕستەکانیش تێنەگەشتیت، ئەوە هەر بەردەوام بە لە خوێندنەوە، چونکە بە گشتی سودی خۆی دەبێت و دەتوانیت بیرۆکەی لێوەربگری و بە پێی کات زیاتر ئاشنا دەبیت بەو زمانە داراییە و بە ئاسانی لێی تێدەگەیت.

**گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسانی شارەزا :** هەوڵ بدە گفتوگۆ بکەیت لەگەڵ دەلاڵەکانی خانوبەرە و پرسیاریان لێبکە. ئەوان زانیاریەکی زۆریان لایە. بەلام ئاگاداربە زۆربەیان وات بۆ باس دەکەن کە موڵکت پێبفرۆشن نەک زانیاریت پێبدەن. بۆیە لەم کاتەدا ئاگاداری ئەم سێ خاڵەی خوارەوە بە:

ئاگادار بە کە ئەوەنەی دەلاڵی خراپ هەیە، ئەوەندە هی باش نییە. بۆ دۆزینەوەیەکی دانەیەکی باش دەبێت باش پرسیار بکەیت. ئاگادارەبە دەلاڵێک نەدۆزیتەوە کە ئیشی تەنها فرۆشتن و کڕینی خانوبەرە بێت، دەلاڵێک بدۆزەرەوە کە شارەزا بێت لە بواری وەبەرهێناندا بە گشتی، چونکە هەریەکەیەیان بەشێوازێک قسەت بۆ دەکەن.

هەر کاتێک هەلت بۆ ڕەخسا، کار لەگەڵ ئەو دەلاڵانەدا بکە کە خۆشیان وەبەرهێنەرن. چوکە ئاگاداربە زۆریان تەنها فرۆشیارن نەک وەبەرهێنەر. ئەو دەلاڵانەی کە خۆیان وەبەرهێنەرن باشتر لێت تێدەگەن.

**ڕاوێژ بە وەبەرهێنەری دیکە بکە:** هەوڵبدە ڕاوێژ بەو وەبەرهێنەرانە بکەیت کە لەهەمان بواری تۆدا کار دەکەن یان حەزیان لەو بوارەی تۆیە.

**گروپێکی وەبەرهێنانی تایبەت بە خانمان دروست بکە:** هەوڵبدە یانەیەکی وەبەرهێنانی تایبەت بە خانمان دروستبکەیت، تەنها ئەو خانمانە بەشداردەبن کە دەیانەوێت خۆیان ڕۆشبیربکەن و زانیاری وەبگرن لە بواری دارایداو لە هەمان کاتدا پشتگیری هاوڕێکانیان دەکەن بۆ گەیشتن بە سەربەخۆی دارایی.

کار و چالاکی گروپەکە چی دەبێت؟

دەتوانن سەرەتا کتێبێک هەڵبژێرن و گفتوگۆی لەسەر بکەن، یان دەتوانن وەبەرهێنەر و خاوەنکاری سەرکەوتوو بانگهێشت بکەن یان هەر کەسێکی شارەزای تر کە بتوانێت زانیاری ببەخشێت.

**سود لە ئینتەرنێت وەربگرە:** ئینتەرنێت سەرچاوەیەکی زۆر باشی زانیاریە ، دەتوانیت بە دوای هەر جۆرەزانیاریەک بگەڕێیت کە دەتەوێت.

**بگەڕێ:** جار جارە سەیرێکی موڵک و خانوەکانی دەورووپشتت بکە و بزانە نرخەکان چۆنن. زۆر جار خەڵک وادەزانن خێر تەنها لە شوێنە بەناوبانگە بازرگانیەکانە، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە. هەندێک جار دەتوانیت هەر لە نزیک ماڵەکەی خۆت تۆزێ زیاتر چاو ورد بکەیتەوە و هەلت بۆ بڕەخسێت. تا پڕۆژەو کارەکانت خۆتی تیابیت و ئاگداربی، باشترە لەوەی پڕۆژەو کارەکانت لە شوێنیکی دوور لە خۆت بێت و نەتوانی بەتەواوی ئاگادری بیت.

**سەیرکردنی پڕۆگرامە تەلەفیزیۆنیە داراییەکان:** لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە، لەسەرەتادا لە هەموو ڕستە و زاراوەکان تێناگەیت، بەڵام بە گوێگرتنی زیاتر، دەتوانیت بە ئاسانتر لە زاراوەکان تێبگەیت.

**تا دەتوانیت پرسیار بکە:** تا زیاتر پرسیار بکەیت، زانیاری زیاتر وەردەگریت. تا زیاتر پرسیار بکەیت، زانیاری زیاترت دەستدەکەوێت و کەسی شارەزا دەناسی.

سەرەڕای ئەمانەش، فێربوون هەرگیز کۆتای نایەت. ئەگەر بتەوێت ڕۆژ بە ڕۆژ کارەکەت پەرەپێبدەیت، ئەوەدەبێت زیاتر خۆت ڕۆشنبیربکەیت. بۆ نموونە، کاتێک بازار گۆرانکاری بەسەردا هات و کار و پڕۆژەکانم گەشەی کرد، ئەوە کاتی ئەوەیە منیش زانیاریەکانم نوێ بکەمەوە و زانیاری نوێ فێربم.

٢: **پرۆسە و ئەنجام:** هەمیشە ئەوەت لە بیر بێت، وەبەرهێنان کردن پرۆسەیە، پرۆسەش کاتی پێویستە. ئەمە ئەوە نییە شەو بخەویت و بەیانی هەستایت بە چەقەنەیەک زەنگین بوو بیت.

ڕێک وەک کێش دابەزاندن وایە، ئەگەر دەتەویت کێشی زیادەت دابەزێنی، دەبێت بە پرۆسەی کێش دابەزاندنا بڕۆیت. دەبێت بەردەوام ڕاهێنان بکەیت و هەندێک گۆڕانکاری بکەیت لە ژیانتدا، وە بەپێی کات ئەنجامەکەشی دەبینیت. لە شەو ڕۆژێکدا کێشت دانابەزێت، مەگەر نەشتەرگەری لابردنی چەوری بکەیت، بەڵام دوای نەشتەرگەریەکەش دەبێت شێوازی خواردن و ژیانت بگۆڕی بۆ ئەوەی دووبارە کێشی زیادە دروست نەبێتەوە.

لە سەرەتای پرۆسەی وەبەرهێنان کردندا، سەرەتا فێردەبین و زانیاری نوێ وەردەگرین. وە بە ئەزموون کردنی شتەکان لەم پرۆسەیەدا زانیاری و توانای بروا بەخۆبوونمان زیاددەکات. چونکە ئەوەی لەم پرۆسەیەدا فێردەبین، زۆر لە ئەنجامی پرۆسەکە گرنگترە. چونکە ئەوەی لە کۆتای ئەم پرۆسەیەدا فێردەبین، فێربوونە لە هەڵە و ئەزموونەکانمان.

ساڵی ١٩٨٥ تا بڵێی ساڵێکی ناخۆش و پڕ نەهامەتی بوو بۆ من و ڕۆبێرت. هێندە ناخۆش بوو دۆزەخمان بە چاوی خۆمان بینی. دەتوانم بڵێم ناخۆشترین و خراپترین ساڵی هەموو تەمەنمان بوو. تەنگەژەو ناخۆشیەکان نەدەبڕانەوە. هەمیشە دەنگێک لە ناخمدا پێیدەوتم "ناتوانیت سەرکەوتووبیت، شکست دەهێنیت، تۆ هیچ نازانیت." بێ هیواییەکەم گەشتبووە ڕادەیەک کە شەوان دەچوومە ناو جێگاکەوە، ئاواتم دەخواست بەیانی خەبەرم نەبێتەوەو ئاواتم بە مردن دەخواست. ناخۆشترین چرکەساتەکانی ژیانم بوو.

بەڵام ئیستا پاش ئەو هەموو ساڵە، کە ئاوڕئەدەمەوە و بیردەکەمەوە، ئەو ڕۆژانەی من پێیان دەڵێم ڕۆژە ڕەشەکانی ژیانمان، ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی پرۆسەی فێربوونمان بوون. ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی دروستردنی کەسایەتمان بوون. دەتوانم بڵێم باشترین پرۆسەی ژیانمان بوو. کاتێک لە پرۆسەی فێربووندا بووین، گومانم هەبوو لەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو پرۆسەیە کۆتای پێبێت. بەڵام بە هاوکاری هەردووکمان و هەوڵدانی زۆر توانیمان سەرکەوتووبین. ئێستا دەزانین کە چەند سوود و ئەزموونمان لەو ڕۆژانە وەرگرت.

لە ئەنجامدا ئەو ڕۆژە قورسانە وەک تاکێک زیاتر بەهێز و زیرەکی کردین، وەک دوو هاوسەریش کردینی بەم (کیم و ڕۆبێرت)ەی ئێستا.

بۆیە منیش دڵنیات دەکەمەوە، تۆش لە کاتی تێپەڕبوون بە پرۆسەکەی خۆتدا، توشی هەڵە دەبیت، هەندێکجار هەڵەی زۆر گەورەش. توشی ناڕەحەتی زۆر دەبیتەوە، هەندێک کات پرۆسەکە زۆر سامناک و ترسناکە. وە هەندێک جار دەبێت بڕیاربدەیت بێ ئەوەی هیچ بەرچاو ڕوونیەکت هەبێت، ئەمە ئەو کاتەیە کە بەهێزی کەسایەتیان تاقیدەکرێتەوە. ئەگەر لە ناڕەحەتی و ناخۆشیەکە ڕابکەین ئەوە ناتوانین هیچ فێربین. بەڵام ئەگەر بەرەو ڕووی ببینەوە، ئەوە یەک دنیا ئەزموون و زانیاری لێوەفێردەبین. وە ئەو دەستکەوتەش بە هیچ بڕە پارەیەک ناخەمڵێنرێت و دەست ناکەوێت.

## بەشی نۆیەم
## چۆن ڕادەی زیرەکیمان زیادبکەین؟

لیسلی: من مەبەستم ئەوە نییە کە زیرەک نیم و هیچ نازانم، بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە کە من هیچ دەربارەی ئەو شتانە نازانم و هەرگیز فێرنەکراوم. لە ژیانما کەس پێی نەوتوم کە خۆم فێری ئەو شتانە بکەم و هەولی فێربوون و خۆ ڕۆشنبیرکردنی دارایی بکەم. ئێستا کاتی دەستپێکردنەوە و پێویستە هەنگاو بە هەنگاو پرۆسەکە ببرم.

کیم: ڕێک وایە.

لیسلی: با شتێکت پیبلێم، چەند جارێک ویستوومە سەیری پرۆگرامە داراییەکان بکەم، بەلام کاتێک دانیشتووم بە دیارییەوە یەک وشەی لێتێنەگەیشتووم و هیچ سەر و دەرم لێنەکردووە. زۆر قورسە بەردەوام بم لە سەیرکردن کاتێک هیچی لێتێناگەم.

٣ : Jargon

کیم: خاڵێکی زۆر باشت بیرهێنامەوە، ئەمە ڕێک خاڵی سێهەمە کە دەمەوێت باسی بکەم، پێی دەوترێت جارگۆن، کۆمەلیک زاراوە ودەستەواژەی دارایی تایبەت بە پارەن.

ڕاستە زۆر جار کاتێک گوێ لە کەسێکی شارەزای بواری دارایی دەگرین ، ئەم وشە و دەستەواژانە بەکاردەهێنێت و ئێمەش هیچی لێ تێناگەین، بۆیە هەست بە بێزاری دەکەین. هەندێکجار ئەو کەسانە بە ئەنقەست بەکاریدەهێنن بۆ ئەوەی وا خۆیان دەبخەن کە شارەزان لەو بوارەدا. ئێمەش هەندێکجار وا خۆمان دەردەخەین کە تێدەگەین لێیان چونکە پێمان شەرمە پێیان بڵێن کە تێناگەین لەو زمانەی ئەوان بەکاریدەهێنن، هەر بۆیە هیچ سوود لە گفتوگۆکە نابینین. جار هەبوو لەگەل کەسانی شارەزای ئەو بوارە قسەم

کردووە، وشەی وای بەکارهێناوە کە تەقەی سەرم هاتووە، بەڵام هیچ خۆم تێکنەداوە و خۆم وا دەرخستووە کە تێدەگەم، لە بری ئەوەی داوای ڕوونکردنەوەی لێبکەم چونکە ترساوم بە گێل و هیچ نەزانم بزانێت.
پێم خۆش نییە دانی پیابنم، بەڵام هەر دوو مانگ پێش ئێستا بەسەرم هات.
لێسلی دایە قاقای پێکەنین و وتی: با بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێرمەوە، ڕۆژێک چووم بۆ مەراسیمی کردنەوەی ڕێستۆرانتێکی ئیتاڵی، خاوەنی ڕێستۆرانتەکە یەکێک بوو لە کڕیارەکانی گەلەریەکەم. لەوێ بەشداریم کرد لەگەڵ گروپێک کە گفتوگۆیان دەکرد دەربارەی بازاری ئاڵوگۆڕ. هەموویان زۆر دڵخۆش بوون و زۆر بە دڵخۆشیەوە باسی کۆمپانیا تازەکەیان دەکرد کە تازە بنیادنرابوو. هەموویان باسی ئەوەیان دەکرد کە کۆمپانیاکە جێگەی مایکرۆسۆفت دەگرێتەوە ئەوەنە بلیمەتە. وە لە ئێستاوە چەندین کەس پشکی لەو کۆمپانیایە کڕیوە. هەموویان زۆر شانازیان بە خۆیانەوە دەکرد کە خاوەنی پشکن لەو کۆمپانیایە، وە لە کاتی قسەکانیان هەندێک زاراوە و ڕستەیان بەکاردەهێنا کە هیچ لێیان تێنەدەگەیشتم و ئەووت وورێنە دەکەن بۆم. منیش ڕووم نەدەهات پرسیار بکەم، دەمووت ئێستا پێم دەڵێن ئەمە زۆر گێلە. هەر بۆیە منیش نەمکردە نامەردی و ڕۆژی دواتر چووم پشکم کڕی. ئەمەی کە باسی دەکەم، دوو مانگ پێش ئێستا بوو. بەڵام چی بێت لە ئێوە نهێنی ئیشتا نیوەی نرخی خۆشی ناکاتەوە و وە داهاتووی کۆمپانیەکەش هیچ دیار نییە و لەوانەشە هەر دابخرێت.
کیم دایە قاقای پێکەنین و وتی: هەڵە نەبم ئەو زاراوانەی کە تۆ لێی تێنەگەیشتووی باسی ڕێژەی قازانج بووە، ڕێژەی قازانج بەراوردی

نرخی پشکەکان دەکات بە قازانجی ساڵانی ڕابردووی کۆمپانیا. وە ئەو کۆمپانیایەی باسیشی دەکەیت کۆمپانیایەکی بواری ئەلیکترۆنیاتە و تا ئێستا هیچ ئۆفیسێکیشیان نییە، تەنها لەڕێگەی ئۆنلاینەوە کاردەکەن.

منیش هەمان حاڵەتی تۆم بەسەرهات. جارێکیان پشکم کڕی لە بازاڕی ئاڵوگۆڕ. سەرەتا بڕوام بەهەموو پەیمان و قسەکانیان کرد چونکە هیچ لە قسەکانیان تێنەدەگەیشتم، نەمدەزانیی قسەکانیان ڕاستە یان نا. وە خۆشیان وا دەردەخست کە زۆر شارەزان. هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر پشکم لیکڕین. بەڵام دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کۆمپانیاکە لە ژێر لێکۆڵینەوەدایە و خاوەنەکەشی لە بەندیخانەیە. هەر بۆیە پارەکانی منیش تۆ خۆش. هەموو ئەو زەراوانەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە پێم شەرم بوو پێیان بڵێم کە لە قسەکانیان تێناگەم و داوای ڕوونکردنەوە بکەم.

لێسلی ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: بەداخەوە بۆ ئەو زەرەرەی کردووتە. بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت کە هەموو جارێک ناتوانی سەرکەوتوو بیت، هەندێک جار دەبێت شکست بهێنیت بۆیە دەرسی لێوەربگریت. وە بۆم دەرکەوت من یەکەم کەس نیم کە توشی ئەو زەرەرە بووم بە هۆی ئەوەی لێیان تێنەگەیشتووم.

کیم: جارێکیان ڕۆبێرت چاوپێکەوتنی هەبوو لە یەکێک لە کەناڵە تەلەفیزیۆنیەکانی نیویۆرک. پێشکەشکارەکە هەوڵی دەدا وشە و زاراوەی قورس بەکاربهێنێت و خۆی وا دەربخات کە زۆر شارەزایە. بەڵام ڕۆبێرت وەستاندی و پێیوت کە پێویستە وشەکان سادە و ئاسان بن تا هەموو کەس لێیان تێبگات. ڕۆبێرت تا کۆتای پرۆگرامەکە بە زمانێکی سادە و ساکار گفتوگۆی دەکرد. دوای پرۆگرامەکە، کاتێک دەهاتینە دەرەوە پیاوێک ڕێکپۆشی تەمەن ٢٩

سالان لە ڕیگا توشمان بوو و تەوقەی لەگەل ڕۆبێرت کرد و وتی "چاوپێکەوتنەکەی ئەم بەیانیەتم بینی، دەمەوێت سوپاسێکی تایبەتت بکەم لەسەر ئەوەی زمانی گفتوگۆکردنەکەت زۆر سادە و ڕەوان بوو، هەموو کەس لێت تێدەگەیشت." شایەنی باسە پیاوەکە خۆی لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی بواری دارایی کاری دەکرد، ئەویش پێی باش بوو بە زمانێک قسەبکرێت کە هەموو کەس تێبگات.

لێسلی: ئۆخەی! ئێستا هەست بە ئاسوودەیی دەکەم. دڵنیام ژمارەیەکی زۆری خانمان وەکە من بیردەکەنەوە و پێیان وایە بای ئەوەندە زیرەک نین کە کار و ئیشی خۆیان هەبێت و وەبەرهێنا بکەن تەنها لەبەر ئەوەی لە زمانی دارایی تێناگەن.

بەڵام ئەم گومانانە هیچ ئەسڵ و ئاساسی نییە، ئەوەی پێویستە لەسەرت بیکەیت تەنها ئەوە دەستبکەیت بە پرۆسەی فێربوون، و بە پێی کات خۆت فێر دەبیت. کیم ئەمەوێت سوپاست بکەم بۆ ئەو کاتەی پیت بەخشیم، زۆر شتم بۆ ڕوون بۆوە. کەی دەگەڕێیتەوە بۆ نیو یۆرک؟

کیم: بە نزیکەیی، دوو مانگی تر.

لێسلی: زۆر باشە، ئەگەر کاتت هەبوو پێم خۆش دەبێت بتبینم، بەڵام ئەمجارە نیوەرۆخوانەکە لەسەر منە.

**چۆن دەزانیت کە تێنەگەیشتوویت؟**

کیم: تەکنیکێکی زۆر باش فێربووم لە هاوڕێیەکمەوە کە شارەزایە لە بواری فێرکردندا. جارێکیان پرسی لێم " هەرگیز ڕووی یاوە دەقێک چەند جارێک لەسەر یەک بخوێنیتەوە و لێی تێنەگەیت؟"

منیش وتم بێگومان بەڵێ، زۆر جار ئەوەم بەسەرهاتووە .

وتی: کاتێک دەقێک دەخوێنیتەوە و لە پڕ وشەیەک دێتە بەردەمت و تۆش ماناکەی نازانیت، بەڵام گوێی نادەیتێ و دەیپەڕێنیت و بەردەوام دەبیت لە خوێندنەوە، ئینجا ئیتر وردە وردە تەرکیزت لەسەر دەقەکە نامێنێت و چەند جارێک دەبێت دەقەکە بخوێنیتەوە بۆئەوەی لە مانای دەقەکە تێبگەیت .

منیش لێم پرسی کە چۆن چارەسەری ئەوە بکرێت، ئەویش لەوەڵامدا وتی: چارەسەرەکەی زۆر ئاسانە. کاتێک دەخوێنیتەوە، هەر وشەیەک هاتە بەرچاوت و لێی تێنەگەیشتی، لەو خاڵەدا بوەستە و بە دوای واتاکەیدا بگەڕێ لە فەرهەنگێکدا. بەردەوام بە و هەر وشەیەک هاتە بەرچاوت و لێی تێنەگەیشتی هەمان ڕێگا تاقیبکەرەوە. بەم شێوەیە باشتر لە واتاکەی تێدەگەیت. هەر بۆیە لە کاتی خوێندنەوەدا هەوڵ بدە فەرهەنگێک لە نزیک خۆتەوە دابنێ. هەندێکجار هەمان تەکنیکی مامۆستا بەکاربهێنە کە وشەی پێدەخستینە ڕستەوە، بۆئەوەی وشەکە بچەسپێت لە میشکماند. کاتێک وشەیەکی تازە فێردەبیت، وشەکە بخەرە ڕستەوە و چەند جارێک دووبارەی بکەرەوە، بەم شێوەیە وشەکە باشتر و خێراتر فێردەبیت .

**تێگەیشتنی زیاتر = ئەنجامی باشتر!**

کیم: جارێکیان لەگەڵ دەلاڵێکی بواری وەبەرهێناندا قسەم دەکرد، باسی باڵەخانەیەکی بۆ دەکردم، دەیووت تا جارگۆن زیاتر بێت، ئەوە مامەڵەکەت باشتر دەبێت. منیش لێم پرسی "ئەو وشەیە بە مانای چی دێت؟ چۆن ڕێژەکەی زیاد بکەم؟ "

سەیرێکی کرد، پەشۆکاوی پیوەدیاربوو، بەشڵەژاویەوە وتی: واز لەوە بهێنە، ئەوە زۆر گرنگ نییە، ئەوەی گرنگە، مامەڵەی کڕینی باڵەخانەکەیە.

لەوەوە بۆم دەرکەوت کە تەنانەت کاکی دەلاڵ خۆشی نەیدەزانی چی دەڵێت، ئەو وشانەی بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی خۆی بنوێنێت و شارەزا خۆی دەربخات.

**سێ یاسای سادە و ئاسان بۆ چارەسەرکردنی تێنەگەیشتن لە دەستەواژە و وشە داراییەکان:**

وشە و زاراوەکانت زیادبکە: کاتێک گفتوگۆ لەگەل کەسێک دەکەیت و وشەیەک بەکاردەهێنێت کە تۆ لێی تێناگەیت، ئەوە دەست بەجێ پرسیار بکە و داوای ڕوونکردنەوە بکە. یان وشەکە بنووسە و دواتر بۆ ماناکەی بگەڕێ. یان کاتێک سەیری تەلەفیزیۆن دەکەیت، گوێت لە وشەیەک دەبێت و ماناکەی نازانیت، خێرا لە فەرهەنگ بۆ واتاکەی بگەڕێ.

پرسیار بکە: هەمیشە پرسیار بکە، تەنانەت ئەگەر زانیاریشت لەسەر بابەتەک هەبوو، هێشتا هەوڵی پرسیارکردن بدە. لە کاتی پرسیارکردندا، دوو سوودت دەست دەکەوێت. یەکەم: پەیوەندی لەگەل کەسی بەرامبەرت دروست دەکەیت، ناڕاستەوخۆ پێی دەڵێیت کە حەزت لە گفتوگۆکەیە. دووەم: زانیاری زیاتر فێردەبیت.

هەرکاتێک پێویستی کرد، خۆت لە گێلی بدە: شەرم مەکە لەوەی هەندێک کات بڵێی نازانم. سەرەکیترین هۆکار کە ڕێگرە لەبەردەم پرۆسەی فێربووندا ئەوەیە وا خۆت دەربخەیت کە دەزانیت لە کاتێکدا نازانیت. ئەوەی باشە ئێمەی خانمان شەرم ناکەین کە بڵێین نازانین و زانیاریمان نییە، کەسیش لۆمەمان ناکات، چونکە فێری ڕۆشنبیری دارایی نەکراوین.

هەر کاتێک وشەیەکی نامۆت بیست، مەهێڵە ببێتە کۆسپ لەبەردەم فێربوونت، خێرا لە فەرهەنگ بۆ واتاکەی بگەڕێ. لەبری

ئەوەی بێتاقەت بیت و قەلەق بیت، دەبێت دڵخۆش بیت، چونکە وشەیەکی تازە فێربوویت و زانیاریەکانت زیاتردەبێت، وە ئامادەت دەکات بۆ ئەوەی ببیتە وەبەرهێنەرێکی سەرکەوتوو و زیرەکتر.

## بەشی دەیەم

## زۆر دەترسم!

**کورتە باسێک دەربارەی ترس**

شتێکی حاشا هەڵنەگرە کاتێک دێتە سەرباسی وەبەرهێنان کردن ترس باڵدەکێشێت بەسەرماندا. پرسیارێک کە زۆر لێم دەپرسن ئەوەیە "کە چۆن زاڵبین بەسەر ترسدا؟" هەر کاتێک ترست هەبوو لە دەستکردن بە پڕۆژەیەک، ئەوە بزانە کە تۆ تاکە کەس نیت، ئەو ترسە زاڵە بەسەر زۆربەماندا.

**باشی و خراپی ترس چیە؟ چی لە ترسەوە فێردەبین؟**

سەرەڕای زەرەرەکانی ترس، لە هەمان کاتدا سودیشی هەیە. ترس ئاگادارت دەکاتەوە لە ئەنجام و هەڵەی کوشندە. بۆ نمونە کاتێک لە نیوەی شەودا گوێت لە تەقەتەقێکە، ئەوە یەکسەرگومان دەکەیت کە لەوانەیە یەکێک دزەی کردبێتە نێو ماڵەکەت و تۆش خێرا هەوڵی خۆپاراستن دەدەیت. یان بۆ نموونە کاتێک لە پارکێک پیاسە دەکەیت، لە پڕ ڕێگایەکی تاریک دێتە ڕێت، لەو کاتەدا ڕێگاکەت دەگۆڕیت و دەزانیت سەلامەت نییە. یان بۆ نموونە لە کەشێکی تەماویدا شۆفێری دەکەیت، ترس وات لێدەکات بەردەوام نەبیت، و لە قەراغ ڕێگاکە ئۆتۆمبێکەکە بوەستێنیت تا تەمەکە کەم دەبێتەوە، لەم کاتەشدا ترس سودی هەبوو.

هەروەها دیوێکی دیکەی ترس هەیە، ئەمەیان مەترسیدارە و ڕووخێنەرە و دەبێتە بکوژی خەونەکان و هەلەکان و ڕێگرە لە گەشەکردن و بەرەوپێشچوونمان.

کەمێک ترس دەتوانێت بتوەستێنێت لە ئەنجامدانی هەڵەی کوشندە، لەم کاتەدا ترس سودی هەیە.

ترسی ڕوخێنەر ئەوەیە کە دەست و قاچی بەستویەتەوە و ناهێڵێت هیچ هەنگاوێک بەرەو پێشەوە بنێیت و توشی شەلەلت دەکات. وات لێدەکات کە هەر هەلێکت بۆ هاتە پێشەوە، ئۆتۆماتیکی تۆ ڕەتی دەکەیتەوە، بێ ئەوەی هەڵی بسەنگێنیت. وامان لێدەکات تەنها لایەنە خراپەکانی ئەو هەل و دەرفەتە ببینین، هەموو تەرکیزمان بۆ زەرەر و خاڵە نەرێنیەکانی کارەکە دەبات.

لەم کاتەدا هێندە لە کردنی هەڵە دەترسین، تۆقیوین. بۆیە بڕیاری نەکردنی دەدەین لەبری ئەوەی بیربکەینەوە کە چۆن نەکەوینە هەڵەوە. بۆیە لەم شەڕەدا ترس براوە دەبێت و ئێمەش دۆڕاو.

**کەواتە بۆچی ڕێگە دەدەین ترس زاڵبێت بەسەرماندا؟**

دوو هۆکار هەیە کە وامان لێدەکات ترس زاڵبێت بەسەرماندا.

**"ژیانم لە ناو دەبات."** :یەکێک لە ئیشەکانی مێشک ئاگادارکردنەوەمانە لە هەڕەشەکانی سەر ژیانمان. بەڵام هەندێکجار مێشک ئاگادارمان دەکاتەوە لە هەندێک هەڕەشە کە مەترسی نین بۆ سەر ژیانمان، وەک ئەم قسانەی خوارەوە:

" وەبەرهێنان کردن مەترسیدارە، هەموو پارەکەم تیادەچێت، هیچم بەدەستەوە نامێنێت، ئەکەومە سەر ساجی عەلی. باشە ئەی ئەگەر نەمتوانی کرێ بدەم؟ ئنجا نۆرەی ئەوەمە بانکیش دەست بەسەر خانووەکەمدا بگرێت و بکەومە سەر جادەکان و بێ ماڵ و

حاڵیش بم! من لەو کەسانە نیم قەرزاری خەڵک بم. حەیام ئەچێ خەڵک بێت و داوای قەرزەکەی بکاتەوە. ژیانم لەناو دەچێت، شتی وا ناکەم."

ئەمانە هاندێک جار مێشک دروستی دەکات بۆت و توشی قەلەقیت دەکات. واتە ئەگەر وەبەرهێنان بکەین ژیانمان لەناو دەچێت؟ بێگومان نەخێر! مێشک ئەم وەڵامانەت بۆ ئامادەدەکات و تۆش ئاقڵانە بەگوێی دەکەیت و ترس بەسەرتدا زاڵ دەبێت.

هەرکاتێک ئەم بیرکردنەوانە هات بە مێشکتدا لە کاتی دەستکردن بە کارێک یان تاقیکردنەوەی شتێکی تازە، ئەوە بزانە ئەوانە تەنها خەیاڵی خۆتن و هیچ بارودۆخێکی ناهەموار لە ڕێ نییە. دانیشە بە وردی بیر لە باشی و خراپیەکانی ئەو دەرفەتە بکەرەوە کە هاتۆتە بەردەمت، هەڵیسەنگێنە. بیر بکەرەوە خراپیەکان چین و چۆن دەتوانیت چارەسەریان بکەیت. واتە ئەو بیرۆکە بێ سوودانە لە مێشکت لابەرە کە دەتترسێنێت.

"**ترس وەک بیانوویەک**": هۆکارێکی دیکەی ئەوەی کە ترس دەتوانێت زاڵبێت بەسەرتدا ئەوەیە کاتێک دەستدەکەین بە تاقیکردنەوەی شتێکی تازە، خۆنەویستانە قەلەقیەکمان بۆ دروست دەبێت، بۆیە لەم کاتەدا تەمەڵ دەبین و ترس دەکەین بە بیانوو.

یان کاتێک قسە بۆ کۆمەڵە خەڵکێک دەکەیت لە سیمینارێک یان کۆڕێک. شارەزایان دەڵێن ترس لە قسەکردن پلەی یەکەمی هەیە لەنێو جۆرەکانی ترس کە خەڵک لێی دەترسن. لە کاتی قسەکردن لە کۆڕێکدا، دەترسیت و نازانیت چۆن زاڵبیت، بۆیە ئاسانترین ڕێگە چارە ئەوەیە نەچیت بۆ کۆڕەکە و قسەنەکەیت. واتە لەم کاتەدا ترست کرد بە بیانوویەک لەجیاتی ئەوەی بەسەریدا زاڵبیت.

ئەوەی کە قورسە چۆنیەتی زاڵبوونە بەسەر ترسەکەدا. بۆیە لەم کاتەدا بڕیاربدە زاڵبیت بەسەر ترسەکەدا لەبری ئەوەی تەمەڵی بنوێنیت و وازی لێبێنیت. لەم کاتەدا، قسەکان بنووسە و پراکتیز بکە چەند جارێک یان بەشداری چەند کۆرسێک بکە لەسەر چۆنیەتی زاڵبوون بەسەر ترسدا. دوای ئەم هەنگاوانە بوێر بەو بچۆ سەر ستەیج و دەست بکە بە قسەکردن. بەم شێوەیە دەتوانیت زاڵبیت بەسەر ترسەکەدا، بەڵام بە خۆدورخستنەوە و ڕاکردن لێی، ئەو کاتە خۆت بچووکدەکەیتەوە لە چاو ترسەکەدا.

ئێستا بیربکەرەوە کە هیچ کات هەبووە کە هەلێکت هاتۆتە بەردەم و تۆش ترس دایگرتوویت و نەوتوانیوە سود لەو دەرفەتە وەربگریت، بەڵام ئێستا پەشیمانی و ئەگەر کاتی خۆی نەترسایتایە ئێستا ژیانت بە چەشنێکی تر دەبوو؟ لەوانە ئەو هەلە کڕینی شووقەیەک بووبێت، یان دەستکردن بە پرۆژەیەکی خۆت، یان هەر شتێکی ژیانت. بەڵام ترس بووە بە بیانوویەک بۆ ئەنجام نەدانی. ئەگەر لەو کاتانەدا چاونەترس نەبیت، دەبێت تا ماویت لە شوێنی خۆت بمێنیتەوە ئەگەر بەرەو دواوەش نەچیت چونکە لە دنیای ئەمڕۆدا زۆر بەخێرای شێوازی ژیانمان دەگۆڕێت، دەبێت بەردەوام لە هەڵپەدا بین بۆ گەیشتنەوە پێی. بۆیە کاتێک بژاردەیەک هەڵدەبژێریت، یان ژیانت بەرەو پێش دەبات یان بەرەو دواوەی دەبات، واتە ناتوانین بڵێین وەک خۆی دەمێنێتەوە.

**ترس وەک پارەهێنێک:** ترس دەکرێت ببێتە پارەهێنێکی زۆر باش، هەر کاتێک ترست هەبوو و بۆت دەرکەوت، مەترسیەکی کوشندە لە پێش نییە، ئەو کاتە قۆڵی لێهەڵبکە و هەلەکە بقۆزەرەوە و ژیانت باشتر بکە.

هەمیشە ترس وەک بەرەوپێشخەرێک ببینە نەک وەک کۆسپ و ڕێگرێک لەبەردەم گەشەکردن و بەرەوپێشچوونت. زیاتر بیر لە تام و چێژی سەرکەوتن بکەرەوە وەک لە ترسی شکست. ڕاڵف واڵدۆ دەڵێت: "ئەو کەسەی هەموو ڕۆژێک ڕووبەڕووی ترس نابێتەوە، ئەوە هیچ لە ژیان تێنەگەیشتووە."

**دوو جۆرەکەی ئازار**

ئەو ڕستەیەی کە لەبەساڵاچوویەکەوە گوێم لێدەبێت و زۆر خەمبارم دەکات ئەوەیە کاتێک گوێم لێدەبێت دەڵێت "خۆزگە فلان شتم بکردایە، خۆزگە.... هتد." ئێستا درک بەوە دەکەن کە ئەگەر بە پیر ئەو هەلانەوە بچوونایە ئەوە ئێستا کەسێکی تر بوون. بەڵام بەهۆی ترسەوە نەیانتوانیوە بیقۆزنەوە. لەوانەیە ترسەکەیان ترس بووبێت لە شکست، لە خراپبوونی ژیانیان، لە لەدەستدان، لە بەکەم سەیرکردن و گاڵتەپێکردن. هەر کام لەم ترسانە بووبێت، هیچ جیاوازی نییە، ترسەکە هێندە زۆربووە، زاڵبووە بەسەر چێژ و خۆشی سەرکەوتن.

تۆنی ڕۆبنس لەیەکێک لە سیمینارەکانی باسی دووجۆر ئازار دەکات، ئازاری شکستهێنان، ئازاری پەشیمانی.

من وەک خۆم پێم باشە ئازاری شکست بچێژم وەک لەوەی ئازاری پەشیمانی بچێژم! بۆ من ناخۆشترین ئازار، ئازاری پەشیمانییە. پێم باشە چاونەترس بم، نەک ترسنۆک بم. هەر کاتێک بیر لەو هەلانە دەکەمەوە بەهۆی ترسەوە لە دەستم داون، ئازاری پەشیمانی خەریکە دەمخنکێنێت.

بۆ زۆرینەی خانمان ئەو ئازاری پەشیمانییە، ئازاری وازهێنانە لە کارەکانیان، یان ئازاری پەشیمانی بۆ ئەوەی کە ڕێگەیان داوە

کارەکانیان کاربکاتە سەر ژیانی خێزانیان یان بەردەوامیدان بە ژیانی هاوسەرگیریەک کە هیچ ئاسوودەنەبوون تیایدا.

جۆرێکی تری ئازاری پەشیمانی، کە هیوادارم هیچ کەسێک نەیچێژێت، ئازاری پەشیمانیە بۆ ئیهمالکردنی حەز و ئارەزووە داراییەکانمان وە هێنانی کەسێکی تر کە لەبری ئێمە بڕیاربدات بۆمان.

گومانی تێدا نیە زاڵبوون بەسەر ترس و چاونەترسبوون گۆڕانکاری گەورە دروستدەکات لە ژیانماندا. هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە هەر کاتێک بوێربووین و چاونەترسیمان هەڵبژارد، ئەوە ئێمە براوەین و سەرکەوتن چاوەڕێمان دەکات.

**کاتی بوێری و چاونەترسی**

بێگومان هەریەکەمان ئەگەر بیربکەینەوە ڕووداوێکمان بەسەرهاتووە کە توانیمانە ئازایانە ڕووبەڕووی ببینەوە، یان ئەگەر بەسەرخۆشمان نەهاتبێت ئەوا لەو چەشنە نموونەمان بینیوە. لەم ڕۆژانەی پێشوودا کچێکی حەوت ساڵانم بینی، چەند یادگارییەکی بیرخستمەوە. کیژۆڵە حەوت ساڵانەکە هەوڵی دەدا لە بەرزاییەکەوە خۆی هەڵبداتە مەلەوانگەکەوە.

کیژۆڵەکە دیاربوو یەکەم جاریەتی ئەم کارە دەکات. منیش بەردەوام بووم لە تەماشاکردنی. کیژۆڵەکە بەردەوامبوو لە هەڵگەڕان بەسەر پەیژەکەدا، کاتێک گەیشتە ڕێڕەوی خۆهەڵدانەکە، لە کۆتای ڕێڕەوەکەدا وەستا و لە ڕێڕەوەکە وورد دەبوویەوە. پاشان وردە وردە هەنگاوی دەنا بەرەو خاڵی خۆهەڵدانەکە، کاتێک سەیری خوارەوەی دەکرد، مەلەوانگەکە زۆر قوڵ و دوور دەردەکەوت لە خاڵی خۆهەڵدانەکەوە، قاچەکانی دەلەرزین لە

ترسـدا. لەو کـاتەدا تەنهـا دوو بژاردەشـی لەبەردەمـدا بـوو، یـان دەبـوایە کـارەکە ئەنجامبـدات کە بـۆ ئەو مەبەسـتە هـاتبوە مەلەوانـگەکە، یـان دەبـوایە بـگەڕایەتە دواوە و وازی بهێنـایە و بیوتایە کە ناتوانێت خۆهەڵدانەکە ئەنجام بدات.

پاش دوو خولەک لە وەستان و تێڕامان، بریاری دا خۆهەڵدانەکە ئەنجـام بـدات و چاونەترسـانە رووبەڕووی ترسـەکە ببێـتەوە. چاوەکانی داخسـت و هەناسـەیەکی قوڵی هەڵکێشا و پاشـان خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە.

کاتێک خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە شەپ و شۆڕێکی زۆری دروست کرد، پاشـان سـەری لە ئاوەکە دەرکرد، دەمووچاوی دەگەشایەوە لە خۆشیدا و زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی بوو هاواری دەکرد " توانیم خۆم بازبدەم!" هەرچەندە لەسـەرەتادا زیرەی مەرگی کردبوو، بەڵام دواتـر تـوانی زاڵ بێت بەسـەر ترسـەکەیدا و سـەرکەوتوبێت. دواتر دووبارە و سێ بارە بە پەیژەکەدا سـەردەکەوت و خۆی هەڵدەدایە نێو ئاوەکەوە.

نموونەی ئەو کیژۆڵەیە هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ من و تـۆدا ، لەوەنەیە حـاڵەتەکە جیـاواز بێت، بەڵام ڕێـژەکەی ترسـەکە هەمـان ڕێژەیە ئیتر بۆ خۆهەڵدان بێت یان هەر شتێکی دیکە.

**چۆن بەسەر ترسەکەمدا زاڵبم؟**

کاتێک باسی وەبەرهێنان کردن ئەکەین، یان دەمانەوێت دەست بکەین بە وەبەرهێـنان کردن و لەو بـوارەدا کـار بکەین، واتە ئیش کـردن لە دنیـایەکی تـا ڕادەیەکـی زۆر نـامۆ بە دنیـاکەی پێشـتر، دنیـایەک کە هـیچ زانیاریەکمـان دەربـارەی نییە چـونکە هـیچ ئەزموونێکمـان تێدا نیە. پرسـیارمان زۆرە و وەڵامـمان بۆی نییە.

پرۆسەیەک کە پڕە لە هەوراز و نشێوی، ئەگەری ئەنجامدانی هەڵەکردنمان زۆرە. لە هەمووی مەترسیدارتر ئەوەیە ئێمە یاری بە پارەوە دەکەین.

لەبەر ئەوەیە لەوانەیە چەند جۆرە ترسێکمان بۆ دروستببێت، لەوانەیە ترس بێت لە لەدەستدانی هەموو پارە و سامانەکەمان، یان ترس لە ئەنجامدانی هەڵەی کوشندەو ماڵوێرانکەر. لە ڕاستیدا ترس لە ئەنجامدانی هەڵە ترسێکە نابێت هەر بوونی هەبێت، چونکە هەڵەکردن شتێکی زۆر ئاساییە و هەموومان توشی هەڵەدەبین. یان لەوانەیە ترسی بۆ دروست ببێت لە مایەپوچبوون و بێ ماڵ و حاڵ بوون و کەوتنە سەر جادەکان و ببیت بە گاڵتەجاری خەڵک. ئەم جۆرەیان زۆرینەی خانمان ترسیان لێی هەیە. هەر کام لەم ترسانەبێت، ترس هەر ترسە و هیچ جیاوازیان نییە و بۆت دروست دەبێت لە کاتی دەست کردن بە وەبەرهێنان کردن.

یەکێک لە ڕێگا کاریگەرەکان بۆ کەمکردنەوەی ئەم جۆرە ترسانە، خۆڕۆشنبیرکردن و پەروەردە و پەیداکردنی ئەزموونە. ئەمەم زۆر باس کردووە. تا زانیاری زیاتر کۆبکەینەوە لەسەر کارەکە، بە ئاسودانەتر و وریایانەتر دەتوانین بڕیاربدەین و توشی هەڵەنەبین. تا زیاتر ئەزموونت هەبێت لە وەبەرهێنان کردندا، واتە زانیاری زیاترت پێیە و ئەو کاتە هەستی متمانەبەخۆبوونت زیاد دەکات.

لەبەر ئەم هۆکارانە، هەر کاتێک ئەزموون و زانیاریت باشت پێبوو، ئەوکاتە ترس ڕۆڵێکی کاریگەر نابینێت.

## ڕاهێنانێک کە ژیانت دەگۆڕێت

**هەریەکە لە ئێمە ڕۆژێک لە ڕۆژان ترساوین، بۆیە ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە چۆن خۆمان لەو ترسە ڕزگار بکەین؟**

جارێکیان بەشداری کۆرسێکم کرد دەربارەی چۆنیەتی زاڵبوون بەسەر ترسدا. کۆرسەکە لە ڕێگەی ڕاهێنانێکەوە هەوڵیان دەدا ڕامانبهێنن بەسەر ترسدا زاڵبین. ڕاهێنانەکە بەم جۆرە بوو، دەبوایە بەسەر پارچە تەختەیەکی بارییکدا بڕۆشتیتایە و هاوسەنگی خۆت بپارێزیت و نەکەویتە خوارەوە و دواتر کە گەشتیتە خاڵی کۆتای دەبوایە خۆت هەڵبدایە سەر تەنافێک و لە ڕێگەی تەنافەکەوە بەرەو خوارەوە بڕۆشتیتایە. قورسترین هەنگاو، کاتی خۆهەڵدان بوو بۆ سەر تەنافەکە. کاتێک نۆرەی من هات و بەرەو جەمسەکە هەڵگەڕام، بۆم دەرکەوت ئەو ترسناکە نییە کە من لێی دەترسام، بۆیە بەردەوام بووم تا گەیشتمە خاڵی خۆهەڵدانەکە. کاتێک کاتی خۆهەڵدان هات، زیرەم کردبوو قاچەکانم دەلەرزی لە ترسدا. چەقم بەستبوو لە شوێنی خۆمدا، نەمدەتوانی هەنگاو هەڵبنێم. پاشان ڕاهێنەرەکە بانگی کرد و وتی " چی بووە؟ بۆ لە شوێنی خۆت وەستاویت؟"

کیم: زۆر ئەترسم! چۆن خۆم ڕزگاربکەم لەم ترسە؟

وتی: ناتوانت بڵێیت چۆن ڕزگارم بێت لە ترسەکە، باشترە بڵێی چۆن کۆنتڕۆڵی ترسەکەم بکەم. هەر بۆیە ئێستا بوێربە هەنگاو بەرە پێشەوە بنێ.

هەموو غیرەتی خۆم کۆکردەوە و بڕیارم دا بازەکە بدەم، بۆیە خۆم هەڵدا و توانیم سەرکەوتوو بم و خۆم هەڵبدەمە سەر تەنافەکە. دواتر هەنگاوێکی تر دەستی پێدەکرد دەبوایە لە تەنافەکەشەوە خۆم هەڵبدەم! وتم " ئۆ خوایە گیان، ئێستا چیبکەم!"

دووباره بەهەمان تەکنیکی یەکەم جار توانیم کۆنترۆڵی ترسەکەم بکه و خۆم هەڵبدەم. بەهەمان تەکنیک توانیم له هەموو هەنگاوەکانمدا بەسەر ترسەکەمدا زاڵببم.

پاش تەواوبوونی ڕاهێنانەکه کاتێک هاتمه خوارەوه هەموو جەستەم دەلەرزی، ڕاهێنەرەکه هات بۆ لام و وتی " دەرست لێوەرگرت؟" وتم : یەک به یەکی خانەکانی لەشم سودی لێوەرگرت!"

**ڕووبەڕووبونەوەی ترس له یەکەم کاری وەبەرهێنان**

با منیش باسی یەکەمی کاری وەبەرهێنانی خۆمتان بۆ بکەم. وادەزانی منیش ترسم نەبوو زۆر به ئاسوودەی دەستم پێکرد؟ بێگومان یەک دنیا ترسم هەبوو، هەر تۆقیبووم و زیرەم کردبوو! ساڵی ١٩٨٩ بوو، ڕۆژێکیان ڕۆبێرت وەک فریاد ڕەسێک هات و وتی " کیم کاتی دەستکردنه به کار و پرۆژەی خۆت."

منیش حەپەسام، وتم: چی؟ وەبەرهێنان کرد؟

ڕۆبێرت به کورتی باسی چەند بنەمایەکی باوکی زەنگینی بۆ کردم لەسەر وەبەرهێنان کردن ومولک و خانووبەره، پاشان پێی وتم ئەوەی مایەوه ئیتر لەسەر خۆته چی دەکەیت و چی ناکەیت. سەرەتا زۆر ترسام، ڕێک وەک سەرەتای دەستکردن یاری خۆهەڵدانەکه وابوو، بەڵام بڕیارم دا هەرچۆنێک بێت دەستپێبکەم، ئیترلەو دەقەیەوه پەروەردەی بواری وەبەرهێنام دەستی پێکرد.

ڕۆبێرت پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم سەرەتا هەوڵبدەم خانو و باڵەخانەی بازرگانی بدۆزمەوه و ئیشی لەسەر بکەم، له نزیک ئەو ناوچەیەی که خۆمانی لێدەژیان. منیش پێشنیارەکەم زۆر به دڵ بوو و هەمان شتم کرد. ناوچەیەکی بچووک هەبوو له نزیک

شوێنی نیشتەجێبوونمان، پڕ بوو لە خانووی بچووک و جوان و دڵفڕێن، هەمووشیان حەوشەیەکی بچووکیان هەبوو.

شوێنی جوگرافی ناوچەکە وا هەڵکەوتبوو کە خانوەکان بە دەوری باخێکدا دروست کرابوون، وە پڕ بوو لە دووکانی ئەنتیک وکۆمەڵێک ڕێستۆرانتی جوان و دڵگیر. ئەم دیمەنانە وای لە ناوچەکە کردبوو ببێت بە شارۆچکەیەکی کۆن و ئەنتیک و گەشتیارەکان سەردانی بکەن.

زۆر سەرتان نەیەشێنم، ڕۆژێکیان بە سوتفە بە لای خانویەکدا تێپەڕیم کە نوسرابوو بۆ فرۆشتنە. چووم سەیری خانووەکەم کرد، پێکهاتبوو لە دوو ژووری نووستن و گەرماوێک، وە گەراجێکی بچووک و حەوشەیەکی دڵگیری هەبوو. نرخی خانووەکە ٤٥٠٠٠$ بوو، دەبوایە پێشەکی ٥٠٠٠$. پاشان حساب و کتابی خۆم کرد بۆم دەرکەوت کە مانگانە بڕی ٥٠ بۆ ١٠٠$ قازانجی مانگانەم بوو،واتە پاش هەموو خەرجیەکانی خانووەکە، ٥٠ بۆ ١٠٠$ی تەواوم بۆ دەمایەوە.

لەبەر ئەوەی یەکەمین کارم بوو، بۆیە چەند جارێک سەقف و ئاو و ئاوەڕۆ و هەموو بەشەکانی خانووەکەم پشکنی. زیاتر لە جارێک و لەگەڵ چەند دەلاڵیک قسەم کرد دەربارەی ئەوەی چۆن بیدەم بە کرێ و چەند کرێم بۆ دەکات. بۆیە زۆر سەرقاڵ بووم پێوەی. دوای ئەو هەموو لێکۆڵینەوەیەش، کاتێک هاتە سەر ئەوەی گرێبەستی کرینەکە واژۆ بکەم، دەستەکانم دەلەرزی و زۆر دودڵ بووم. چەند جارێک بە گرێبەستەکەدا چوومەوە و خوێندمەوە. لە دڵی خۆمدا بە خۆمم ئەوت " مەترسە، دەی واژۆی بکە."

چونکە یەکەم کارم بوو، زۆر دەترسام ئەو حساباتەی کردوومە هەڵە دەربچێت و دوای وا نەبێت و زەرەر بکەم. بە خۆمم دەگووت

" من هەموو توانای خۆمم بەکارهێناوە لەم ئیشەدا، ئەی ئەگەر پێشبینیەکانم وا دەرنەچێت؟ ئەی چی بکەم ئەگەر لە حساباتەکەدا هەڵەم کردبێت؟ ئەی باشە ئەگەر خانوەکە کێشەی ئاوارۆی هەبێت خۆ ئەو کاتە قوڕ دەچێت بە سەرمدا. ئەی ئەگەر ئەو ٥٠٠٠$ م زەرەر کرد؟ "

هەموو ئەمانە و زیاتریش لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون کاتێک کە خەریکبوو گرێبەستەکەم واژۆدەکرد.

پاشان ترسەکەم زیاتر بوو، بە خۆمم گوت "وا باشترە دەست لەم مامەڵەیە هەڵبگرم، هەستەکەم ئاوا باشتر بێت، وا باشترە زانیاری زیاتری لەسەر کۆبکەمەوە دواتر بڕیاری کڕینی بدەم، پەلەم کردووە ئێستا هاتووم خەریکە دەیکڕم، ئەگەر باش بوایە بۆ تا ئێستا کەس نەیکڕیووە؟"

هەموو ئەو بیرکردنەوانە بیانوویەکی زۆر باش بوون بۆ ئەوەی مامەڵەکە واژۆ نەکەم و بکشێمەوە، بەڵام دواتر بیری خۆمم هێنایەوە و بە خۆمم وت " تۆ هەموو هەوڵێکی خۆتت داوە و هەموو کون و کەلەبەرێکی خانووەکەت پشکنیوە، ئیتر بۆچی نایکڕیت؟ ئەگەر ئەمجارە دەستپێنەکەیت و بکشێیتەوە، ئەوە تا ماوی ناتوانی هیچ بکەیت. یان هەر ئێستا بیکڕە، یان ئەواتا بە تەمەنت ناتوانی دەست بکەیت بە ئیش و وەبەرهێنان کردن. هەر بۆیە، دواتر غیرەتم یایە بەر خۆم و گرێبەستەکەم واژۆ کرد و ٥٠٠٠$ ەکەم پێشکەشکردن. هەستم بە دڵخۆشیەکی زۆر دەکرد کاتێک بوومە خاوەنی یەکەمین موڵکی خۆم.

هەڵەم کرد لەم ئیشەدا؟ بەڵێ.

باجی هەڵەکەم دا؟ بەڵێ

حساباتەکەم وەک خۆی دەرچوو؟ نەخێر

گرنگترین کاری ژیانم بوو؟ بە دڵنیایەوە بەڵێ!
چونکە یەکەمین کار و ئەزموونم بوو، دەرگای بۆ کردمەوە بۆ دەستکردن بە کاری تر. بۆ پرۆژەکانی دوای ئەوەم هێشتا ترسم هەر هەبوو، بەڵام ئەزموون و زانیاری زیاترم پێبوو.

**چیرۆکی وەبەرهێنەرێک ٠ هەنگاونان بۆ هەنگاوی دواتر٠**

لە خوارەوە چیرۆکی خانمێکتان بۆ باس دەکەم کە سەرەتای کارکردنی ترسێکی زۆری هەبووە، بەڵام ئێستا وەبەرهێنەرێکی زۆر سەرکەوتووی بوارەکەیە.

**چیرۆکی ڤیدا:**

من و هاوسەرەکەم خاوەنی ئیشی خۆمان بووین، سەرەڕای ئەوەی بەردەوام ڕاکە ڕاکمان بوو بەڵام هیچمان دیارنەبوو. هەمیشە گوزەرانمان بەرەو خراپتر دەڕۆی وەک لەوەی باشتر ببێت.

تەمەنم ٤٥ ساڵ بوو، خاوەنی ٥ منداڵ بووین، دوانیان لە کۆلێژ بوون و سیانیشیان لە ماڵەوە بوون. ئاسان نەبوو ئەرکی ماڵ وبەخێوکردنی منداڵ، کاتم نەبوو هەوڵی دەستکەوتنی زانیاری و خۆرۆشنبیرکر بدەم.

هەرچۆنێک بێت بڕیارم دا کە کات تەرخان بکەم بۆ پەروەردە کردنی خۆم لە بواری دارایی، چونکە لە گرنگی بابەتەکە باش تێگەیشتبووم، بۆ ماوەی دوو ساڵ خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بووم. هاوسەرەکەشم پشتگیری دەکردم و بڕیارمان دا من لە بواری خانووبەرەدا ئیش بکەم و ئەویش لە بواری بازاڕی ئاڵوگۆڕدا.

کاتێـک هـاتە سـەر ئەوەی بە کـرداری دەسـتبکەین بە جێبەجێکردنـی بڕیارەکەمـان، ئاسـان نەبـوو. دەبـوایە چەنـد ساڵە هەرچیمان پاشەکەوت کردووە بیدەین بە موڵک و بیخەینە دەستی دەلاڵەوە. زۆر دەترسـام مـایەپوچ بـین و بـێ مـاڵ و حـاڵ بـین. بە بەردەوامی دەنگێک لە ناخمدا دەیترساندم و پەشیمانی دەکردمەوە.

دواتر وەستام و بە خۆمم وت" ماوەی دوو ساڵە پارە لە خۆمدا خەرجدەکەم و زانیاری کۆدەکەمەوە، بۆچی دەبێت ئێستا قەلەق بم و دوودڵ بم؟"

ئێسـتاش کاتێـک بیـری لێـدەکەوە پێکەنیـنم بە خـۆم دێـت، ئەو مـوڵکەی ئەو کـاتە کـڕیم ئێسـتا یەکێکە لە باشـترین موڵکەکـانم و مانگـانە بـێ ئەوەی یەک دەنـک ئەزیەت بکێشـم پـارە دێـتە سـەر هەژماری بانکیەکەم. ئێستاش بەردەوامم لە پەروەدەکردنی خۆم و زانیاریەکـانم نـوێ دەکەمەوە، بـۆیە ئێسـتا بەهـۆی ئەو ئەزمـوون و زانیاریانەی هەمە ئاسوودەترانە دەتوانم وەبەرهێنان بکەم.

# بەشی یانزدەهەم
# " سەروەتەکەت چەندە؟"

بەیانیەکیان سەیری ئیمەیڵەکەم کرد، بینیم ئیمەیلێکم لە (جانیس)ەوە بۆ هاتووە، خێرا کردەوە نوسرابوو " کیم چۆنی؟ جانیسم، بەیانی لە (فینیکس) دەبم، کاتت هەیە نانی نیوەڕۆ بەیەکە بخۆین؟"

منیش وەڵامم دایەوە و نوسیم "چۆنی جانیس، زۆر باشە بەیانی بۆ من گونجاوە، پێم خۆشدەبێت بتبینم و بزانم ئەم ماوەیە چیت کردووە."

دواتر کات و شوێنمان دیاریکرد، و جانیس ئیمەیڵی ناردەوە و نووسیبووی "کیم ئەم ماوەیە هەر بیرم لە قسەکانی ئەو ڕۆژەت کردۆتەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە قسەکانت تێدەگەم، بە تایبەت ئەم ماوەیە کە ئیشەکەم زۆر سەرقاڵی کردووم، حەزدەکەم زوو بتبینم و کەمێک دەردەدڵت بۆ بکەم. بەیانی دەتبینم."

ڕۆژی دواتر کاتی ئەوە هات یەکتری ببینین و کە چوومە شوێنەکە جانیس لەوێ ئامادەبوو پێش کاتی خۆی بۆ یەکەم جار. لەوەوە زانیم کە زۆر بە پەرۆشە قسەبکەین. لەسەر مێزێک دانیشتبوو خەریکی قسەکردن بوو بە تەلەفون لەگەڵ کەسێکی تردا، کە منی بینی خێرا کۆتای بە قسەکانی هێنا و بەرەو پیرم هات و باوەشێکی گەرمی پیاکردم.

بە پێکەنینەوە وتی: زۆر کەشخە و جوانی!"

کیم: بەڕاست! زۆر سوپاس.

جانیس: بەڵێ، جا تۆ هەموو کاتێک هەر جوانیت کچێ.



Scanned with CamScanner

دواتر دەستمان کرد بە قسەکردن و بۆ ماوەی دوو کاتژمێر زیاتر بەردەوام بووین لە گفتوگۆکردن، هیچ خەیاڵمان لای نانەکە نەبوو، تەنها بۆ پڕکردنی گەدەمان جار جار کەوچکێکمان لێدەدا.

**پارە ژیانمی کۆنترۆڵ کردووە**

جانیس: لە دوای گفتوگۆکەی ئەو ڕۆژەمان، هەر بیر لە قسەکانت دەکەمەوە، تازە بۆم دەرکەوتووە کە ژیانم بە جۆرێکی تر دەبوو ئەگەر پێویستم بە پارە نەبوایە. هەرگیز هەستم بەوە نەکردووە کە چەندین جار چەندین شتم لە خۆم مەحرووم کردووە لە پێناو دەستکەوتنی دوو دیناری تردا. بۆ نموونە هەفتەی پێشوو دوو بۆنە هەبوو لە هەمان ڕۆژدا یەکێکیان پێشانگایەک بوو دەمتوانی لەوێ کاڵا و بەرهەمەکانم بفرۆشم، ئەوەی تریان کۆڕێک بوو بۆ چەند کەسایەتیەکی بەناوبانگ من زۆر پێیان سەرسامم و زۆر شتیان لێوە فێربووم، دەبوایە بچوومایە بۆ تەنها یەکێکیان.

کیم: ئێ، ئەی چیت کرد؟

جانیس بە پەستیەکەوە وتی: چووم بۆ پێشانگاکە، بۆ ئەوەی دوو دینار زیاترم دەستبکەوێت. بەڵام ئەوەی زیاتر پەستی کردم ئەوە بوو پێشانگاکە تەنها کات بەفیڕۆدان بوو، چونکە ئەو کەسانەی لەوێ بوون هیچیان کڕیاری کاڵاکانی من نەبوون. بۆیە هیچ بڕیارێکی باشم نەدا. بەڵام ئەگەر بچوومایە بۆ کۆڕەکە لەوێ هەم زانیاریم وەردەگرت لەسەر چۆنیەتی بەرەو پێشچونی ئیشەکەم، هەم ئەو کەسە سەرکەوتوانەم دەبینی کە من پێیان سەرسامم.

کیم: وانەیەکی بەسوود بوو، وایە؟

جانیس: بێگومان! ئاگادارکەرەوەیەکی باش بوو کە ئاگاداری کردمەوە ژیانم بەم شێوە خراپە بەردەوام دەبێت ئەگەر فریای خۆم نەکەوم. بۆم دەرکەوت ئەگەر پێویستم بەئیش کردن نەبوایە و داهاتێکی جێگیری مانگانەم هەبوایە، ئەوکاتە دەمتوانی باشتر بڕیار بدەم کە چی بکەم بۆ داهاتووم باشترە.

یان دوێنێ هەمان شتم بەسەرهاتەوە، کۆبونەوەیەکم هەبوو لەگەل خانمێک کە کار لەو بوارەدا دەکات کە خەونی چەند ساڵەی منە. منیش بەهۆی ئەوەی ئەم ماوەیە فرۆشتنمان کەمی کردووە، دەبوایە لەگەل نوێنەری فرۆشتنەکاندا کۆببمەوە. بۆیە کۆبونەوەکەم لەگەڵ خانمەکەدا ڕەتکردەوە و ئەو چانسەشم لە کیس خۆم دا. بەڵام دوای بیرم کردەوە راستە کۆبونەوەکە لەگەل نوێنەری فرۆشتنەکان زۆر گرنگبوو، بەڵام دەمتوانی دوای بخەم بۆ کاتێکی تر، چونکە وا بە ئاسانی جارێکی تر ناتوانم چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەوخانمە دابنێمەوە.

کیم: ئێستا پلان و بەرنامەت چییە؟ دەتەوێت چی بکەیت؟

جانیس: ئێستا هۆکارێکی ڕاستەقینەم دۆزیوەتەوە و ئەزانم بۆ دەمەوێت سەربەخۆیی دارایی بەدەستبهێنم. دەمەوێت چێژ لەکارەکەم وەربگرم، نەک تەنها بۆ پارەپەیداکردن و بژێوی ژیان ڕاکەڕاک بکەم.

دەمەوێت شوێنی کارەکەم ببێتە شوێنێک بۆ گەشەسەندن و بەرەوپێشچوونی خۆم و ئەو کەسانەی کە لەگەڵمن، دەمەوێت هەمووومان هەوڵی بەدیهێنانی خەونەکانمان بدەین. ئەو کاتە دەتوانم بڵێم شوێنێکی ناوازە و گونجاوی کارکردنمان هەیە.

کاتێکی جانیس قسەی بۆ دەکردم، پەرۆشیم لە چاوەکانی دەبینی بۆ بەدیهێنانی خەونەکانی.

کیم: کەواتە، ئێستا تۆ هۆکارێکی قایلکەرت هەیە و دۆزیوتەتەوە.

بەردەوام بووین لە قسەکانمان و پاشان باسی گفتوگۆی پێشوومانم بۆ کرد کە لەگەڵ لیسلی بووم، لیسلی وابیری دەکردەوە کە هێندە زیرەک نییە کە ئیشی خۆی هەبێت تەنها لەبەر ئەوەی لە زمانی دارایی شارەزاکانی بوارەکە تێناگات. هەر بۆیە باسی گرنگی فێربوونی ئەو وشە و دەستەواژانەم بۆ کرد.

جانیس: منیش هاوڕام لەگەڵت، فێربوون وتێگەیشتن لەو زمانە زۆر گرنگە، منیش کاتێک گوێم لەو وشانە دەبێت، بێزاردەبم و ناتوانم بەردەوام بم لە گوێگرتن.

بەشێکی باشی نیوەڕۆخوانەکەمان باسی سەربەخۆیی دارایی و گرنگی **داهاتی نائاگایی** بوو.

کیم: بیرتە جانیس، جارێکیان باسی ئامانجی سەربەخۆیی داراییم بۆت کرد؟ پیم ووتی کە ئامانجەکە ئەوەیە **داهاتێکی جێگیری مانگانەت** هەبێت کە زیاتر بێت لە خەرجیەکانت، پارەکانت ئیشت بۆ بکەن، نەک تۆ ئیش بۆ پارە بکەیت؟

جانیس: ئەی چۆن ئەو بیرۆکەیەم زۆر بە دڵە. وە ئەوەی زۆر دڵخۆشم پیی ئەوەیە کە بۆ ئەوەی بگەم بە سەربەخۆیی دارایی پێویستم بە داهاتێکی خەیاڵی نییە، تەنها پێویستم بە داهاتێکی مانگانەیە کە زیاتر بێت لە خەرجییەکانم.

کیم: ڕێک وایە بە پێی ئەو هاوکێشەیەی من و ڕۆبێرت دامانناوە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دارای، پێویستت بە پارەیەکی زۆر نییە، تەنها کەوتۆتە سەر خەرجیەکانت، واتە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت.

دواتر بە وردی بۆ جانیسم ڕوونکردەوە چۆن من و ڕۆبێرت لە ساڵی ١٩٩٤ ەوە توانیمان سەربەخۆ بین. وە پێنج ساڵی خایاند تا

توانیمــــان پرۆســـــەکە تەواو بکەیـــن، واتە لە ســـــاڵی ١٩٨٩ تـــا ساڵی١٩٩٤. لە ساڵی ١٩٨٩ خاوویەکمان کڕی و لەوەوە دەستمان پێکـرد، دوای ٥ ســاڵ، قــازانجی مانگــانەی هەمــوو موڵکەکانمــان گەیشتە دەفتەرێـک بۆ هەر مانگێـک، وە خەرجی مانگانەمـان ٣٠ وەرەقە بـوو، واتە خەرجیەکانمـان لە داهاتمـان کەمتر بـوو، کەواتە لەو دەقەیەوە سـەربەخۆ بووین، واتە ئیشمان بکردایە و نەکردایە خەرجیەکانمان دابینکرابوو لەڕێی کرێ خانووەکانمانەوە.

جانیس: کەواتە ئێستا پێویستە حساباتی خەرجی مانگانەم بکەم، بۆ ئەوەی بزانم چەندێکم پیویستە بۆ ئەوەی بتوانم سەربەخۆ بم و چیتر پێویستم بە کارکردن نەبێت.

کیم: منیش ڕێک مەبەستم ئەوەیە.

جانیس: یەڵا با حسابات بکەین.

**دیاریکردنی سەروەتەکەت**

جانیس: پیناسەی سەروەت چییە؟

کـیم: پرسـیارێکی جـوانە. سـەروەت دەتوانیـت بە چەنـد ڕێگەیەک پێناسـەی بکەیـت، بەڵام مـن یەکێـک لەو پێناسـانەم هەڵبـژاردووە دەڵێت "ئەو بڕە پارەیەی کە ئێستا هەتە، دەتوانێت تا چەندێک پێی بژیت ئەگەر چیتر کار نەکەیت؟."

جانیس: چۆن دیاری بکەم؟

کیم: زۆر ئاسانە. سەرەتا هەموو خەرجییەکانت دیاری بکە، واتە مانگانە پێویستت بە چەندێکە بۆ دابینکردنی خەرجییەکان.

جـانیس: واتە تەنهـا خەرجییە سـەرەکییەکانم؟ واتە ئەگەر دەسـت پیوە بگرم دەتوانم هەندێک خەرجی کەمبکەمەوە، واتە چیتر نەچم بۆ ڕێستۆرانت و سینەما و هتد...

کیم: بابەتێکی جوانت ورووژاند. من مەبەستم وورد و درشتی خەرجیەکانتە، بێ ئەوەی یەک دیناریش کەمبکەیتەوە و خۆشیەکان لە خۆت بگریتەوە ئەمە چییە بۆ ئەوەی سەربەخۆبیت. جا ئەگەر سەربەخۆ بوون ئاوا ناخۆش بێت کەواتە بۆچی باشە؟ سەربەخۆیی دارایی واتە ژیانکردن بە شێوەیەی دڵت ئەیخوازێت. واتە خەرجییەکانت زیاد بکەیت نەک کەمیبکەیتەوە. ئاماجی سەربەخۆیی دارایی زیادکردنی داهاتە، نەک کەمکردنەوەی خەرجییەکان.

**هەنگاوی یەکەم: سەروەتەکەت چەند؟**

جانیس: ئێستا من هەموو جەرجییەکانمت بۆ دەکەم بە لیستێک.

| | |
|---|---|
| ڕەهنی خانوو | $٢٥٠٠ |
| باج و ڕسوومات | $٣٠٠ |
| بیمەی خانوو | $١٥٠ |
| خزمەتگوزاری خانوو | $٣٥٠ |
| خەرجی سەیارە | $٥٥٠ |
| غاز | $١٥٠ |
| نان خواردن و چوونەدەرەوەکان | $٦٠٠ |
| کڕینی شتوومەک | $٥٠٠ |
| کتێب و ڕۆژنامە | $٥٠ |
| گەشتکردن | $٢٥٠ |

کیم: کەواتە کۆی گشتی چاندە؟

جانیس: ٤٩٠٠$ بۆ هەر مانگێک.

کیم: تەواو دڵنیایت لەو ژمارانە؟ کەم و زیادی نییە؟

جانیس بە دوودڵییەوە وتی: هەندێکیانم بە لایەنی کەمەوە نووسیوە، بۆ نموونە پارەی کەیف و گەڕان و جلم کەم نووسیوە، وە پارەم دانەناوە بۆ ڕووداوی لەپڕ و نەخوازراو.
کیم: پێم خۆشە ئاوا ڕاستگۆبیت لەگەڵ خۆتدا، چونکە تا ڕاستگۆ بیت و ژمارەکان تەواو بن، ئەوە دەتوانیت زووتر بگەیت بە سەربەخۆیی دارایی.

کاتێک من و ڕۆبێرت مایەپوچ بووین، ژمێریارێکمان گرتبوو، دەبوایە مانگی دوو جاریش بە ناچاری لەگەڵی دابنیشتینایە و بە وردی بە ڕاستگۆیانە حساباتمان بکردایا کە چیمان هەیە و چەندە قەرزارین. ئەبوایە هەموو خەرجی و داهاتی خۆمان پێبووتایە دینار بە دینار. بەڵام ئەگەر ئەوەمان نەکردایە ئێستا ئەم کیم و ڕۆبێرتەی ئێستا بوونی نەدەبوو، تا ئێستاش دەبوایە خەریکی قەرزدانەوە بووینایە.
جانیس: زۆر باشە، کەواتە دەبێت ئێستا هەندێک گۆڕانکاری لەو ژمارانەدا بکەم.

هەندێک گۆڕانکاری لە خەرجییەکان کرد و کۆی گشتی بوو بە ٥٣٠٠$ بۆ هەر مانگێک.
کیم: پیرۆزە! یەکەم هەنگاوت بەسەرکەوتووی بڕی، ئێستا کاتی هەنگاوی دووەمە.

**هەنگاوی دووەم: سەروەتەکەت چەندە؟**

هەنگاوی دووەم بریتیە لە حساباتکردنی هەموو داهاتەکانت بێجگە لە مووچەی مانگانەت. بە واتایەکی دیکە، ئەگەر ئێستا واز لە کارکردن بهێنیت، چەندە سەروەت و پارەت هەیە، بە هەموو کاش و پاشەکەوت ودراوو قەواڵە و قازانجی مانگانەی نائاگاییت

کە پارەهێنەکانت بۆت پەیدا دەکەن، بۆ نموونە وەک کرێ خانوو کە وەریدەگریت. هەموو ئەمانە پێکەوە سەروەتەکەت پێکدەهێنن.

جانیس: ئەی خشڵ و ئاڵتوونەکانم حساب بکەم؟

کیم: من پێم باش نییە حسابی بکەیت، لەبەر دوو هۆکار.

یەکەم: هەرچەندێک نرخی لەسەر دابنێیت، کەمتر لەو نرخە دەکات کە داتناوە.

دووەم: ئەگەر بیانفرۆشیت واتە ئاستی ژیانکردنت دابەزاند بۆ ئاستێکی نزمتر.

جانیس: ئێستا تێگەیشتم، بوەستە با حساباتی هەموو سەروەتەکم بکەم.

پاشەکەوت: ١٨٠٠٠$

پشکەکان: ٦٠٠٠$

کۆی گشتی: ٢٤٠٠٠$

**هەنگاوی سێهەم:**

کیم: زۆر باشە، ئەگەر ئێستا ٢٤٠٠٠$ دابەش بکەیت بەسەر خەرجی مانگانەکەت کە٥٣٠٠٠$، دەکاتە چەند؟

جانیس حاسیبەکەی دەرهێنا ودەستی کرد بە حسابەت، ئەنجامەکە ٤.٥ بوو! چاوەکانی دەرپەڕیبوون و حەپەسابوو!

جانیس: ئەوە واتای چییە؟

کیم: واتە ئەگەر تۆ ئێستا دەست لە کارکردن هەڵبگریت، دەتوانی بۆ ماوەی ٤ مانگ و نیو بژی و خەرجییەکانت دابین بکەیت..

جانیس: چوار مانگ و نیـــــــو!!!! زۆر کەمە!

کیم: پێویست بە ترس ناکات، ئەمە خاڵی دەستپێکردنی تۆیە، جا هەندێک کەس کە حساب دەکەن، سەروەتەکەیان بەشی یەک مانگیش ناکات. دەتوانیت لەم دەقەیەوە دەست پێبکەیت.
جانیس: تۆ بڵێی هەڵە حسابم نەکردبێت؟ دەبێت پاشەکەوت دابەشی خەرجی مانگانەم بکەم؟ وایە؟
کیم: ڕێک وایە. بۆ نموونە خەرجی مانگانەی کەسێک ٢٥٠٠$ بێت و پاشەکەوتی ٥٠٠٠$ بێت، کەواتە ٥٠٠٠$ دابەشی ٢٥٠٠$ دەکاتە ٢، واتە سەروەتەکەی بەشی دوو مانگ دەکات.
کیم: یەک شتی تر ماوە کە هێشتا باسم نەکردووە ئەویش **قازانجی مانگانەی نائاگاییە**.

پاشەکەوت + قازانجی مانگانەی نائاگایی= سەرکەوتنی تۆ

بۆ نموونە تۆ مانگانە پێویستت بە بڕی ٥٣٠٠$ ە **قازانجی نائاگایی** هەیە بۆ ئەوەی بتوانیت سەربەخۆ ببیت، واتە بێ ئەوەی خۆت کاربکەیت، پارەکانت ئیشت بۆ دەکەن و خەرجییەکانت دابین دەکەن.
جانیس بە دڵخۆشییەوە وتی: کەواتە من تەنها پێویستم بە ٥٣٠٠$ ە بۆ ئەوەی سەربەخۆ ببم؟!
کیم: بەڵێ، ٥٣٠٠$ بۆ هەرمانگێک. ئێستا پێم بڵێ بەرنامەت چییە؟ دەتەوێت چی بکەیت؟
جانیس: پێشتر ویستم ئەو پرسیارەت لێبکەم، بەڵام لەکاتی قسەکانتدا وەڵامەکەم دەست کەوت، ئێستا دەبێت لیستی پارەهێنەکانم زیاد بکەم بۆ ئەوەی **قازانجی مانگانەی نائاگاییم** هەبێت و زیاتر بێت لە خەرجییەکانم بۆ ئەوەی بتوانم سەربەخۆ ببم و چیتر پێویستم بە کارکرد نەبێت.

بەڵام کیم، پیش ئەوەی بڕۆین یەک پرسیارم هەیە. خۆت دەزانیت پارەیەکی کەمم بە دەستەوەیە، ئەمەویت بپرسم ئەیە پێوستە پارەیەکی زۆرت پیبیت بۆ ئەوەی وەبەرهێنان بکەیت؟
کیم: پرسیارێکی ناخۆشە!! ئێستا هەردووکمان پەلەمانە، با جارێکی تر بە تەلەفون قسەی لەسەر بکەین. تەنها ئەمە بزانە، مەرج نییە هەبوونی پارە سوودی هەبێت بۆ وەبەرهێنان کردن، هەندێکجار نەبوونی پارە سوودت پێدەگەیەنێت لە کاتی دەست کردن بە وەبەرهێنان کردن

# بەشی دوانزدەهەم
# "پارەم پی نییە!"

بەنیازی سەفەرکردن بووم بۆ نیویۆرک، بیرم کەوتەوە جاری پێشوو پەیمانم بە لێسلی دا کە گەڕامەوە نیویۆرک یەکتری ببینین، بۆیە مۆبایلەکەم دەرهێنا و پەیوەندیم پێوەکرد.

کیم: چۆن لێسلی؟ (کیم)م. کاتت هەیە تۆزێک قسەبکەین؟

لێسلی: بەدڵنیاییەوە.

کیم: بەنیازم دوو هەفتەی تر لە نیویۆرک بم، پێت خۆشە یەکتری ببینین؟

لێسلی: هەر نان خواردنی تیا بێت ئامادەم. دایە قاقای پێکەنین.

کیم: بەڵێ بێگومان، بۆ نان خوارد دەچین!

دواتر لەسەر شوێن و کاتەکە ڕێککەوتین و بە لێسلیم وت خۆی شوێنەکە هەڵبژێرێت.

لێسلی: شوێنێکی زۆر خۆش دەزانم ،ئەگەر گونجا دەچین بۆ ئەوێ، پێت دەڵێمەوە. دەتبینمەوە.

**نیوەڕۆخوانێکی دیکە لەگەڵ کچەکان**

گەیشتمە نیویۆرک و کاتێک بەڕێگاوەبووم بچم بۆ لای لێسلی، باش ڕێگاکە شارەزانەبووم، بۆیە پەیوەندیم بە لێسلیەوە کرد و پێم وت وا خەریکە لە پردەکە دەپەڕمەوە، دواتر بەرەو کوێ بڕۆم؟

لێسلی: هەر ڕێک وەرە تا دەگەیتە پارکەکە.

کەش و هەوا زۆر خۆش بوو، منیش زۆر دڵخۆش بووم، هەوایەکی فێنکی هەبوو، منیش چاکەتێکی تەنکم لەبەردابوو. کاتێک گەیشتمە پارکەکە لێسلیم بینی لەگەڵ کەسێکی دیکەبوو کە پشتی لە من بوو نەمدەزانی کێیە، لە ناوەراستی (سێنترال پارک)

دانیشتبوون. سفرەیەکی سوری خوانیان داخستبوو لە ناوەڕاستی پارکەکەدا و سەبەتەیەکی سەیرانیان پێبوو. کاتێک لێسلی منی بینی دایە قاقای پێکەنین و منیش دەستم بۆ بەرزکردەوە. بەڵام ئەوەی سەیر بوو ئەو خانمەی تر کە پشتی لە من بوو هیچ ئاوڕی نەدایەوە!

کاتێک نزیکبوومەوە، کێم بینی!! ترەیـــــــــسی!!!!

لە خۆشیدا هاوارم کرد، ئەوە چی دەکەیت لێرە؟

پاشان کەوتینە قسەکردن.

ترەیسی: زۆر نائومێد بووم کە نەمتوانی لە کۆتا کۆبوونەوەکەتان بەشداربم، بۆیە کە ئەمجارە لێسلی پەیوەندی پێوەکردم و داوای لێکردم کە منیش بەشداربم زۆرم پێخۆش بوو، چونکە لێسلی زۆر خۆش باسی کۆبونەوەکەی جاری پێشووتانی کرد.

نزیکەی کاتژمێرێک خەرکی قسەی خۆش و نان خواردن بووین کە لێسلی ئامادەی کردبوو. دوای ئەوە باس دوای باس، باس هاتە سەر ئیش و کار. لێسلی دیاربوو ئیشەکەی زۆر کاتی گرتووە و پێی وتین کە هەموو ژیانی بووە بە ئیشکردن.

ترەیسی: ژیانم نەماوە، هەموو ژیانم بووە بە ئیشکردن، بەردەوام ئیش ئەکەم و هیچیشم دیار نییە. هاوسەرەکەشم بەهەمان شێوە بەردەوام خەریکی ئیش و کارە. خاوەنی دوو منداڵین، یەکێکیان لە ئامادەییە، ئەوەی تریان لە پۆلی حەوتەمە. هەمیشە ڕاکە ڕاکەمە و لە کۆتای ڕۆژەکەشدا هیچ بەرەوپێشچونێک نابینم. هەستەکەم کاتی گۆڕانکارییە، ناکرێت من هەر بەم شێوەیە بەردەوام بم.

ترەیسی بەردەوام بوو لە قسەکانی و وتی: مانگێک لەمەوبەر زۆر ترسام، ئەو کۆمپانیایەی هاوسەرەکەم کاری لێدەکات فرۆشرا بە کۆمپانیایەکی تر. وە کۆمپانیا تازەکە کارمەندە کۆنەکانی

کۆمپانیەکەی پێشووی دەردەکرد و کارمەندەکانی خۆی دەهێنایە کۆمپانیا تازەکەوە. زۆر ترساین کە هاوسەرەکەشم یەکێک بێت لەوانە و بنێردرێتە ماڵەوە، بەڵام خۆشبەختانە وانەبوو. ئەگەر دەربکرایە، داهاتی مانگانەمان هارەی دەکرد. لەمەوە بۆم دەرکەوت کە ئێمە لەڕووی داراییەوە زۆر لاوازین، هار کاتێک لە کارەکەمان دەرکراین لە برسا ئەمرین.

لێسلی: هەنێک لە قساکانی کۆبونەوەی پێشوومانم لەسەر بابەتی پارە و دارایی، بۆ ترەیسی باسکردوو، ئاگادارکەرەوەیەکی باش بوو بۆ ترەیسی.

ترەیسی دانی پێدانا کە کات چەند گرنگە لەم بابەتەدا.

ترەیسی دواتر باسی هاوسەنگی ڕاگرتنی کار و ژیانی خێزانی کرد، باسی لەوە کرد کە چەند گرانە و ئەرکێکی ئاسان نییە.

کاتێک لێسی باسی قسەکانی ئەو ڕۆژەتانی بۆ کردم دەبارەی پارە و وەبەرهێنان، باسی ئەوەی کرد کە هەرشتێک تاقەتمان نەبێت بیکەین یەکسەر دەڵێن کاتمان نییە، نامانەوێت تۆزێک خۆمان هیلاک بکەین خێرا بیانوومان حازرە و دەڵێین کاتمان نییە. منیش هەمان کێشەم هەیە، هەست ئەکەم ئێستا کاتی گۆڕانکارییەکی گەورەیە. هەر ئەوەش یەکێکە لە هۆکارەکان کە ئەمڕۆ هاتم.

## پرسیارێکی باو

بە ئاشکرا لە دەردی ترەیسی تێدەگەیشتیت لە قسەکانیا، ئەو هۆکارەکەی خۆی دۆزیبووە. قسەکانمان بەردەوام بوو، بۆ ماوەی کاتژمێرێک باس و خواسی زۆرمان کرد. دوای ئەوە ترەیسی پرسیارێکی هەبوو.

ترەیسی: ئایا پێویستت بە پارە نییە بۆ ئەوەی پارە پەیدا بکەیت؟ واتە سەرەتا پێویست نییە پارەت پێبێت بۆ ئەوەی دەست بە وەبەرهێنان بکەیت؟

کیم دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: واباشترە تەلەفون بۆ جانیس بکەین، چونکە ئەو ڕۆژە جانیسیش هەمان پرسیاری هەبوو، بەلام کاتم نەبوو وەلامی بدەمەوە.

ترەیسی: پێم شەرمە باسی دەکەم، بەڵام پاش ئەو هەموو خۆماندووکردن و ئیشی چەند ساڵەمان، بە هەردووکمان، من و هاوسەرەکەم، تەنها بڕە پارەیەکی زۆر کەممان پاشەکەوت کردووە. ئەوەی پەیدای دەکەین تەنها باشی خەرجیەکانمان دەکات، هەندێک جار بەشی خەرجیەکانیشمان ناکات، دەکەوینە قەرز و قوڵەوە.

لێسلی: با تۆزێ دڵخۆشیت بەمەوە، هێشتا تۆ باشتریت لە من.

ترەیسی: کەواتە با بێینەوە سەر هەمان پرسیار، پێویستت بە پارە نییە بۆ ئەوەی پارە پەیدا بکەیت؟

کیم: با هەمان شتیش بە تۆ بڵێم کە بە جانیسم وت، نەبوونی پارە باشترین هۆکار بوو بۆ من کە دەستم کرد بە وەبەرهێنان.

هەردووکیان بە سەرسوڕمانەوە سەیری منیان ئەکرد

لێسلی: چۆن شتی وا دەبێت، منیش هاوڕام لەگەل ترەیسی. بۆ ئەوەی دەست بکەیت بە وەبەرهێنان، دەبێت پارەت پێبێت.

کیم: باشە، هەرگیز نەوتووە ئەگەر پارەم پێبێت ئەوە ئەکەم؟ یان ئەگەر کاتم هەبێت، وا ئەکەم و وا ئەکەم؟

ترەیسی: بەدڵنیاییەوە، زۆر جار وام وتووە، بەتایبەت ئەوەی دووەمیان.

کیم: ئەی کاتی بەتاڵت دۆزیەوە؟

تۆزێک بیری کردەوە و وتی: نەخێر، هەرگیز!
لێسلی گفتوگۆکەی پێبڕین و وتی: من ئەو ڕستەیە زۆر بەکار دەهێنیم "ئەگەر پارەم هەبێت،" هەر کاتێکیش وام وتبێت، دڵنیام ناتوانم ئەو شتە بکڕم، یان بیکەم.
کیم: ڕێک وایە. بۆیە هەرکاتێک گوێم لە یەکێک دەبێت، کە دەڵێت ئەگەر پارەم هەبێت ئینجا دەست دەکەم بە وەبەرهێنان، ئەو کاتە دەزانم هەرگیز دەستپێناکات. ئەو ڕستەیە تەنها وەکو بیانوویەک بەکارئەهێنێت و هیچی تر.
ترەیسی بە وەڕسیەوە وتی: باشەئەگەر من بڕێکی کەم، یان هیچ پارەم پێنەبێت، لە کوێوە دەستپێبکەم؟
کیم: چیرۆکێکتان بۆ باسکەم کە بیرکرنەوەی منی گۆڕی لەسەر پێویسی پارە لە کاتی دەسکردن بە وەبەرهێناندا؟
لێسلی و ترەیسی: بەڵێ.

**"هیچ پارەمان پێ نییە."**

کاتێک من و ڕۆبێرت لە ئۆریگن دەژیاین، من تازە دەست کردبوو بە وەبەرهێنان. دەتوانم بڵێم یەک دیناریش پاشەکەوتمان نەبوو، تانانەت پەیداکردنی پارەی ئاو و کارەباش دەردێکی گەورەبوو بۆمان. دوانیوەڕۆیەکیان، تازە گەشتبووینە بەردەمی دەرگای ماڵەوە، جانتاکانم بە دەستەوە بوو، کە لە گەشتێکی پێنج هەفتەی بوون لە ئوسترالیا بۆ ئیش و کار، تەلەفونەکە زەنگی لێدا. سەیرمان کرد بریکاری خانوبەرەکەمان بوو، تەلەفونی بۆ کردبوون بۆ ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوە کە باڵەخانایەکی بازرگای هەیە لە دوانزدە شوقە پێکهاتووە. ئەگەر ئێمە نەچووینایە بەدەمیەوە، بریکارەکە تەلەفونی بۆ وەبەرهێنەرێکی تر دەکرد

بێگومان. بۆیە سەرەڕای ئەو هەموو هیلاکییە، ڕۆبێرت وتی "ئەچم سەیری ئەکەم!" ئێستاش بیرمە هاوارم کرد " نەیکڕی، هیچ پارەمان پێ نییە."

دوای ئەوە ڕۆبێرت گەڕایە وەو زۆر دڵخۆش بوو، وتی " کڕیم." ئۆتۆماتیکی وتم " چی؟! خۆ ئێمە پارەمان پێ نییە."

ڕۆبێرت وتی: باشە ئەگەر پارەمان پێ نەبێت، نایکڕین. بەڵام ئێستا ئەبێت بیر لەوە بکەینەوە چۆن ئەو پارەیە پەیدا بکەین. خاوەن باڵەخانەکە ماوەی دوو هەفتەی بۆ دانابووین کە هەموو مامەڵەکان تەواو بکەین و پارەکەش بدەین، ئەبێت لە ماوەی ئەم دوو هەفتەیەدا هەموو شتێک بکەیەن بۆ ئەوەی ئەو پارەیە پەیدا بکەین. ئەگەر نەمانتوانی پارەکە پەیدا بکەین، مامەڵەکە ناکەین و ئەکشێینەوە.

کیم: ڕاشکاوانە بیڵێم، دوای قسەکانی ڕۆبێرت، ڕەئم گۆڕا.

دوای ئەوە، تەلەفونمان کرد بۆ هاوڕێیەکی ڕۆبێرت کە ناوی (دروو) بوو. دروو وەبەرهێنەرێکی سەرکەوتوو بوو لە کەنەدا. باسی مامەڵەکەمان بۆ کرد و دواتر باسی موڵکەکەمان بۆ کرد و زۆری بە دڵ بوو و نرخەکەشی بە دڵ بوو. بۆیە وتی من بەشدار دەبم لەگەڵتان و نیوەی پێشەکیەکە دەدەم کە دەکاتە ٢٥٠٠٠$. ڕۆبێرت بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو. ئەوەی مابویەوە پەیداکردنی ٢٥٠٠٠$ەکەی تر بوو بۆ ئەوەی ٥٠٪ ی خۆمان بکڕین.

ئەو کاتەی ڕۆبێرت بە تەلەفون قسەی لەگەل دروو دەکرد سەبارەت بە مامەڵەکە، بە ڕێگاوەبووین لە سەیارەدا. کە ئەوان خەریکی قسەکردن بوون، یەکسەر من بیرم لە قسەکەی دروو کردەوە. کاتێک تەواو بوون لە قسەکان، بە ڕۆبێرتم ووت: با

بەتەنیا ئەم مامەڵەیە بکەین، ئەگەر دروو نەزانێت سەرکەوتوو دەبێت، چۆن بەشدار دەبێت، ئەو چەندساڵە لەو بوارەدا کار دەکات و ئەزموونی هەیە.

کاتێک وام وت، ڕۆبێرت سەیارەکەی لە قەراغ ڕێگاکەدا وەستاند و ووتی: ئەگەر دروو بەشدار بێت ئێمە تەنها پێویستمان بە نیوەی ئەو پارەیە هەیە کە پەیدای بکەین، ئەگەر ئەو هاوبەش نەبێت لەگەڵمان ئەوە ئەگەڕێینەوە خاڵی سەرەتا و دەبێت هەموو پارەکە پەیدا بکەین کە ٥٠٠٠٠$.

هەردووکمان بێدەنگ بووین و بیرمان لێ دەکردەوە، دواتر ڕۆبێرت وتی زۆر باشە بە تەنها دەیکڕین.

لەوانەیە ئێستا زۆر کەس بڵێین شتێکی زۆر گەمژانەتان کرد، بەڵام خۆشمان دەمانزانی یان پارەکە پەیدا دەکەین و دەیکرین، یان ناتوانین یەک دیناریش پەیدا بکەین و ناتوانین بیکڕین و مامەڵەکە هەڵدەوەشێتەوە.

دووبارە گەڕاینەوە خاڵی سەرەتا و دەبوایە قەرزی ٥٠٠٠٠$مان بکردایە. چووینە لای کۆمەڵێ هاوڕێ و ناسیاو بەڵام سوودی نەبوو، نەمانتوانی پارەکە پەیدا بکەین. دواتر چووینە بانکی گشتی، ویستمان داوای قەرز بکەین بە دانەوەی بە بڕێکی کەمێک زیادە، بەهەمان ئەوەش سوودی نەبوو.

دوای ئەوە چارمان نەما. پەنامان بۆ پرۆژە و کارەکانمان برد و هەموو شتێکمان کرد بۆ ئەوەی فرۆشتن زیادبکەین، بەڵام ئەوەی توانیمان بیکەین، تەنها پەیداکردنی ٢٥٠٠٠$ بوو. واتە ڕێک وەک ئەو کاتەی دروو بوو بە هاوبەشمان. تەنها ٢٥٠٠٠$ مایەوە کە پەیدای بکەین پێش ئەوەی دوو هەفتەکە تەواو بێت.

بەردەوام بووین لە هەوڵدان، تەنها سێ ڕۆژمان مابوو. ئەوەی مابوو هانای بۆ بەرین بانکی تایبەت بە هەژماری تایبەتی و کاری خۆمان بوو. سەرەتا خۆمان بە ئەنقەست هانامان بۆ نەبرد، چونکە ئەوەی هەمان بوو تەنها ٣٥٠٠$ بوو لە هەژمارەکەماندا، بۆیە وتمان بە دڵنیایەوە پارەمان نادەنێ.

چووینە بانکەکە و داوامان کرد بەڕێوبەری بانکەکە ببینن، کە ناوی جەیمس بوو. بانکەکە بانکێکی بچووک بوو. دواتر توانیمان جەیمس ببینین و دانیشتین دەستمان کرد بە باسکردنی مامەڵەکە و کە چۆن دەتوانین مانگانە لە قازانجی مانگانەی باڵەخەنەکە دەتوانین قەرزەکە بدەینەوە. جەیمس سەرێکی هەڵبڕی و وتی" یەکەم من ئەزانم کە بڕی چەند پارە لە هەژمارەکانتاندا هەیە، دووەم ئێوە تەنها دوو مانگە لای ئێمە هەژمارتان هەیە."

کە ئەم قسانەی کرد، دڵنیابوون کە قەرزەکامان ناداتێ!

جەیمس بەردەوام بوو لە قسەکانی وتی: هەرچەندە ئەگەری زۆر کەمە کە بتوانین ئەو قەرزەتان بدەینێ، بەڵام ئەم وەرەقانەمان بۆ واژۆ بکەن. با هیچ نابێت ئەمەش هەر بکەین بەشکم سودێکی هەبێت. بۆ ئەوەش تاقی ناکەنەوە؟

دوای ئەوە زیاتر دڵنیابووینەوە کە ناتوانین قەرزەکە وەربگرین و واماندەزانی کە جەیمس تەنها دەیەوێت ڕێزمان لێبگرێت و تۆزێ دڵنەوایمان بکات.

دوای ئەوە وەرەقەکەمان ئیمزا کرد و ئەویش خستیە فایلێکەوە و قاقایەکی لێدا و وتی پیرۆزە قەرزەکەتان وەرگرت.

ئێمەش حەپەسابووین! وتمان بەڕاست قەرزەکامان دەدەیتێ؟

وتی" مامەڵەکەتان باش دیارە و منیش تەنها دوو جار ئێوەم بینینوە، دەزانم کە چەندە لە خەمی کار و پرۆژەکانتانن، دڵنیام لەم مامەڵەیەش سەرکەوتوو دەبن."

لە بانکەکە هاتینە دەرەوە بە دڵخۆشیەوە پەیوەندیمان بە بریکارەکەمان کرد و وتمان مامەڵەکە ئەکەین و پارەکە ئامادەیە.
کە بیردەکەیتەوە، جەیمس هیچ هۆکارێکی ژیرانەی نەبوو تا پارەمان بداتێ. کێ دەیوت کە ئێمە دەتوانین لە ڕێگەی جەیمسەوە پارەکە پەیدا بکەین؟ هەندێ جار خۆشت نازانی و بیرت بۆ ناچێ لە چ شوێنێکەوە پارەت دەست دەکەوێت.

**پارەت پێ نییە؟ کێشە نییە.**

لیسلی: ئەو قسانەی تۆ کردت، ڕێک بە پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی منەوەبوو. تۆ دەڵێیت لە بری ئەوەی سەرەتا پارەکە پەیدا بکەیەت، دەبێت موڵکەکە بدۆزیتەوە، وایە؟
کیم: ڕێک ئەمەوێت لەوە تێبگەیت. زۆرینەی خەڵک دەڵێن سەرەتا با پارەم هەبێت، دواتر وەبەرهێنان دەکەم، بەڵام فێربە کە سەرەتا موڵکەکە بدۆزەرەوە دواتر هەوڵی پەیداکردنی پارەکە بدە، نەک بە پێچەوانەوە. سەرەتا موڵکەکە بدۆزەرەوە، و جوان لێی بکۆڵەرەوە، برۆ سەیری بکە و لێی وردبەرەوە، بۆ نموونە ئەگەر خانوو بوو ، ئەوە برۆ سەیری کە، هاتووچۆی تیا بکە، باسی بکە، حساباتی قازانج و زیان بکە و هەموو شتێکی هەڵسەنگێنە. واتە شتەکە بکە بە ڕاستیی، چیتر تەنها بیرۆکەیەک نەبێت، کاتێک ئەمانە دەکەیت بیرۆکەی جوانت بۆدێت. هەمان شتیش بۆ پرۆژە و وەبەرهێنانی تریش ڕاستە، سەرەتا هەڵیسەنگێنە، دواتر کە بابەتەکە جدی بوو، هەوڵی پەیداکردنی پارەکە بدە.

لێسلی: کەواتە من سەرەتا دەبێت، وەبەرهێنانەکە بدۆزمەوە، دواتر پارەکە پەیدا بکەم. واتە دەتوانم هەر ئێستا دەست پێبکەم. لە ڕاستیدا پێشتر وامدەزانی پێویستە سەرەتا پارەم هەبێت، کە بیرم لە پارەپەیدا کردن دەکردەوە، تەنها دەمتوانی بە ئیشکردنی زیاتر پارەکە پەیدا بکەم. هەر ئەوەش وایلێکردووم تا ئێستا دەستم پێنەکردووە.

ترەیسی: واتە تۆ ئەڵێیت ئەگەر تۆ پڕۆژە یان موڵکەکەت دۆزیەوە، دوای ئەوە هەر لە خۆیەوە پارەکەشت دەست دەکەوێت؟

کیم: نەخێر پەیدا نابێت ئەگەر تۆ دابنیشین و پاڵی لێدەیتەوە، بەڵکو دەبێت هەوڵی بۆ بدەیت، تا پەیدای دەکەیت. سودی ئەوەی کاتێک کاتێکی دیاریکراوت هەیە و دەبێت پارەکە پەیدا بکەیت ئەوەیە ناتوانی دوای بخەیت و بڵێی دوای دەیکەم. وات لێدەکات بچیت بۆ لای وەبەرهێنەر و کەسی تر و باسی پڕۆژەکەیان بۆ بکەیت، بەمەش ووزە دروست دەکەیت، تا زیاتر ووزە دروست بکەیت، هەلی باشترت دێتە ڕێگا. دوای ئەوە ووزە، ووزە ڕادەکێشێت، وەکو چۆن جەیمس قەرزەکەی پێدان.

لێسی: باشە هەموو کاتێک پارەت دەست دەکەوێت؟ هەرگیز ڕوویداوەکە پارەت دەست نەکەوێت.

کیم: گرەنتی ئەوە نییە کە تۆ هەموو جارێک بتوانیت پەیدای بکەیت. بەڵام هیچ نەبێت شانسی خۆت تاقیدەکەیتەوە. بەڵام ئەگەر تۆ هەر لە سەرەتاوە بڵێی ناتوانم پەیدای بکەم، واتە پێش ئەوەی یاریەکە دەستپێبکات، تۆ دەکشێیتەوە. کاتێک دەگەڕێیت بە دوایدا، تۆ چانسی ٪٥٠ بۆ ٪ ١٠٠ هەیە، کە دەتوانیت پەیدای بکەیت. بەڵام ئەگەر تۆ هەر لەسەرەتاوە بڕیارت دابێت کە ناتوانیت پەیدای بکەیت، ئەوە چانسی پەیداکردنت ٪٠ سفرە.

نەبوونی پارە سوودی هەیە.

ترەیسی: من لە هەموو ئەوانە تێگەیشتم بەڵام شتێک هەیە کە باش لیی تێنەگەیشتووم، ئەویش ئەوەیە سوودی نەبوونی پارە چییە؟ سودی چیە کە ئەبێت ئەو هەموو هەوڵە بدەیت تا پارەکە پەیدا بکەیت؟

کیم: پرسیارێکی جوانە! لەراستیدا هەموو کاتێک کە دەستم کردووە بە وەبەرهێنانێک هەمیشە قەرزم بۆ کردووە و بڕی تەواوی پارەکەم پێنەبووە، ئێستاش پارەم پێ نییە چونکە هەموو پارەکەم لە پڕۆژە و وەبەرهێناندایە.

ترەیسی: ئێ سودی نەبوونی پارە چییە؟

کیم: سودی ئەوەیە وات لێدەکات بیربکەیتەوە، وات لێدەکات داهێنەر بیت! وات لێدەکات بیر لە ڕێگای دیکە بکەیتەوە، لە بری ئەوەی بیانوو بهێنیتەوە و بڵێی پارەم پێنیە، بیردەکەیتەوە و ڕێگای نوێ دەدۆزیتەوە. هەرگیز نەمهێشتووە بیانووی نەبوونی پارە بموەستێنێت لە وەبەرهێنان کرد. هەستێکی خۆشە کاتێک توانای کردنی ئەو شتەت هەیە کە پێویستە بیکەیت.

یەکێک لەو ئامۆژگارییە گرنگانەی کە باوکی زەنگین فێری کردم ئەوەیە کە هەرگیز نەڵێی "ناتوانم." هەر لەگەڵ وتنی ئەو ڕستەیەدا مێشکت دادەخرێت، لەبری ئەوەی بڵێی ناتوانم، بڵێ "چۆن بیکەم؟" بە پرسیار کردن لە مێشکت، مێشکت بە دوای وەڵامدا دەگەڕێت.

ڕێگاکانی پەیداکردنی پارە

زۆرینەی خەڵک کاتێک پێویستیان بە قەرزی پارە دەبێت ، پەنا دەبەنە بانکەکان. وا کاتێک بانکەکان بێ هیوایان دەکەن و قەرزیان نادەنێ، دەستبەجێ دەڵێن " ناتوانم پەیدای بکەم." دووبارە وشەی

"نـاتوانم!". بەڵام لە ڕاسـتیدا بـێجگە لە بانـک، دەتوانیـت ڕێگـای تـر بدۆزیتەوە کە لە خوارەوە باسکراون.

**فرۆشیار:** دەتوانیت قەرز لە فرۆشیاری ئەو مـوڵکە وەربگریت کە موڵکەکەی لێدەکڕیت. دەتـوانی کاتیک بۆ داناوەی قەرزەکە دابنێن. یان دەتوانیت پێی بڵێی کە لە پارەی قازانجی مانگانەی مـوڵکەکە قەرزەکەت دەدەمەوە.

**وەبەرهێنەری تر:** خەڵکێکی زۆر هەن، پارەیان هەیە، بەڵام کات یان حەز یان شارەزاییان لە وەبەرهێنان کردن نییە. بۆیە تۆ دەتوانیت، پرۆژەکەی خۆتیان بۆ باسبکەیت و مانگانە لە قازانجی پرۆژەکەت پشکیان بدەیتێ و ئەوانیش قەرزت بدەنێ.

**هـاوڕێ و ناسـیاو وکەس و کـار:** دەتوانیـت هـاوڕێ و کەسـە نزیکەکانت بهێنیتە پرۆژەکەوە، تۆ بە کات و هەوڵدان بەشداربیت، ئەوانیش بە پارە. بەڵام ئاگاداری دوو خاڵ بە کاتێک لەگەڵ ئەوان کاردەکەیت.

**یەکەم:** وەک هـــاوڕێ و ناســـیاو لێیـــان مەڕوانە، وەک وەبەرهێنەرێکـی تـر لێیـان بڕوانە. بۆیـان ڕوونـبکەرەوە کە چـۆن پارەکەیان دەدەیتەوە و چۆن لە قازانجیش بەشداردەبن.

دووەم: لەبەر ئەوەی هەست و سۆزێک هەیە لە نێوانتان، من خۆم ئیشکردنم پێ باش نییە لەگەڵ ناسیاو و برادەر چونکە پەیوەندیی نێوانتان شایانی ئەوەنییە بیخەیتە مەترسی ئیشێکەوە کە دیار نییە سەرکەتوو دەبێت یان نا. چەند نموونەم بینیووە کە برا قەرزی بە خوشـکەکەی داوە، بەڵام پـاش چەنـد مانگێـک بـراکەی پێویسـتی بە پارەکە بووە و داوای کردۆتەوە وبە هۆی ئەوەوە بووە بە شـەڕ و ناخۆشی لە نێوانیان و خوشـکەکەی نەیزانیووە چۆن پـارەکەی بۆ پەیدابکاتەوە و لەو کێشەیە ڕزگاری بێت.

کیم: ئەو قاپە پەنیرەم بدەرێ با بەدام قسەکردنەوە بیخۆین ئێستا ئەمەوێت باسی ڕێگەیەکتان بۆ بکەم کە من و ڕۆبێرت چەندین ساڵە بەکاری دەهێنین بۆ پەیداکردنی پارە بێ ئەوەی گۆڕانکاری گەورە بکەین لە ژیانماندا.

## بەشی سیازدەهەم
## "زیاتر لەسەر پارە بزانە"

ترەیسی: ئێ، ئەو خاڵە گرنگە چییە کە دەتەوێت پێمان بڵێیت؟
کیم: با چیرۆکێکی ترتان بۆ بگێڕمەوە، بیرتانە پێم وتن ئەو کاتەی لە ماڵمان گواستەوە بۆ ئۆریگن، هیچمان پاشەکەوتمان نەبوو، بە زەحمەت ئەمانتوانی پارەی پسوڵەکانیش بدەین.
هەردووکیان بە لەقاندنی سەریان ئاماژەیان بە بەڵێ کرد.
ئەوکاتە ڕێک کاتی ئەوەبوو کە من و ڕۆبێرت هەستمان کرد پێویستە شتێکی جیاواز بکەین ئەگینا تاماوین لە ئێستا باشتر نابین. هەرچەندە ئەوکاتە داهاتێکی زۆرکەمیشمان دەستدەکەوت، بۆیە بڕیارمان دا لە پێناو دروستکردنی داهاتوویەکی باش، ئەبێت لە ئەمڕۆوە هەنگاو بۆ ئەو داهاتووە بنێین.
لێسلی: ئەی چیتان کرد؟
کیم: یەکەم شت کە کردمان ژمێریار گرت.
لێسلی: ژمێریار؟ بۆچی؟ تۆ وتت بەزەحمەت دوو دینار پاشەکەوتمان ئەکرد.
کیم: ئەزانی زۆر قورسە ڕاستگۆ بیت لەگەڵ خۆت کە دێتە سەر باسی پارە؟ پێشتر وابیرم دەکرد وەکو موعجیزە هەموو کێشەکانی تایبەت بە پارە خۆیان حل دەبن و نەمدەویست ڕووبەرووی

حلکردنی کێشەکان ببمەوە. بە خۆمم دەگوت "ئەگەر ئیهمالی بکەم، خۆی حل دەبێت."
لیسلی دەستی کرد بە پێکەنین و وتی " تۆ مێشکمان دەخوێنیتەوە؟"
منیش ڕێک وام. ئەمەوێت لە کێشەکان ڕاکەم و دەڵێم خۆیان چارەسەردەبن.
کیم: ئیهمالکردن زۆر ئاسانترە لە ڕووبەڕوبونەوەی کێشەکە؟ ئەی وانییە.

هەر بۆیە بڕیارم دا ڕووبەرووی کێشەکان ببمەوە و ژمێریارێکمان گرت و مانگی دوو جار دانیشتنمان هەبوو. هەموو دوو هەفتە جارێک (بێتی)، ژمێریارەکەم، هەموو ڕاستیە تاڵە داراییەکانمی پێدەوتم. وەکو دایکێک کە چۆن ناهێڵێت منداڵەکی لەسەر مێزەکە هەستێت هەتا هەموو نانەکە تەواو دەکات، منداڵەکەش حەزی لە نانەکە نییە. بێتی نەیدەهێشت لەسەر مێزەکە هەستم هەتا لە هەموو دینارێک و وەسڵەکانمی دەکۆڵیەوە کە چیم لێکردووە. دانیشتنەکانمان هیچ خۆش نەبوو، بەڵام ئەبوایە بمانکردایە.
ترەیسی: ئەوە دیوە ناخۆشەکەی چیرۆکەکەیە، ئەی دیوەکەی تری چییە؟
کیم: دیوی دووەمی ئەوەبوو کە تێکەیشتم لە ڕووی داراییەوە لەچ خاڵێکدام، تێگەیشتم کێشە داراییەکانمان چییە وئیهمالم نەدەکردن و بە ئاسان نەمدەگرتن. بۆم دەرکەوت خەرجی و داهاتمان چەندە و ئێستا لە ڕووی داراییەوە لە چ خاڵێکدام. هەر کەزانیم لە کوێدام، دوای ئەوە ئەزانم بەرەو کوێ دەڕۆم و چۆن دەڕۆم.

پێش ئەوەی ئەم حساباتە بکەم، وەکو ووشترمرخێک وابووم کە سەری خۆی لە لمەکە شاردۆتەوە. وەکو ئەوەوایە پەیوەندی بە ڕێستۆرانتێکەوە بکەیت ۆ بڵێی چۆن بێم بۆ ڕێستۆرانتەکەتان، بۆ ئەوەی پێی بڵێی کە تۆ ئێستا لە کوێیت. ئەگەر نەزانن تۆ لە کوێیت، ئەوا چۆن ڕێگاکەت پێ بڵێن؟ ئەمەش ڕێک بەو شێوەیە، ئەگەر نەزانی لە ڕووی داراییەوە لە چ خاڵێکدایت، ئەوە چۆن ئەتوانی بەرەو ئامانجەکە بڕۆیت؟

**خاڵێکی گرنگ**

پێشتر من و ڕۆبێرت چیمان پەیدادەکرد بۆ پارەی پسوڵەی ئاو و کارەبا بوو، هیچ بۆ پاشەکەوت نەدەمایەوە. بۆیە دوای ئەوە وامان کرد لە پێشدا پاشەکەوت بکەین دواتر بۆ خەرجیەکانی تر. بۆیە پلانێکمان دانا، پلانەکە ئەوەبوو هەرچەندێک بێتە دەستمانەوە ٣٠٪ بۆ پاشەکەوتە. بۆ نموونە لە ١٠٠$ ، ٣٠$ بۆ پاشەکەوت، ئەگەر ١$ بێت، ٣٠ سەنت بۆ پاشەکەوت. وە ئەو ٣٠٪ پاشەکەوتە بەم شێوەیە دابەشمان کردبوو.

١٠٪ بۆوەبەرهێنان

١٠٪ بۆ پاشەکەوت

١٠٪ بۆ خێرخوازی.

دوای ئەوە چی مایەوە بۆ پسوڵە و خەرجیەکانمان بوو. واتە لە پێشدا ٣٠٪ مان بۆ بنیدنانی دارایی داهاتوومان بوو.

نهێنی سەرکەوتنی ئەم پلانە ئەوەیە، هەموو مانگێک بەردەوام بیت لەسەری و مانگی دوای ئەوە نەڵێی قەیناکە ئەم مانگە پلانەکە جێبەجێ ناکەم. وە خاڵێکی زۆر گرنگتر ئەوەیە ئەم یاسایە بەسەر تەنانەت دیناریکیشدا جێبەجێبکەیت، واتە ئەگەر مانگانەکەشت زۆر کەمیش بێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە جێبەجێی بکەیت و بیکەیت

بە خـــوو و عـــادەت. هەر ئەوەنەی بـــوو بە خـــوو، دوای ئەوە بەئۆتۆماتیکی بەردەوام دەبێت لەسەری.

لێرەدا شتێک هەیە، دەتوانیت دەستکاری ئەو ٣٠٪ یە بکەیت، ئێمە بەگوێرەی داهاتی خۆمان دامانناوە و ئەبوایە تۆزێک زۆر لەخۆمان بکەین بۆ ئەوەی ئەو ڕێژەیە پاشەکەوت بکەیت، بەڵام تۆ دەتوانی بەپێی موچەکەت کەمی بکەیتەوە یان زیادی بکەیت، بەڵام من پێم باش نییە کەمبکرێتەوە لەبەر ئەم هۆکارانە. یەکەم، ئەگەر ڕێـــژەکە کەم بێـــت، ئەوە کـــاتێکی زۆرت پێویستە بـــۆ ئەوەی ئەنجـــامێکی باشـــت دەســـتکەوێت. دووەم، ئەگەر ئەنجـــامەکەی بە خێرایی نەبینی ئەوە ساردەبیتەوەو بەردەوام نابیت لەسەری. ئەوەی زۆر دڵخۆشکەر بوو ئەوەبوو دەمانزانی ئەو ڕێژەی ٣٠٪ یە پاشەکەوتە بۆ داهاتوومان و خەریکی بنیادنانی داهاتوومانین.

ترەیســی: باشـــە ئەی ئەگەر بە زەحـــمەت توانیـــت پـــارەی پسوولەکانت دابین بکەیت؟.

کیم بە پێکەنینەوە وتی: تۆش هەمان قسەی (بێتی) دەکەیتەوە.

ئیشی بێتی ئەوە بوو لە سەدا سی داهاتەکەمان پاشەکەوت بکات بۆ ئەو سێ مەبەستەی باسمان کرد، بۆیە بێتی ئەیوت: ناتوانن ئەوە بکەن، پارەی پسوولەکانتان پێنادرێت.

بە بتیم وت: ئێمە دەتـوانین پارەکـانی تـر بـدەین تەنانەت ئەگەر پێویست بکات پەیوەندیان پێوە دەکەم و بۆیان ڕووندەکەمەوە کە ماوەیەک لەسەرمان بوەستن.

بێتی: بیرۆکەیەکیم هەیە، سەرەتا پارەی پسوولەکان دەدەین پاشان چی مایەوە پاشەکەوتی دەکەین.

کیم: هەموو خەڵک وا دەکەن، نازانن لە کۆتایدا هیچی وا نامێنێتەوە بۆیان. نەخێر، با لەسەر پلانەکە بڕۆین و خۆم کێشەی پسوولەکان

چارەسەردەکەم. بێتی هەر دەیبۆلاند و دەیوت: ئەتەوێت شەو و ڕۆژ بەدواتا بگەڕێن و داوای پارەکانت لێبکەن؟

کیم: من بە هیچ شێوەیەک نیازی خواردنی پارەی کەسم نییە، من ئامادەم بۆیان ڕونبکەمەوە کە هەموو پارەکەیان دەدەمەوە، بەڵام تەنها پێویستە تۆزێک لەسەرم بوەستن. من تەنها ئەمەوێت تۆزێک خێراتر پارەی ئەو سێ هەژمارە زیاد بکات.

لێسلی: دەتوانیت کەمێک ڕونکردنەوە بدەیت لەسەر ئەو سێ هەژمارە؟

سەرەتا، پێویست بوو وەبەرهێنان بکەین، بۆیە هەژمارێکمان دانا بۆ وەبەرهێنان.

دووەم، هەژماری خێرخوازیە، بەتەواوی بڕوام بەوە هەیە بۆ ئەوەی دەستت بکەوێت، پێویستە سەرەتا ببەخشیت.

هەژماری سێهەم، هەژماری پاشەکەوتە، ئەم هەژمارە بۆ کاتی زۆر زەرووری و هەلی تایبەت بەکاردەهێنین.

لێسلی: کەواتە چەمکی "پارە بۆ خۆت دابنێ پێش هەموو شتێک" بەو واتەیە نایەت پارە لە کڕینی شتومەک و کەلوپەک بۆ خۆت خەرج بکەیت، یان گەشتی پێبکەیت، بەڵکو بە واتای ئەوە دێت بناغە بۆ داهاتووت دابنێ.

کیم: زۆر باش لێم تێگەشتووی.

لێسلی: هەرچەن بیری لێدەکەمەوە زۆر قورسە لە سەدا سی داهاتەکەم پاشەکەوت بکەم!

کیم: دڵنیام ئەگەر بۆ ماوەیەک بەردەوام بیت لەسەری زۆر ئاسان دەبێت. زیاتر بیری لێبکەرەوە، بیربکەرەوە کە چۆن بیکەیت، نەک یەکسەر بڵێی ناتوانم بیکەم. ئێستا بیربکەرەوە داهاتی ساڵی پارت چەند بووە؟

لێسلی: ئێ؟

کیم: ئینجا ئێستا بزانە ٪۳۰ ئەو داهاتەت چەند دەکات، ئەگەر ٪۳۰ ت پاشەکەوت بکردایە بزانە ئێستا چەند لە هەژماری بانکیەکەتدا دەبوو.

لێسلی بیری دەکردەوە و زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی بوون.

لێسلی: تا ئێستاش ئەو پلانی ٪۳۰ یە جێبەجێ دەکەیت؟

کیم: بەڵێ، بەڵام ئێستا ڕێژەکەمان زیادکردووە، و ئێستا پاشەکەوتەکەمان بە دەرەجەی یەکەم لە وەبەرهێنان خەرجدەکەین.

گفتوگۆکانمان بەردەوابوو، دوای ئەوە دەستمان کرد بە خواردنی خواردنە بەتامەکانی لێسلی، و چێژمان لە سەیرکردنی دیمەنە جوانەکانی پارکەکە دەبینی..

لە پڕ مۆبایلەکەی لێسلی زەنگی لێدا.

**با پێکەوە ڕاهێنانێک بکەین:**

داهاتی ۱۲ مانگی ڕابردووت بنووسە

ئەگەر ٪۳۰ پاشەکەوت بکردایە، لێرە بینووسە.

۲/ داهاتی مانگانەت چەندە؟ داهاتی یەک مانگت کەڕەتی ۱۲ بکە، بۆ ئەوەی داهاتی ۱۲ مانگی داهاتووت دەستبکەوێت.

چ سەرچاوەی داهاتێکی ترت هەیە لێرە بینوسە

پاشەکەوتی ٪۳۰ لێرە بنووسە.

## بەشی چواردەهەم
## "هاوژینەکەم ڕازی نییە "

بەهێزی, واتای ئەوەیەکە پێویستت بەوە نەبێت دڵی کەس ڕازی بکەیت.

لێسلی بە پەرۆشیەوە وەڵامی تەلەفۆنەکەی دایەوە و ووتی: سڵاو!

ئەوەی ناو تەلەفۆنەکە ووتی: سڵاو لێسلی, منم, پات!

لێسلی پێکەنی و ووتی: پات! هەر دەمزانی کە تۆیت! خۆزگە تۆش لەگەڵمان دەبوویت. هەرچەندە بەشی تۆشمان خواردووە. یەک خولەک, وا دەنگەکەی دەدەم بە دەرەوە. سڵاوێک لە کیم و ترەیسی بکە.

پات: ئۆو! زۆر خۆشحاڵم کە ترەیسی لەوێیە. ئادەی, پێم بڵێن لەوساوە باسی چی دەکەن؟ لە نووکەوە بۆم بگێڕنەوە.

ترەیسی ووتی: خۆزگە تۆش لێرە دەبوویت. بەسەر باسی خۆتدا تەلەفۆنت کرد. ئێستا باسی قسەکانی تۆم بۆ کیم و لێسلی دەکرد کە ئەو ڕۆژە یەکترمان بینی. هەموو ئەو قسانەی کە بۆت کردم لەسەر پارە و وەبەرهێنان و کارکردن. پێم خۆش بوو زیاتر ببیستم لەو قسانە بۆیە لەگەڵ ئەمان کۆبووینەتەوە. بەڕاستی بیرت دەکەین.

پات ووتی: خۆزگە منیش لەوێ بوومایە. بە دنیایەک کێشەدا تێدەپەڕم ئێستا, دڵنیام لەگەڵ ئێوە بوومایە باری شانم زۆر سووکتر دەبوو .

پات بەردەوام بوو و ووتی: دەزانن هەندێک لەو قسانەم گێڕایەوە بۆ هاوژینەکەم کە لە پلازا کردمان. خەمتان نەبێت تەنها ئەوانەم بۆ گێڕایەوە کە باسی وەبەرهێنان و پارەپەیداکردن بوو, نەک ئەوانەی باسی سەردەمی گەنجێتیمان بوون. بەڵام پێم وابێت ئەو

حەوسەڵەی ئەو شتانەی نییە. چونکە بە قسەیەک هێنامیەوە ژێر سفر و ووتی "خوا نەیبڕێ بەشی پێویستمان هەیە, ئیتر بۆ ئەو سەرکێشیە بکەین و پارەکانمان بخەینە مەترسییەوە؟ خەمی لێ مەخۆ."

ئیتر مێردەکەم ئەوەی ووت و بابەتەکەی داخست. کچینە پەرۆیەک لە حاڵی من دادڕن و خەمێک لەمن بخۆن. چۆن بتوانم بابەتی پارەپەیداکردن بکەمەوە لەکاتێکدا نزیکترین کەسم لەگەڵمدا نییە؟

ئێمەش لەو کاتەدا هیچمان بۆ نەووترا و بێدەنگ بووین.

لەدڵی خۆمدا دەمووت: بەراستیی ئەمە گرێ کوێرەیە! باشە چی دەکەیت ئەگەر هاوسەرەکەت هاوشانت نەبێت؟ چۆن دەستپێدەکەیت؟ پاڵپشتی لەکێ وەردەگریت؟ ئەی باشە چۆن ڕێکدەکەوون لەسەر پارە و تێچووی کارەکە؟ ئەمە تەنها کێشەی پارەو بزنس نییە, بابەتەکە لەوە قورسترە. کێشەکە کێشەی پەیوەندی و هاوسەرگیرییە. مێشکم عەوداڵی دۆزینەوەی وەڵامێک بوو.

سەرم هەڵبڕی, لیسلی و ترەیسی هەردووکیان بێدەنگ بووبوون و سەیری منیان دەکرد. وەک ئەوەی پێم بڵێن: دەی کچێ شتێکی پێ بڵێ. چی بکات؟

بەڕاستی نەمدەزانی چی پێ بڵێم. ئاخێر من هەرگیز تووشی دۆخێکی ئاوا نەبووبووم. بە پێچەوانەوە مێردەکەی من شەو و ڕۆژ هانی دەدام و باسی پارەپەیداکردن و وەبەرهێنانی بۆ دەکردم. هەرچۆنێک بێت بیرم کەوتەوە کە چەندین کەسی تر باسی خۆیان بۆ کردووم و گرێی دڵی خۆیان بۆ کردوومەتەوە.

بۆیە دڵنیا بووم کە پات بەتەنها نییە و چەندین کەسی تر ئەم کێشەیەیان هەیە.

بە پاتم ووت: سەیرکە دڵەکەم, لەڕاستیا نازانم چیت پێ بڵێم. چونکە بابەتەکەی تۆ بەس لەسەر پارە نییە, ئەوەی تۆ بابەتی هاوسەرگیری و پەیوەندیەکی هەتاهەتاییە. بۆیە ئێستا ناتوانم هیچ بڵێم. پەلەم لێ مەکە با قسە لەگەڵ چەند کەسێکی تردا بکەم کە هەمان کێشەیان هەبووە و بە وەڵامێکی دڵخۆشکەرەوە دەگەڕێمەوە لات. باشە ماڵەکەم؟

پات ووتی: زۆر باشە, زۆر سوپاست دەکەم

دوای تەلەفوونەکەی پات, بڕیارماندا خۆمان کۆبکەینەوە و بڕۆین پێش ئەوەی جادەوبان قەرەباڵغ ببێت.

بە گشتی ئافرەتان شتێکیان هەیە, ئەویش ئەوەیە کە کاتێک دەیانەوێت گۆڕانکاریەکی گەورە لە ژیانیاندا بکەن, پرس بە کەسانی چواردەور دەکەن و بۆچوونی کەسە نزیکەکانیان وەردەگرن. ئەم تایبەتمەندیە لە خانماندا زیاترە وەک لە پیاوان. هەر لەبەر ئەمەیە کە کاتێک خانمان دەیانەوێت سەوداگەرییەک بکەن, ڕاستەوخۆ ئەم دۆخەیان بۆ دێتە پێش. بە گشتی خانمان دەیانەوێت کەسانی چواردەور بەشدار بکەن لە بڕیارەکانیاندا. بەڵام پیاوان زۆرینەی کات بەتەنها تاوی بابەتێک دەدەنێ.

هاوڕێیەکم زۆر جوان ئەم بابەتەی شی کردەوە. دەیووت کاتێک لە مەلەوانگەیەکداین و بە کۆمەڵێک منداڵی کوڕ دەڵێیت "ئادەی ڕیز بن و پێکەوە خۆتان هەڵبدەنە ناو ئاوەکەوە" هەریەکەیان بە جۆرێک جێبەجێی دەکات و دەیەوێت جیاواز بێت. دەبینیت کە ژیار بەسەرا خۆی هەڵدەداتە ناوەوە, ڕاقی لەسەر سک خۆی هەڵدەدات,

زێـوەر هەوڵ دەدات زۆر دوور بـاز بـدات و داریـان دەیەوێـت زۆرترین کات لەژێر ئاوەکەدا بمێنێتەوە .

بەڵام ئەگەر هەمات شت بە کۆمەڵێک منداڵی کچ بڵێیت, ئاقڵانە دەستی یەک دەگـرن و ڕیـزدەبن و تـا سـێ دەژمێـرن و خۆیـان هەڵدەدەن .

خۆ مـن نـاڵێم ڕکـابەریکردن شـتێکی خـراپە, نـا, مـن هیـوایەتم ڕکـابەریکردنە. بەڵام مەبەستەکەی مـن ئەوەیە کە ئێمەی خانمـان زیـاتر لە پیـاوان وابەستەی یەکتـرین. گرنگـی بە بۆچـوونی یەکتر دەدەیـن و گیـانێکی ڕاوێژکـردن هەیە لە نێوانمانـدا. جـا لەبەرئەمەیە کە زۆر ئاساییە خانمان ئەم پرسیارە لە خۆیان بکەن و بڵێن: باشە چی بکەم ئەگەر هاوژینەکەم ڕازی نەبوو؟

مـن زۆربەی کـات ئەم پرسـیارەم گـوێ لـێ دەبێـت، نەک هەر خانمـان، بەڵکـو پیـاوانیش ئەم پرسـیارە دەکەن. بەڵام هەرگیـز وەڵامێکـی دروسـتم پـێ نەبـووە بـۆی. شانسـی مـن خـاوەنی هاوسەرێک بووم کە زۆر هانی دەدام بڕۆمە ناو دنیای وەبەرهێنان و فێربـوونی شـتی نـوێ و شـکاندنی ترسـەکانەوە. بـۆیە مـن لەم بوارەدا هیچ ئەزموونێکی خۆم نەبووە، بەڵام خۆشبەختانە چەندین کەسی تر دەناسم کە بە هەمـان دۆخدا تێپەڕبوون و ئەزموونیـان هەیە.

چوار ڕێگە هەیە:

١. لەگەڵ هاوژینەکەتدا وەک تیمێک کاربکەن.
٢. بەتەنها کاربکەیت و هاوکاری لە هاوژینەکەت وەربگریت.
٣. بەتەنها کار بکەیت بە بێ پشتیوانی هاوسەرەکەت.
٤. کار نەکەیت و لە ماڵەوە دابنیشیت.

رێگەی یەکەم:

ئەم ڕێگەیە باشترین ڕێگەیە. چی لەوە باشترە کە لەگەڵ هاوژینەکەت پێکەوە کاربکەن! وەک دەوترێت: دوو مێشک باشترە لە مێشکێک. جا ڕامیاری وەبەرهێنانیش پڕیەتی لە کێشمە کێشم و ململانێ، بۆیە بە دڵنیاییەوە کەسێکت لەگەڵدا بێت زۆر باشترە.

زۆربەی کات ئەو هاوسەرانەی پێکەوە کاردەکەن، درک بە چەندین توانا و بەهرە و لێهاتوویی خۆیان دەکەن کە پێشتر هەستیان پێ نەکردووە وە ئەو لێهاتووییانە دەهێننە ناو ئیشەوە.

لە لایەکی ترەوە، چونکە پێکەوە کاردەکەن و پێکەوە هەوڵ دەدەن، زۆربەی کات بابەتیان هەیە قسەی لەسەر بکەن. پێکەوە بڕیارە گەورەکان دەدەن و پێکەوە فێردەبن و کاتی زیاتر پێکەوە بەسەردەبەن. ئەمە جگە لە پارە،هەر بۆیە پەیوەندی خۆشیان باشە. هەروەک جارێک خاتوونێک بەناوی (یاسەمین) ئەمەی بۆ نووسیبووم:

لە پاش سڵاو:

من و هاوسەرەکەم هەمیشە پێمان وابوو کە دەتوانین ژیانێکی باشتر لەم ژیانە کولەمەرگیەی ئێستا بژین و تا هەتایە وەک بەندەیەک کار لەو کۆمپانیایەدا نەکەین کە دڵمان تەقی تیایدا. هەربۆیە دەستمان کرد بە کتێب خوێندنەوە لەو بوارەدا و هەردووکمان پێکەوە زانیارییەکانمان فراوان دەبوو. ڕۆژانە پێکەوە باسی ئەو شتانەمان دەکرد کە فێری دەبووین و بیرۆکەی تازەمان پێکەوە باس دەکرد. وەک خانمێک زۆرم پێ خۆشە کە پشتیوانێکم هەیە هەرچەندە پێویستم پێی نییە، بەڵام خراپ نییە ئەگەر لە پشتت بێ..

رێگای دووەم:

ئەمەش دووەم باشترین رێگەیە. زۆر خۆشە کە بزانین کەسێک لە پشتتە و لەو جەنگەدا هاوکارتە و دڵخۆشە بە بردنەوەت. زۆر خاتوونی زەنگینم بینیوە کە وتوویانە لە یەکەمەوە هاوسەرەکەم پێی وتووم تۆ دەست بکە بەو کارە، من ناتوانم لەگەڵتدا بم و هەمان کار بکەم، بەڵام کەی ویستت دەتوانم هاوکارت بم.

هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە، هەرکاتێک بینی کەوا پارەت دەستکەوتووە و ئیش لە باشیدایە، ئیتر ناتوانێ بەشدار نەبێت لەگەڵتدا. لە جیاتی ئەوەی لە دوورەوە سەیرت بکات، دێتە ناو ئیشەکەوە و دەبێتە سەربازێکی دڵسۆز.

جارێک لە شوێنێک قسەم بۆ کۆمەڵێک لە ئامادەبوان ئەکرد، پرسیارم لێ کردن کە چۆن وا لە هاوسەرەکەت بکەیت کە وەک تۆ حەزی لە کارەکەت و وەبەرهێنان بێت؟ قەت بیرم ناچێتەوە خانمێک لە ریزی دواوە هاواری کرد " بەس پارەکەی نیشان بدە و هیچی ترا"

ئەمە نموونەیەکی زۆر جوانە لە لایەن پیاوێکەوە بە دەستمان گەشتووە کە هاوژینەکەی پێی خۆش نەبووە کە ئەم دەستی کردووە بە ئیشی خۆی. ئێمەی خانمان بە خۆشمەوە، هەستی پێ ناکەین کە بەلای پیاوانەوە چەند گرنگە کە پاڵپشتیان بکەین.

"سەرەتا کە دەستم کرد بە ئیشی خۆم، خێزانم بە ڕاستەوخۆیی هاوکارم نەبوو و لە دوورەوە سەیری دەکرم، ڕۆژ تا ئێوارە کارم دەکرد و جاری وا هەبوو دوو ئیشم دەکرد. ئێواران دەهاتمەوە ماڵەوە پارویەک نانم دەخوارد و لە ماڵ دەچوومە دەرەوە بۆ ئەوەی خانوویەک پەیدا بکەم.

دوای ئەوەی کە چەندین جار دەستم بە ڕووەوە نراوە، لە کۆتایدا کەسێک وتی بەڵێ و ڕازی بوو. بەم شێوەیە خانوویەکم دەستکەوت و مانگانە ٣٥٠ دۆلارم بۆ دەهات، باوەڕ بکەن چەندین جار ویستوومە واز بهێنم بەڵام لە ناخەوە ویستێک پاڵی پێوە دەنام و بەردەوام دەبووم. دوای ئەوەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خێزانم هاتە پشتم و هاوکاری کردم، ئەوە یەکێک بوو لە گەورەترین نهێنیەکانی سەرکەوتنم.

من ساڵانێک ئاوا خەریک بووم، دوای ئیش شەوانە تا درەنگ کارم لەو خانووە کۆنانەدا دەکرد کە کڕیومن و چاکم دەکردنەوە. خۆ ئەگەر ئەو کاتانە خێزانم هاوکارم بوایە، زۆر باشتر دەبوو، بەڵام من چاوەڕوانی ئەو نەبووم.

لەوکاتەدا بوو کە دوای ئەوەی هیلاکی و قوربانیدانی منی بینی، وە لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە پارە و قازانجی ئیشەکەی بینی ئەویش هاتە پاڵم و هاوکارم بوو.

دەزانم کارێکی ئاسان نەبوو کە ئیش بکات لەگەڵمدا و دوو منداڵیش بەخێو بکات. بەڵام ڕۆژگارێکی زۆر باشمان تێپەڕاند و شتی زۆر باش فێربووین پێکەوە. زۆر سوپاسی خێزانم دەکەم، ئێستا پەیوەندیمان زۆر لە جاران باشترە، چونکە هەموو کارێکمان پێکەوە کردووە. بەڵێ، پێکەوە".

ڕێگەی سێهەم:

ئەمەیان ئاسان نییە، خۆی لە خۆیدا دنیای وەبەرهێنان و پارە پەیداکردن دنیایەکی تازەیە. جا تۆ لەم دۆخەدا هەنگاو دەنێی بەرەوە ئەو دنیایە و لە هەمان کاتدا هاوکاری نزیکترین کەسی ژیانت پێ ناگات و هاودەستت نیە. بۆیە کەش و فش ناکەم و ناڵێم ئاسانە، نەوەڵا ئاسان نییە. بەڵام بەپێی کات، وەک ئەو هاوڕێیەی

سەرەوە باسی کردم دوای ئەوەی کە چەند سەرکەوتنێکی تۆی بینی وپارەی بینی، ئەگەریکی زۆر هەیە کە ببێتە پشتیوانێکی سەرسەختی تۆ .

لەم دۆخەدا، زۆرینەی خانمان هاوکاری و پارە لە کەسە نزیکەکانیان و وەبەرهێنەر و هاوڕێکانیان وەردەگرن. بۆیە ئەگەر هاوڕێت هەیە هەوڵبە با ئەو کەسانە بن کە هەمان ئامانجی تۆیان هەیە و دەتوانن لەم دۆخە ناهەموارەدا هاوکارت بن.

**ڕێگەی چوارەم :**

پێم ناخۆشە ئەمە بە ڕێگە ناو بنێم، بەڵام ئەمە ڕاستیە. ئەگەر ئامادەنیت هیچ کام لەمانەی سەرەوە بکەیت. کەواتە ئەبێت دابنیشیت و هیچ نەکەیت. هیچ ڕێگەیەک نییە کە بە چاوتروکانێک وابکات هاوژینەکەت ڕازی ببێت. بەڵام خۆشبەختانە لە هەموو گۆشەیەکی ئەم جیهانەدا خانمانێک هەن کە بەبێ هاوکاری کەس توانیویانە ئەو ئامانجە بپێکن.

**چۆن وا دەکەیت هاوژینەکەت پاڵپشتت بێ؟**

کاتێک ئەم پرسیارەم لە چەند وەبەرهێنێکی هاوڕێم کرد، چەندین وەڵامی باش و زیرەکانەم دەستکەوت کە ئەمە هەندێکیانە:

**مێگان:**

مێگان زۆر دەمێک بوو نیازی ئەوەی هەبوو خۆی هەڵبداتە ناو دنیای ئیشی سەربەخۆ و وەبەرهێنانەوە، بۆ ماوەی دوو ساڵ خۆی بۆ ئامادەکرد.دوای ئەوەی کە کاتی خۆی هات، لەگەڵ (جێف)ی هاوسەری دانیشتن و پێی ووت کە پلانێکی وای هەیە و پێی خۆشە پێکەوە بیکەن.

جێف ووتی: بەخوا من حەوسەڵەی ئەوەم نییە، من ڕۆژ تا ئێوارە لە ئیشم و کاتی ئەوەم نییە. دیارە تۆ زۆر حەزت لێیەتی بۆیە تۆ خۆتی پێوە سەرقاڵ بکە و زوو زوو ئاگادارم بکەرەوە خەریکی چیت.

میگان زۆر بێتاقەت بوو چونکە هاوسەرەکەی وەک ئەم بەپەرۆش نەبوو، بەڵام لانی کەم خۆ ووتی کە زوو زوو پێی بڵێت کە چی ئەکات، ئەمە هەواڵێکی خۆش بوو.

میگان حەزی بەوە بوو کە خانوویەکی کۆن بکڕێت و دەستێکی پیا بهێنێت و بیدات بە کرێ. لە گەڕەکێک خانوویەکی دۆزییەوە کە نرخەکەی گوونجاو بوو، دوای ئەوە یەکەم شت کە بیری لێ کردەوە ئەوە بوو کە چۆن وا بکات جێف بهێنێتە ناو ئیشەکەوە.

ڕۆژێک ووتی جێف با بۆ نانی بەیانی برۆینە دەرەوە،شوێنێکی زۆر خۆشم دۆزیوەتەوە. میگان بە هێواشی بەبەردەم خانووەکەدا جێفی برد ، ووتی جێف سەیری ئەو خانووە بکە، ئەگەر ئەمە هی تۆ بێت، چی لێ دەکەیت بۆ ئەوەی سەرنجڕاکێش بێت؟

جێف خۆی دیزاینەر بوو، بۆیە مێشکی زۆرباش کاری دەکرد بۆ ئەو شتانە. بە دیقەتەوە ووتی باخچەکەی پاک دەکەمەوە و دیوارەکانی بۆیاخێکی جوان دەکەم و دەرگاکەی سەرەوەش دەگۆڕم.

میگان ووتی: ئەی بۆ نایەی پێکەوە بیکەین؟

جێف بە سەرسوڕمانەوە ووتی: مەبەستت چییە؟ دواتر ووتی: ناشێ بەتەمابیت ئەم خانووە بکڕیت؟

میگان توانی بەو کارە زیرەکانەیەی دڵی جێف ڕازی بکات و لەو ڕۆژەوە ئەو دوانە پێکەوە کاریان دەکرد. میگان زۆر بە زیرەکانە توانی بەهرەی جێف بقۆزێتەوە و وای لێ بکات حەز لە کارەکە

بکات. کاتێک میگان باسی خانوو و نوسینگە و کرێچی دەکرد، جێف تاقەتی نەبوو، بەڵام کاتێک هات لە ڕووە هوونەرییەکەوە سەرنجی جێفی ڕاکێشا، کارەکە زۆر ئاسان و سەرنجڕاکێش بوو. کاتێک ئەم باسەم بۆ هاوڕێیەکم باس کرد کە هاوسەرەکەی نەیدەویست بەشداربێت. ووتی ئەوە تەواوە! هاوسەرەکەم هەر باخچەیەک ببینێ قسەی لەسەر دەکات چونکە خۆی باخەوانە. ئێستا دەتوانێت باخەکەی خۆمان باشتر بکات.

**ئێدوین :** من لەگەڵ خێزان و منداڵەکانمدا یاری (کاشفلۆ)مان دەکرد زوو زوو. بەو جۆرە ئەوانیشم وا لێکرد کە حەزیان بۆی دروست ببێت. بۆ نموونە بەلای خانوویەکدا تێپەڕدەبووین و دەمانووت بزانین کێ دەزانێ نرخی ئەو خانووە چەندە؟ چەند مەترە و چەند ژووری نووستنی تێدایە؟ دواتر دەچووین لە دەرگامان دەدا و پرسیارمان دەکرد بزانین کێ ڕاستی کردووە. بەم جۆرە وەک یارییەک لای ئەوان شیرینم دەکرد.

**لیا:** لیاخان زۆر بە زیرەکانە بۆی ڕۆیشتووە.

کاتێک باوکم کتێبی (بە گەنجی و بە زەنگینی خانەنشین بە)ی بۆ هێنام, زۆر دڵم پێی خۆش بوو. خەونی لەمێژینەم بوو بتوانم لەڕووی داراییەوە سەربەخۆ بم و دەست لەکەس پان نەکەمەوە. زۆر هەوڵم دا ئەو تێبینیانەی کە دەمنووسی بۆ هاوسەرەکەمی باس بکەم بەڵام ئەو خوێنەر نییە و تاقەتی نەبوو.

دەردەدڵی خۆم لای هاوڕێیەکم دەکرد, ئەویش دەیزانی بەم نزیکانە گەشتێکمان هەیە کە شەش کاتژمێر دوورە و دەبێت بە ئۆتۆمبێل بڕۆین. بۆیە (سی دی)یەکی کتێبی (باوکی زەنگین و باوکی هەژار)ی پێدام. لە گەشتەکەدا هاوسەرەکەم چاری نەبوو هەر دەبوو گوێی لێ بگرێت. بەو شێوەیە ئەو کتێبە وەک

جادوویەک چووە مێشکییەوە و تا هاتینەوە لە گەشتەکە باس باسی ئەوە بوو کە چۆن وەبەرهێنان بکەین و چۆن ژیانمان بگۆڕین .

ئەندریا : هاوسەرەکەم یەکێک بوو لە بازرگانە گەورەکانی بواری پشکسازی و بازاڕی ئاڵ و گۆڕی دراو. بەڵام دوای قەیرانە گەورەکەی ساڵی ١٩٩٨ ی ئاسیا, زیانێکی زۆری کرد و نیوەی سەروەتەکەمان لەدەست دا .

دواتر بەرەو ئەمریکا سەری خۆمان هەڵگرت و لەوێش هاوسەرەکەم تووشی زیانێکی گەورە بووەوە و هەرچی مابووەوە لەدەستمان دا و ئاو بهێنە و دەست بشۆ!

لە ساڵی ٢٠٠٠ دا چەند مامەڵەیەکمان کرد و لەو کاتەدا بە دووقات قازانجمان دەکرد ئەگەر بمانفرۆشتایە. زۆر هاوارم کرد کە بیفرۆشین و شتێک قازانج بکەین, بەڵام هاوسەرەکەم گوێی لێ نەگرتم و ووتی با چاوەڕوان بین. منیش خاتوونێکی گوێڕایەڵی بێدەنگ بووم و زیاتر درێژەم پێ نەدا. دوای تەنها دوو هەفتە, بازاڕ شکا و هەرچی هەمانبوو و نەمانبوو تیاچوو.

لە ساڵی ٢٠٠١ دا باری داراییمان تەواو خراپ بوو و خێرمان پێ دەشیا هێندە داماو بووین. لەو کاتەدا تەواو بەدەست نەبوونیەوە دەماننااڵاند. ئیتر پەتی ئارامی منیش پچڕا و تەواو پەست بووم لەو هەموو بڕیارە هەڵانەی هاوسەرەکەم دەیدا. بەو پەڕی هێزی خاتوونانەوە چوومە بەردەمی و پێم ووت کە ناکرێ هەتاهەتایە باجی هەڵەکانی ئەو بدەین. داوام لێکرد کە ئەگەر بۆ جارێکیش بووە وەک هاوبەشێکی ژیانی گوێم لێ بگرێت و بەقسەم بکات. بە توورەییەوە پێم ووت کە ناکرێ چی جارێک باسی پارەی لەگەڵدا بکەم خۆی لێ کەڕ بکات و توورە ببێت. ووتم کە پێویستە

دانیشین و بە جددی باس لەم قورە خەستە بکەین کە تیایدا چەقیوین. پێم ووت کە یان حسابی مرۆڤێکم بۆ بکات و گوێم لێ بگرێت و هەردووکمان وەک تیمێک کار دەکەین, یان چیتر خۆم ناکەمە قووربانی هەڵەکانی ئەو و هەریەکەمان بەڕێ ی خۆی. چونکە ئەگەر وام نەکردایە دەمزانی داهاتووی خۆمان و ئەو چوار منداڵە هەناسەساردەمان چی لێ بەسەردەهات.

خۆشبەختانە شتەکان باش ڕۆیشتن و ئەویش ئامادە بوو گوێم بۆ بگرێت. چیتر قسەکانم فەرامۆش نەدەکرا و ئێستا وەک هاوبەشێکی ژیان و هاوبەشێکی کار مامەڵم دەکرد. ئێستا شتەکان زۆر گۆڕاون و سەروەتێکی باشمان پێکەوە ناوە .

بەڵێ دەزانم کارێکی قورسە ئەگەر هاوسەرەکەتت لەگەڵ نەبێت و هاوشانت نەبێت. هیوادارم پێویست بە هەڕەشەی جیابوونەوە نەکات بۆئەوەی خەبەری ببێتەوە.

بەجۆرێکی تر:

کاتێک قسە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکەیت کە ئەم کێشەیەیان هەبووە، بەگشتی دوو جۆر پێشنیارت گوێ لێ دەبێت.

یەکەم: هەتا ئەتوانیت هەوڵ بدە هاوژینەکەت ڕازی بکە کە پێکەوە کاربکەن و ئەویش بکە بە بەشێک لە کارەکە. لەوانەیە سەرەتا بەوە بێت کە هانی بدەیت ئەو بابەتانە بخوێنێتەوە کە دەربارەی ئیشەکەیە و لەوێوە ووردە ووردە حەزی لێ دەکات.

زۆرینەی خەڵک وتوویانە کە تەنها بەوە توانیویانە هاوژینەکانیان ڕازی بکەن کە ئەوانیشیان هێناوەتە ناو ئیشەکەوە. دوورخستنەوەی ئەوان لە ئیشەکە باش نییە. هەموو شتێک بە گفتووگۆ چارەسەر دەبێت، نەک بە دوورکەوتنەوە.

خـــــاڵی دووەم ئەوەیە: ئەگەر خانمـــــان نەیـــانتوانی وا لە هاوسەرەکەیان بکەن کە خۆی بدات لە دنیای بزنس و ئیش و کار، ئەوا بـا یەکەمجـار خـۆی دەسـت پێبکـات و دواتـر وورده وورده هاوژینەکەی خۆی ڕازی دەبێت.

یەکێک لەو خانمانە بۆی نووسیبووم: دەمزانی ئەوە ئەرکی منە و پێویستە من ڕێچکەشکێن بم، دەمزانی کاتێک دەبینێ من هێندە بەپەرۆشم ئەویش دێت و هاوکارم دەبێت.هەر وەهاش دەرچوو. لە هەمووی گرنگتر کاتێک پارەی بینی، چیتر نەیتوانی خۆی بگرێت!

**کاریگەری پارە لەسەر پەیوەندی نێوانتان**

هەمـوو ئەم قسـانەی پێشـوو دەکرێـت پرسـیارێک بهێنێـتە نـاو مێشکی هەمووتانەوە پرسیارەکەش ئەمەیە:

"کاتێـک بـابەتی پـارە دێـتە گـۆڕێ، ئیـدی پەیوەنـدییەکان چییـان بەسەردێت؟" ئایا هیچ کات لەگەڵ هاوژینەکەت باسی پارە دەکەن؟ ئایا تەنها یەک کەس بڕیاری ماڵ دەدات و هەمـوو ئەو بڕیـارانەی پەیوەنـدی بە پـارەوە هەیە ئەو دەیـدات؟ ئایـا پـێکەوە باسـی ئەو بابەتـانە دەکەن کە پەیوەنـدی بە پـارەوە هەیە؟ ئایـا پـێکەوە بڕیـار دەدەن؟

هۆکاری ئەم پرسیارانە ئەوەیە، دەووترێت کە ناخۆشترین دوو بابەت بۆ گفتوگۆ کردن (پارە) و (پەیوەندەی)یە جا تۆ وەرە ئەم دوو بـابەتە پـێکەوە بـاس بـکە، ئەکرێـت ئەوەی چـاوەڕوانی ناکەیـت ڕوودات. ئەزانیت ئەو بابەتەی کە زۆرینەی هاوژینەکان دەمەقاڵێی لەسەردەکەن چییە؟ پارەیە، پارە!

دەتەوێت زەنگین بیت؟

یەکەمجار (ڕۆبێرت) پێی ووتم: هیچ کێشەیەکت هەیە لەگەڵ زەنگین بوون؟

لەخۆمم پرسی " ئەوە چ جۆرە پرسیارێکە؟ کێ هەیە کێشەی هەبێت لەگەڵ زەنگین بوون؟ هەموو کەس حەزدەکات زەنگین ببێت." دواتر بە ڕۆبێرتم ووت کە هیچ کێشەیەکم نییە و منیش حەزم لێیە، بەڵام بۆ دەپرسێت؟

ووتی: بەلاتەوە سەیر نەبێت چەندەها خاتوون هەیە پێیان ناخۆشە باسی پارە بکەیت و مێشکت بەو بابەتەوە هیلاک بکەیت. پێیان وایە زەنگین بوون خەیاڵپلاویە و خەونێکی شاعیرانەیە. خەڵکێکی زۆر هەیە کە هەر پێی عەیبە باسی پارە بکەیت! شتێکی سەیرە پێت عەیب بێت باسی شتێک بکەیت کە ڕۆژانە بەکاری دەهێنیت و کاری بۆ دەکەیت. من هەرگیز لەوە تێناگەم بۆ دەبێت عەیب بێت؟ باوکی زەنگین هەمیشە دەیووت "پارە گرنگترین شتی ژیان نییە، بەڵام کاریگەری لەسەر گرنگترین شتی ژیان درووست دەکات، وەک تەندروستی، پەروەردەی خۆت و منداڵەکانت، خواردن، خانوو، هتد." من بەنیازم ببمە زەنگینێکی زۆر گەورە. بۆیە ویستم بزانم تۆ دەڵێیت چی؟

ئەو ڕۆژە زۆر باسی ئەو بابەتەمان کرد پێکەوە، باسی پارە و ئەوجۆرە ژیانەی کە دەمانەوێت بژین. دەبوو باس بکرێت، ئاخر پارە بابەتێکی گەورەی هەموو ماڵێکە. زۆرینەی هەڵسوکەوتی ناو خانەوادەکان لە پارەوە سەرچاوە دەگرێت. بە منداڵی هەموومان باسی پارە و نەبوونی پارەمان لەگەڵدا کراوە و کاریگەری لەسەر ژیانی ئێستاشمان هەبووە.

بەڕاستی گفتووگۆیەکی خۆش بوو، تا ئەو دەقەیە هیچ کات گفتوگۆی ئاوام لەگەڵ کەس نەکردبوو. بەڵام ئەو گفتووگۆیە زۆر جیاوازبوو و چەندین پرسیاری لە مێشکمدا ووروژاند. ئەو ڕۆژە زۆر بۆچوونی یەکترمان بۆ ڕوون بووەوە لەسەر پارە و لەوێوە باسی زۆر بابەتی ترمان کرد کە پەیوەندی بە پارە و خەرجی و داهاتەوە هەبوو. ئەتوانم بڵێم زۆربەی ئەو بابەتانەی کە چەندێک بوو شاراوە بوون، باسکران.

**چۆن باسی پارە بکەین؟**

ئەگەر ڕووت نایات زۆر بە ڕاشکاوانە باسی پارە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکەیت کە هاوژینتە یاخود بەنیازی ببێت بە هاوژینت، ئەوا لە دانیشتنێکی تایبەتدا ئەم باس و خواسە بکەن.

- لەماڵی باوکت چی تێڕوانینێکت بۆ درووست بووە لەسەر پارە؟
- تۆش وەک دایک و باوکت بیر لە پارە دەکەیتەوە؟
- پارە لای تۆ چی دەگەیەنێت؟
- بۆچوونی تۆ چییە لەسەر کەسە زەنگینەکان؟
- چەندەت پارە هەبێ باشە و زەنگینیت؟

زۆرینەی خەڵک حەزیان لە باسی پارە نییە، بۆیە ئەگەر ئەو کەسەی بەرامبەرت ئاماژەی بەوەدا کە حەزی لەم بابەتە نییە، ئەوا بەلاتەوە ئاسایی بێت، هەر بابەتێک دەکرێتەوە و کەسی بەرامبەر پێی ئاسوودە نییە، ئەمە ڕوودەدات. پێویستە لە چەند لایەکەوە بۆی بڕۆیت هەتا لە یەکێکیانەوە ئەیگرێت و وەڵام وەردەگریت. هەرئەوەتا یەکەم هەنگاوتان بۆ هەڵهێنا، ئەوەی تری ئاسانە.

**با بگەڕێینەوە بۆ سەر باسی (پات)**

تەلەفونێکم بۆ (پات) کرد و بیرم خستەوە کە کۆتا جار باسی چیمان کرد. باسی ئەوەمان کرد کە چۆن لەگەڵ هاوسەرەکەی خەرجی هاوسەرگیریان تاووتوێ کردووە. سەرم سوڕما کاتێک پێی ووتم تا ئێستا باسی ئەو شتانەمان نەکردووە. ووتی کە مێردەکەی پارەیەکی باش پەیدا دەکات و هەموو خەرجیەک دەدات. جارجار باسی خەرجی خانوو و گەشت و ئۆتومبێل دەکەین، بەڵام لەوە زیاتر باسی ناکەین و ئەو خۆی هەمووی ئەگرێتە ئەستۆ. چەند چیرۆکێکم بۆ پات خوێندەوە کە باس لە ئەو خاتوونانە دەکات کە وەک پات بوون و دەستیان پێکردووە. پات گوێی هەڵخستبوو بۆ قسەکانم و هەستم پێدەکرد ووردە مێشکی دەجولێ.

پات بەپەرۆشەوە ووتی: زۆر زۆر سوپاس بۆ ووتەکانت، بەڕاستی ئێستا زۆر بەرچاو ڕۆشنترم. زۆر خۆشحاڵم کە چەندین خانمی تریش هەبوون وەک من هەمان کێشەیان هەبووە و توانیویانە چارەی بکەن. پێشتر سەرم لێ شێوابوو، بەڵام ئێستا بەرچاوڕوونم. لەڕاستیدا دەترسام ئەمە کێشە بۆ ژیانی هاوسەریمان درووست بکات، بەڵام کاتێک دەبیستم کە چارەسەری هەیە، هێندەی تر ئارام و ئاسوودە دەبم. ئێستا دەتوانم دەست پێ بکەم و چیتر لەو حەسرەتەدا نەبم کە هاوسەرەکەم لەوانەیە پاڵپشتم نەبێت. دڵنیام کە ئەگەر بەقسەی تۆ بکەم، هاوسەرەکەم ڕازی دەبێت چونکە ئەمە ژیانی هاوسەریمان بەهێزتر دەکات. خۆ ئەگەر پاڵپشتیشم نەبێت، هەر ناهێڵم خەونەکەم لەگۆڕ بنرێ، خەمت نەبێت هەرشتێک بوو ئاگادارت دەکەمەوە.

هەستم بەو گڕووتینە دەکرد کە لە دەنگی (پات)دا هەبوو. پێم ووت: پات، هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم، باش دەتناسم، ئەزانم کە مێشکت ووتی شتێک دەکەم هەر دەیکەیت، بڕوای تەواوم پێتە،خوات لەگەڵ.

کە تەلەفونەکەم داخستەوە ئاهێک بەدڵمدا هات. تەواو چیتر خەمی (پات)م نەبوو، لەڕاستیدا ئەوە هاوسەرەکەی پات بوو دەبوایە خەمی لێ بخۆم چونکە ژیانی بەرەو گۆڕانێکی گەورە دەڕوات.

# بەشی پانزدەهەم
# "بۆچی خانمان دەتوانن ببن بە وەبەرهێنێکی سەرکەوتوو؟"

"ئێمەی خانمان گرنگ نییە لامان وێنەمان لەسەر پارەکان بێت، بەڵکو دەمانەوێت دەستمان لەسەری بێت" - ئیڤی بەیکەر-

ئێستا کاتی ئەوەیە هەموو ئەو قسە کۆنانە لەبیربکرین کە لەسەر خانمان کراون لە کۆندا. کاتی ئەوەیە کە هەموو ئەو بۆچوونانە بەرپەچ بدەینەوە کە لەسەر خانمان دەووترێن. جارێک لە جێگەیەک باسی ئەوەم کرد کە نیازم هەیە کتێبێک بنووسم لەسەر (خانمان و پرۆژەی وەبەرهێنا)، پیاوێک بە گاڵتەجارییەوە وتی: خانمان و وەبەرهێنان؟ ئەو دوو وشەیە دژی یەکترن. خانمان و وەبەرهێنانیان نەوتووە، خانمان و خەرجکردنیان وتووە.

بڕیارمدا وەڵامی نەدەمەوە چونکە هەمووکەس شایەنی ئەوە نییە دەمەقاڵێی لەگەڵدا بکەین. دەکرێ وا خۆمان دەرخەین کە زیرەک نین، دەکرێت وا خۆمان دەرخەین کە شارەزاییەکی ئەوتۆمان نییە و سەرەودەر لە بابەتی پارە ناکەین. دەتوانین ڕۆڵی ئەو خانمە بگێرین کە لە پشتی پیاوەکەوەیەتی (جا ئەم پیاوە دەکرێت هاوسەرەکەت یان بەڕێوبەرەکەت یان هاوبەشەکەت) بێت. ئەمانە ئەو بۆچوونانەن کە دژی خانمانن و ئێمەش دژیان دەجەنگین.

ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئێمەی خانمان زیرەکین و زۆر زیاتر لەوە دەزانین کە تا ئێستا نیشانمان داوە. هەست بە هەموو شتێک دەکەین و ئەو بەهرەیەمان هەیە. بەڵام پێشتر بابەتی پارە و داهات و وەبەرهێنان کاری خانمان نەبووە و ڕێگەنەدراون. ئێ چی؟ ئەوە کەی کێشەیە؟ ژیان گۆڕاوە و بەردەوامیش لەگۆڕاندا بووە و ئێستاش لە گۆڕاندایە.

چیتر ئەو بیانووە قبووڵ نییە کە بڵێن "من سەرەودەر لە پارە ناکەم،یان من هیچ لەوەربهێنان نازانم." ڕابردوو هیچ گرنگ نییە چۆن بووە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە تۆ ئەمڕۆ چ بڕیارێک دەدەیت؟

"بڕیارەکە لە دەست تۆدایە"

ئەوەندەی من بزانم دوو بڕیارت لەدەست دێت:

١. یان ئەوەتا بڵێیت من هیچ نازانم و بۆ خۆت دانیشیت و سەری خۆت کزبکەیت و ئەگەر مووچەیەک هەبوو وەریبگریت و خەرجی دەرکەیت!

٢. یان ئەوەتا درک بەو ڕاستیە بکەیت کە تەنها خۆت دەتوانیت ژیانی خۆت بگۆڕیت و زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ پارە بکەیت و خۆت ئامادە بکەیت و دەستبەکاربیت.

هەربەڕاست ئێستا کاتی بڕیاردانە (لەوانەیە هەندێکتان ئێستا بڕیارتان دابێت) حەز ئەکەیت بڕۆ بەدوایدا و لەسەری بخوێنەرەوە. حەز دەکەیت شەو و ڕۆژ تا کۆتایی ژیانت هەر بیری لێبکەرەوە. بەڵام لە کۆتایدا هەر دەبێت بڕیاربدەیت کە یەکێک لەو دوو بڕیارە بدەیت و خۆت ساغ بکەیتەوە. بۆیە پێشنیار دەکەم ئێستا بیکەیت.

بڕیارەکە ئەمەیە: هەرشتێک پێویست بکات دەیکەم بۆ ئەوەی بگەم بەوەی کە خۆم کۆنترۆڵی باری دارایی خۆم بکەم و سەرکەوتووبم یان نا. ئەگەر ئامادە نەبم، کەواتە خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەوەی کەسێکی تر کۆنترۆڵی باری دارایم بکات و هەموو بڕیارەکان لەدەست ئەودا بێت و دەرەنجامەکەشی قبووڵ بکەم. خۆ ئەگەرنا، کەواتە هەموو بیانووەکان بەلاوە دەنێم و دەستبەکاردەبم. زۆر بە ئاسانی، تەنها ئەم دووانە هەیە.

## هەنگاونان بەرەو داهاتووت

تا ئەم دەقەیە باسی ئەوەمان کردووە کە ئەو بیر و بۆچوونە هەڵەو باوانە چین کە ئێمەی خانمانی بەستووەتەوە و ناهێڵێ بەرەوە دنیای دارایی هەنگاو بنێین. ئێستا کاتی ئەوەیە بەرەو داهاتووت هەنگاو بنێیت.

چۆن دەبیت بە وەبەرهێنێکی سەرکەوتوو ئەگەر سەرەتاتە؟ یان چۆن دەبیت بە خاتوونێکی وبەرهێنی سەرکەوتوتر ئەگەر خۆت ئێستا سەرکەوتوویت؟

## هەواڵە خۆشەکە:

با لە هەواڵێکی خۆشەوە دەستپێبکەین. هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە کە خانمان دەتوانن ببن بە بازرگانێکی زۆر سەرکەوتوو. ئامارەکان وا دەڵێن و زانست سەلماندوویەتی. وە هەموو ئەو خانمە زەنگین و وەبەرهێنەرانەی من ناسیوومن لە سەرتاسەری جیهاندا سەلماندوویانە و هەموو ڕۆژێک خانمی نوێ دەیسەلمێنن. ئامارەکان ئەوە دەسەلمێنن کە خانمان هەر لە سروشتیاندا سەرکەوتنی دارایی بوونی هەیە. سەیرێکی ئەمانە بکە:

- لە ساڵی ٢٠٠٠ دامەزراوەی وەبەرهێنانی نەتەوەیی ڕایگەیاند کە لە سەدا ٣٢ی داهاتی گەڕاوە، کۆمپانیاکانی تایبەت بە خانمان بەدەستیان هێناوە و تەنها لە سەدا ٢٣ی کۆمپانیاکانی پیاوان هێناویانە لە ساڵی ١٩٥١
- (Terrance Odean)توێژینەوەیەک لە زانکۆی کالیفۆرنیا کراوە لەلایەن پرۆفیسۆر لەسەر هەڵسوکەوتی بازرگانی. دەرکەوتووە کە خانمان بەڕێژەی ١.٤ باشترن.

**هەشت هۆکار وادەکات خانمان لەکاری وەبەرهێناندا سەرکەوتووبن**

**١. ئێمە لە ووتنی "نازانم" ناترسین**

دەتوانم بڵێم یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی سەرکەوتنی خانمان لە کاروو باری بازرگانیدا ئەوەیە کە ئێمە پێمان شەرم نییە بڵێین "نازانم" ئێمە بەلامانەوە ئاساییە ئەگەر لە شتێکیش نەزانین، دانی پیادەنێین و پرسیار دەکەین. ئەو کەسەی پێی وایە هەموو شتێک دەزانێت و پێی شەرمە دان بە نەزانی خۆیدا بنێت. ئەوە هەرگیز فێری شتی نوێ نابێت و گەشە ناکات. ئەگەر وا خۆت دەربخەیت کە لەهەموو شتێکدا شارەزایت ئەوا هەرگیز پرسیار ناکەیت. کاتێک پرسیار ناکەیت، زانیاری نوێ نابیستیت بۆیە مێشکت گەشە ناکات، لەزانیاری نوێ دادەبڕێیت. ئەوانەی وا دەزانن ئەگەر پرسیار بکەن گێژ دەردەکەون، ئەوانە گێژی ڕاستەقینەن.

هاوڕێیەکم هەیە بەناوی (فرانک) ئەم فرانکە تەمەنی ٨٥ ساڵە. ئەم هاوڕێیەم بازرگانێکی زۆر شارەزا و زەنگینە. ئەوەی زۆرسەرنجم ڕادەکێشێت ئەوەیە کە فرانک بەو تەمەنەوە وەک منداڵێکی ٧ ساڵان پرسیار لەهەموو شتێک دەکات و دەچێتە بنج و بناوانی هەموو کارێک و پرسیار دەربارەی هەموو شتێک دەکات. ڕۆژێک لەگەڵ فرانکدا بووین و کەسێکی ٣٥ ساڵانمان بینی.

فرانک لێی پرسی: چ جۆرە کارێک دەکەیت؟

کابرا ووتی: لە وۆڵ ستریت کاردەکەم، لەگەڵ ئەو کۆمپانیایانەی کە بەرەو بەناوبانگ بوون دەچن.

فرانک ووتی: بەخوا شتێکی چاکە! ئەی ئیشەکە چۆنە و چۆن نییە؟

کابرا نزیکەی ٢٠ خولەک باسی کارەکەی بۆ کرد و فرانک یەک ووشە لەزاری نەهاتە دەرەوە و هەر گوێی هەڵخستبوو. کەڕۆیشت فرانک ووتی "شتێکی زۆرباش بوو".

شتە سەیرەکە لەوەدایە کە فرانک لە ٢٠ ساڵییەوە لە وۆل ستریت کاردەکات و چەندین کۆمپانیای بەناوبانگ کردووە و هێندەی چەند کتێب زانیاری پێیە لەسەر ئەو بوارە. بەڵام هێشتا گوێ لە گەنجێک دەگرێت و نیازی ئەوەی هەتە کە شتی نوێ فێربێت. فرانک جوانترین نموونەیە بۆمن. ئەو هەمیشە پرسیار دەکات و شتی نوێ وەردەگرێت، هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەو هەموو زانیارییەی پێیە.

هەر ئەوەندەی کە ئێمەی خانمان پرسیاری زۆر دەکەین لەسەر ئەو شتەی نایزانین، ئەمە چەندین دەرگای نوێ دەکاتەوە بۆمان و زانیاری نوێ وەردەگرین. جاری وا هەیە ئەم پرسیار لە کەسێک دەکەیت و داوای شیکردنەوەی لێ دەکەیت، جاری واش هەیە لە شوێنێکەوە گوێت لە شتێک دەبێت و دواتر دەڕۆیت لە ئینتەرنێت یان لە کتێبخانەیەک بەدواداچوونی بۆ دەکەیت.

بەتەواوی باوەڕم بەوە هەیە کە ئێمەی خانمان لە ووتنی "نازانم" زۆر سوود وەردەگرین و زانیاریەکانمان زۆر فراوان دەکات. ئەم دانپیانانە باوەڕبەخۆبوونی دەوێت. ئەوانەی پرسیار ناکەن، باوەڕبەخۆبوونیان کەمە. بۆیە شەرم مەکە و بڕۆ پرسیار لەو شتانە بکە کە نایزانیت، سەرت سووڕ دەمێنێت دواتر چەندەی لێ فێردەبیت.

**٢. ئێمە داوای هاوکاری دەکەین**

خـاڵی دووەم لە تایبەتمەنـدیە زۆر باشـەکانی ئـێمەی خانمـان ئەوەیە کە ئێمە زیاتر لە پیاوان داوای هاوکاری دەکەین.

دوانیـوەڕۆیەک سـەردانی دوو هـاوڕێم کـرد بەنـاوی مـاری و کـارڵ کە تـازە هاوسـەرگیرییان کردبـوو. کـارڵ لە تەوالێـتەکە خەریکی چاککردنەوەی بەلوعەیەک بوو، هەرچی کەلووپەل هەیە لەو ناوەدا بڵاوی کردبووەوە. ماری بەلایدا ڕۆیشت و ووتی: کارڵ، بۆ تەلەفوون بۆ ئەو وەستایە ناکەیت و لێی بپرسیت کێشـەکەی چییە؟

کارڵ ووتی: پێویست ناکات ، ئێستا خۆم بە یەک دەقە چارەسەری ئەکەم.

دوای نزیکەی یەک سـەعات، کارڵ لە تەوالێتەکە هـاتە دەرەوە و تەواو شـەکەت بـوو بـوو، بە مـاری ووت: بەخـوا وابزانم هەر ئەبی تەلەفوون بۆ وەستاکە بکەین، کێشـەکە لەوە گەورەترە کە مـن بیرم لێ دەکردەوە.

وەسـتاکە هـات و سـەیری کـرد. کـارەکە وا پێویسـتی دەکـرد کە هەمـوو تەوالێتەکە هەڵوەشـێنێت و بیگۆڕێن. کارڵ ووتی:سـەیرکە! پێم نەووتـی کێشـەکە لەوە گەورەتـرە کە مـن بیـری لـێ دەکەمەوە. دواتر لە ڕێگەی هاوڕێیەکی وەستاکەوە پێمان گەیشت کە وەسـتاکە ووتبووی سـەرەتا ئیشـەکە زۆر ئاسـان بـووە و دەکرا بە گـۆڕینی پـارچەیەکی بچـووک چارەسـەربکرێت. بەڵام کـارڵ ئەوەنە دەستکاری کردووە، کێشەکەی گەورەترکردووە.

یەکەم پێشنیاری ماری ئەوە بوو کە تەلەفۆن بکەن بۆ وەستاکە. بەڵام کارڵ پێداگری کرد. هەمووکات وایە. کچ و کوڕێک لەشـوێنێک

ڕێگەیان لێ وون دەبێت، کچەکە یەکسەر دەڵێت با پرسیار بکەین، بەڵام کوڕەکە دەڵێت نا پێویست ناکات خۆمان ڕێگە دەدۆزینەوە.
لەکاروباری بازرگانیشدا هەر وەهایە، ئێمە پرسیار دەکەین و پیاوان دەیانەوێت خۆیان ڕێگە بدۆزنەوە. خانمان لەم داوای هاوکارییە دوو سوود وەدەگرن:
یەکەم: شتی نوێ فێردەبن.
دووەم: کات بەفیڕۆ نادەن بەوەی کە خۆیان بیدۆزنەوە.

**٣ .خانمان لە بازاڕکردندا یەکەمن**

خانمان لە بازاڕکردندا گاڵتەیان پێ ناکرێت. دەزانی ئەمە پەیوەندی چییە بە وەبەرهێنانەوە؟ خانمان کاتێک بازاڕ دەکەن دنیایە معامەلە دەکەن و لەسەر نرخێکی زۆر گونجاو ڕێک دەکەون. ئێ وەبەرهێنان و بازرگانیش وەهایە. دەگەڕێیت شتێک دەدۆزیتەوە کە نرخەکەی زۆر نزمە و دەیکڕیت.
ڕووث هایدن، ڕاوێژکاری بازرگانیی و نووسەر زۆر جوان باسی کردووە و دەڵێت: ئەگەر ئێمە بەوجۆرەی جل دەکڕین بە هەمان شێوە بازرگانی بکەین، ئەوا حسابی خۆمان نازانین. دەگەڕێین چی شتێک زۆر جوانە و زۆر هەرزانە و داشکاندنی لەسەرە دەیکڕین.
تەنها خانمان لەبەهای ڕاستەقینەی تێ دەگەن. دەگەڕێن بەناوL.V, D.K جلێکی مارکەی دووکانەکەدا و شتێک دەکڕن کە زۆر جوانە و نرخەکەی زۆر گونجاوە، ئێ بازرگانیش وەهایە. بگەڕێ و بزانە کەی نرخی دراو یان پشک گونجاوە بۆ کڕین. یان بگەڕێ بە گەڕەکەکاندا و بزانە کە خانوویەک یان زەویەک نادۆزیتەوە نزخەکەی گونجاو و زۆریش جوان بێت؟
ئەگەر تۆ مشتەری Luis Vinton نەبێت. ئەوا لەبەهای جلێکی جوان تێناگەیت کە نرخەکەی گونجاوە. بەهەمان شێوە، ئەگەر

ئاگـات لە بـازاڕ نەبێـت، لەبەهـای خـانوویەکی جـوانی هەرزان تێناگەیت.هەمان شتە، بڕۆ شتێکی جوان بدۆزەرەوە کە داشکاندنی لەسەربێت. تەواو!

**٤ . خانمان ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن**

هەر لەکـاتی خوێنـدن و زانکۆکـانەوە دیـارە، خانمـان ئەرکـی خۆیـان باشـتر جێبەجـێ دەکەن بەڵام پیـاوان وانەبـوون بەپێـی ئامارەکانی سـەنتەری خانمانی خانەنشین دەرکەوتووە کە خانمـان کـاتی زیـاتر بەسـەردەبەن بەوەی کە ورد ببـنەوە لە کارێـک و تـوێژینەوەی لەسـەر دەکەن. بەڵام پیـاوان زیـاتر دەچـن بەدوای ئەوەدا کە چـاوی زۆری لەسـەرە و خەڵـک پێـی باشـە. ئەمەش پیاوانی لەو بوارەدا لاواز کردووە. خانمـان ناچن کارێک بکەن کە خەڵک پێی باشە، بەڵکو ئەوە دەکەن کە خۆیان باوەڕیان پێیەتی.

**٥. خانمان کاری پڕ مەترسی ناکەن**

هەر بەپێـی ئەو سـەرچاوەیەی لەخـاڵی چوارەمـدا باسـمان کـرد، خانمان کەمتر خۆیان ڕووبەڕووی مەترسی دەکەنەوە. خۆ چەندین جـار گـوێم لـێ بـووە ووتـراوە کە خانمـان لە کـاری بازرگانیـدا سـەرکەوتوو نـابن چـونکە نـاوێرن ڕووبەڕووی مەترسـی ببـنەوە. باشە ئەگەر ئەم قسەیە وایە، شتێکی خراپە بترسیت؟

من خۆم کاتێک نیازی ئەوەم هەیە کارێک بکەم کە کەمێک لێی دوودڵم و زانیـاری تەواوم نییە لەسـەری، دەڕۆم زیاتر لەسـەری دەخـوێنمەوە و قـووڵتر دەچمە بنج و بنـاوانی پێش ئەوەی کە هەر لە خۆمەوە پارەی تێ بکەم. ئەگەر خانمـان لە کارێک بترسن، ئەوا زیـاتر بەدوایـدا دەچـن و زانیـاری زیـاتری لەسـەر کـۆدەکەنەوە و ئەمەش وادەکـات کە سـەرەنجام کـارێکی نـاوازە و پڕ سـەرکەوتن بکەن. ئەمە قسەی من نییە، ئامارەکان وا دەڵێن.

بەڵام شتێک هەیە کە دەبێت ئێمەی خانمان ئاگاداری بین ئەویش ئەوەیە کە نابێت هەر لەسەری بخوێنینەوە و هیچ نەکەین. ئەگەر ئەو ترسە وای لێ کردین کە هەر بەدوایدا بڕۆین و لەسەری بخوێنینەوە، ئەوا هیچمان نابێ بە هیچ. ترس لە قازانجی خۆت بەکاربهێنە، نەک بیکەیت بە ڕێگرێک لەبەردەم خۆتدا.

**٦. خانمان لووتبەرزیان کەمترە**

دڵنیام پیاوان لەمەدا هاوڕام نین

کاتێک قسەو باس دێتە سەر بابەتی پارە و وەبەرهێنان، خانمان کەمتر لووتبەرزی و خۆدەرخستنیان هەیە. چەندین خانمی هاوڕێم هەیە کە کاری وەبەرهێنان دەکەن و زۆر بەجدی ئیشی خۆیان دەکەن و لێکدانەوەی ووردی بۆ دەکەن و خۆیان لەناو کارەکەدان. شتێکی شاراوە نییە کە پیاوان کەمێک حەزیان لەخۆدەرخستن و نیشاندانی ئیشەکەیانە، بەڵام خانمان حەزیان بە دەرخستنی پارەکەیانە. وەک چۆن Ivy Baker لە ساڵی ١٩٥٤ دەڵێت:

"ئێمەی خانمان بەلامانەوە گرنگ نییە کە وێنەمان لەسەر پارە هەبێت، ئەوەی لامان گرنگە ئەوەیە دەستمان لەسەر پارە بێت."

میکا هامڵتۆن لە پەیمانگای وەبەرهێنانی جیهانی نووسیویەتی: بەهۆی ئەوەی کە من لە جێگەیەک کارم دەکرد کە ڕاهێنمان بە خەڵک دەکرد بۆ ئەوەی فێربن چۆن لە بازاڕی ئاڵوگۆڕی دراو و پشکسازیدا مامەڵە بکەن، چەندین کەسم بینیوە کە لە سفرەوە دەستیان پێ کردووە و گەیشتوونەتە لوتکەی سەرکەوتن لە ڕێگەی وەبەرهێنانی جیاوازەوە. لە سەدا ٨٠ ی بەشداربووانی ئێمە پیاو بوون، بەڵام دەتوانم بڵێم کە لەسەدا ٨٠ ی کەسە سەرکەوتووەکان خانمان بوون.

بەهۆی ئەوەوە من ئەو پرسیارە کەوتە مێشکمەوە کە بۆچی وایە؟ بۆچی خانمان سەرکەوتووترن؟ دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، بۆم دەرکەوت کە شتەکە پەیوەندی هەیە بە سێ هۆکارەوە:- لووتبەرزی، لووتبەرزی، لووتبەرزی ئەو شتەی کە لەناو زۆرینەی پیاواندا بەدی دەکرێت لووتبەرزیەکی نێرینەییە.

پیاوان وادەکەن کە ئەو هەستە نێرینەییەیان بڕیار بدات. ئەوکاتەی کە پێوستە شتێک بفرۆشن، دەیهێڵنەوە و نایفرۆشن. کاتی وا شت دەکرێن کە لەبار نییە. پیاوان لووتبەرزیان ڕێگرە لێیان کە پرسیار بکەن، چونکە وادەزانن ئەگەر پرسیار بکەن خەڵک بەگێلیان دادەنێت.

بەواتایەکی تر، پیاوان حەز دەکەن بەهێز و زیرەک و پڕزانیاری دەرکەون. ئەوان وەبەرهێنان ناکەن بۆ ئەوەی قازانج بکەن، بەڵکو وەبەرهێنان دەکەن بۆ ئەوەی بەهێز و زەخم دەرکەون.

بەپێچەوانەوە، خانمان زۆرترین پرسیار دەکەن هەتا بەتەواوی لە بابەتەکە تیدەگەن. لەلایەکی ترەوە خانمان زیاتر ئامانجەکەیان لا گرنگە کە زەنگین بوونە. نەک ئەوەی لەلای خەڵک زەنگین دەرکەون.

کاتێک باسی وەبەرهێنان و کار و کاسپی دەکرێت، خەڵکی زۆربەی مێشکیان دەڕوات بەلای دەرفەت و مەترسیدا. بەڵێ ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە کە بزنس پەیوەستە بە زیرەکی هەستی مرۆڤەوە. زیرەکی هەستەکان ئەوەیە کە سەیری بابەتێک بکەیت و بەڕاستی بڕیاری لەسەر بدەیت و نەهێڵی هەستەکان بەسەرتدا زاڵ بن. بەگشتی خانمان ئەو زیرەکی هەستییەیان بەهێزترە لە پیاوان. ئەم خەسڵەتە وا لە خانمان دەکات کە بتوانن بازرگانی زۆر زیرەکیان لێ درووست ببێت.لەجیاتی ئەوەی بە سەروشکڵی

پڕۆژەیەک سەرسام ببن و بڕیار بدەن، زیاتر کار بە پلان دەکەن و گوێ نادەن بەو دۆخەی ئەو کاتە تیایدان و بەهەستی ئەو کاتە بڕیار نادەن کە ڕاستن یان هەڵە.

### ٧. خانمان بەخشندەن

خانمان چونکە دایکن و سروشتیان وایە کە نان و خواردن بدەن، هەستیان هەیە بۆ بزنسەکەشیان. لەم ڕۆژانەدا قسەم لەگەڵ هاوڕێیەکم دەکرد کە خاوەنی چەند شوقەیەکە. بەشانازییەوە باسی ئەوەی بۆدەکردم کە چۆن شوقەکانی پاک کردووەتەوە و گرنگی پێداون. باسی لەوە دەکرد کە کرێچییەکانی زۆر کەسانی باشن و ئەمیش بەردەوام سەردانیان دەکات. ئەو هەم گرنگی دەدات بە شوقەکانی و هەم بە کرێچییەکانی. ئەو خزمەتیان دەکات، بەهۆی ئەمەوە کرێچییەکانی خەڵکی تری بۆ پەیدا دەکەن. ئێستا شوقەکانی هەموویان پڕ بوون و بەو هۆیەوە دەتوانێت کرێیەکی بەرزی دەست بکەوێت و بەهۆی ئەو نۆکەری و کرێ باشەوە نرخی شوقەکانی بەردوام لە بەرزیدایە.

بەشێکی باشی ئەو بەخشندەییە ئەوەیە کە پەیوەندیەکی باشی بەستووە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە پەیوەندیان بە کارەکەی ئەمەوە هەیە، مەبەست لەو کەسانەش کەسانی خاوەن بزنس و دەڵاڵی خانوبەرە و ژمێریار و ڕاوێژکاری ئابوری و کرێچی و کەسانی خاوەن زانیاری و کەسانی شارەزای باج و کەسانی تەکبیرکەرن، ئەمە هەر کەمێکیانن.

هەتا پەیوەندییەکان باشتر بن، بزنسەکە باشترە و ئەمەش داهاتی باشتری بۆ دەهێنێت.

### ٨. خانمان لەیەکترەوە فێردەبن

ئەم فێربوونە بۆتە هۆی ئەوەی کە چەندین گروپ دروست ببن لە جیهاندا کە خانمان بەڕێوەی دەبەن و زانیاری ئاڵوگۆڕ دەکەن لەناو یەکتردا لەسەر بزنس. خانمان بیرورا لەگەڵ یەکتر ئاڵوگۆڕ دەکەن. ئەگەر بزانن کارێکی باش هەیە بەیەکتری دەڵێن. لەوانەیە لەبەر ئەمە بێت گروپەکانی خانمان باشترن لە گروپەکانی پیاوان. خانمان سەرکەوتنی هاوڕێکەیان پێخۆشە.

کێشەی ئەمە لەوەدایە کە خانمان هەندێک کات بۆچوونی کەسانێک وەردەگرن کە شارەزا نین، چونکە دەڵێ هاوڕێمە و بەقسەی دەکەم. بۆیە تکایە دڵنیابنەوە لەوەی کە ئەو خاتوونەی قسەی لەگەڵ دەکەین و قسەی لێ وەردەگرین کەسێکی شارەزایە لەو بوارەدا. ئەگەر نا کاتەکەت بەفیڕۆ دەدەیت. بۆ نمونە لەو ماوەیەی پێشودا هاوڕێکەم، میشێل هات و پێی ووتم کە دەیەوێت خانووەیەک لە فینێکس بکڕێت. چەند ڕۆژێک گەڕاین هەتا خانووەیەکمان دۆزییەوە کە شوێنەکەی زۆر خۆش بوو. چواردەوری دار و باخ بوو دەیڕوانی بەسەر مەلەوانگەیەکدا. ئەوە باشترین خانوو بوو لەو ناوچەیەدا. مانگی لانی کەم ٢٥٠ دۆلاری پوختەی بۆ دەمایەوە. تا بڵێی شتێکی نایاب بوو. دەبوو بەڵێننامەکە مۆر بکرێت و هەموو شتێک تەواو ببێت. لەو ماوەیەدا من گەشتێکم بۆ هاتەپێش و ڕۆیشتم. کە گەڕامەوە پەیوەندیم بە میشێلەوە کرد و هەواڵم پرسی دەربارەی خانووەکەی.

کەمێک بێدەنگ بوو و ووتی:- پەشیمان بوومەوە!

هەناسەیەکم هەڵمژی و کەمێک پەست بووم. ووتم بۆ پەشیمان بوویتەوە؟ کێشەی چی بوو؟

ووتی:- کە تۆ ڕۆیشتی پەیوەندیم کرد بە کاداسی هاوڕێمەوە. پێی ووتم کە کارێکی پڕ مەترسییە

ووتم:- بۆچی وای ووت؟

ووتی:- لەبەر ئەوەی کاتی خۆی هاوڕێیەکی ئەویش خانوویەکی ئاوای کڕیوە، بەڵام کرێچی دەست نەکەوتووە

پاش کەمێک بێدەنگی ووتم:- کاداسی هاوڕێت تا ئێستا خانووی کرێی هەبووە؟

ووتی:- نەخێر

ووتم:- ئەی چۆن قسە لە کەسێک وەردەگریت کە بەژیانی لەو بوارەدا کاری نەکردووە؟ بەدەنگێکی بەرز ووتم ئەمە وەک ئەوە وایە بە کەسێکی ڕووەکی بڵێیت چێشتخانەیەکی خۆشم پێ بڵێ. ئەگەر هەر گوێ لە ئامۆژگاری دەگریت، گوێ لە ئامۆژگاری کەسێک بگرە کە شتێک لەو بوارە بزانێت. کەسێک کە ئەو کارەی کردووە پێشتر.

بەڵێ خانمان بەقسەی یەکتر دەکەن. بەڵام کاتێک قسە لەکەسێک وەردەگریت، دڵنیابەرەوە لەوەی کە ئەو کەسە هەمان ئەو کارەی تۆ دەکات، یان کردوویەتی.

هەر لەبەر ئەمەیە من حەزم لەو گروپانەیە کە باسی بزنسی تیا دەکرێت . چونکە زۆرینەی ئەو کەسانە باسی بابەتێک دەکەن کە تیایدا شارەزان و لەخۆیانەوە قسە ناکەن.

ئەو گروپانە دوو جۆرن، یەکێکیان پەروەردەییە و ئەوی تریان بۆ بزنس کردنە. بەلای منەوە ئەوەی کە پەروەردەییە زۆر باشە. چونکە خانمان پێکەوە فێردەبن و باسی کاری خۆیان دەکەن و ئەزموونی خۆیان بۆ یەکتر باس دەکەن.

مـن زۆر هـاوڕا نـیم لەگەڵ ئەو گروپانەی کە بۆ بـزنس کـردنە. واتە پێکەوە پارە کۆ دەکەنەوە وهەموویان کارێک دەکەن. چونکە ئەگەر هەمـوویـان بەتەواوەتـی لەسـەر کارێـک ڕێـک نەکەون و ڕێکەوتـنەکە لەسـەر کـاغەز نەنووسنەوە، ئەوا ئەنجامەکەی باش نابێت. بۆیە من لەگەڵ فێرکارییەکەدام.

**بەڵێ دەتوانین بیکەین، ئیشی خۆمانە**

وەبەرهێنـان هـیچ نهێنیەکی تێدا نییە و کارەکە ئەوەندە قورس نییە. ئەمە بەشـە ئاسـانەکەیەتی. ئەوەی کە زۆر گـرنگە ئەوەیە کە خانمـان مێشکی خۆیـان بگۆڕن لە "نـاتوانم" یـان "نـازانم" ەوە بـۆ "بەڵێ دەتوانم ببم بە وەبەرهێن، بەڵکو دەبم بە وەبەرهێنێکی زۆر سەرکەوتوو"

بزنس نهێنییەکی تێدا نییە کە بڵێم بۆتان باس دەکەم و ئێوەش بیکەن. نـا، تەنها ئەوەیە کاتێک هـاتیتە نـاو یـارییەکەوە، چێژی لـێ دەبینیـت. زۆریـنەی کـات گـوێم لـێ دەبێـت خانمـان پـێم دەڵـێن "بەڕاسـتی نـازانم پێشـتر لەچـی دەترسـام؟ پرۆسـەکە ئێسـتا زۆر چێژبەخشە. خۆزگە زووتر دەستم پێدەکرد.

زۆر خۆشە کە پارەی خۆت پەیدا دەکەیت. بەنیازم مامەڵەیەکی تریش بکەم. ڕۆژانە فێر دەبم.

ئێستا شتەکە ئاشکرایە لات؟ ئێمەی خانمـان دەتـوانین ببین بە باشـترین بازرگـان. تەواو ئەمەمـان کۆتـایی پێهێنـا. ڕۆژ بەڕۆژ خـاتوونی زیـاتر دەبـن بە وەبەرهـێن و بازرگـان و دەیسـەلمێنن کە ئێمە زۆر شـارەزاین لەو بوارەدا و ئیشـی خۆمـانە. دەیسـەلمینن کە کـارێکی زۆر خۆشـە. زۆر خۆشـە کە پـارە پەیـدا دەکەیـن. زۆر خۆشە کە شتی نوێ فێر دەبین. زۆر خۆشە کە باوەڕ بەخۆبوونت زیـاتر دەکـات لەهەمـووی گرنگتـر، زۆر خۆشـە کە دازانـین کلیلـی

ژیـانی خۆمـان لەدەسـتی خۆمانـدایە. وە بەو هـۆیەوە چەنـدین دەرفەتـی جیـاواز لەبەردەسـتماندایە. ئەمە ئاسـتێکی زۆر بەرزە کە دەبێ لەوێ بین.

## بەشی شازدەهەم
## "ئامادەم دەست پێبکەم"

"بیرکردنەوەکانت ووزەی تۆن، دەتوانیت بە بیرکردنەوەکانت خۆت بنیات بنێیت، یان خۆت تێکبشکێنیت."

تـاکە کەس کە قسـەم لەگەڵ نەکردبـوو (مارسـا) بـوو. ویسـتم قسەیەکی لەگەڵ بکەم و بزانم خەبەر و باس چییە؟
تەلەفۆنم بۆ کرد و وەڵامی دایەوە: سڵاو، من مارسام.
ووتم: سڵاو مارسا، من (کیم)م، لە هەوایییەوە قسەت لەگەڵ دەکەم.
داوای لێبـوردنی کـرد و ووتـی: زۆر زۆر خۆشـحاڵم کە جـارێکی ترگوێم لە دەنگت دەبێت. زۆر داوای لێبووردن دەکەم کە نەمتوانی لە یەکتر بینینەکەدا ئامادە بم. قسـەم لەگەڵ (پـات) و (لێسلی) کرد، باوەڕکە ئەو ماوەیە زۆر سەرقاڵ بووم. ویستم ئەوکاتە پەیوەندیت پێوە بکەم کە نانی نیوەڕۆتـان دەخوارد لە پارکەکە، بەڵام ئیشـێکم بۆ هاتە پێشەوە و بیرم چووەوە.
ووتم: کێشە نییە، ئەی ئێستا کاتت هەیە دوو دەقە قسە بکەین؟
مارسا هەڵوێستەیەکی کرد و ووتی: بەڵێ بۆ نا؟ ئێستا گونجاوە.
ووتم: ئەزانی زۆر دەمێکە قسەمان نەکردووە؟ هەر پێم خۆش بوو گوێم لە دەنگت بێت و هەواڵێکت بپرسم.
مارسا بێدەنگ بوو
ووتم: ئەوە بۆ بێدەنگی مارسا گیان؟ هیچ بووە؟

ووتی: ڕاستیت بوێت کیم، زۆر دوودڵ بووم لەوەی جارێکی تر یەک ببینینەوە و قسە بکەین، چونکە ژیانم زۆر خراپ دەگوزەرێ. ژیانم هیچ وەک ئەو ژیانە نییە کە لە هەوایی دەمهێنایە بەرچاوی خۆم. پات باسی ژیانی تۆی بۆ کردم، قسەی ڕاست خۆشە، هەست بە شەرمەزاری ئەکەم و تەریق ئەبمەوە لەو ژیانەی کە ئێستا تیایدام. بیرتە خەون و خەیاڵی ئەوەم هەبوو کە ببمە وێنەگرێکی سەردەریا و زۆر کارامە بم تیایدا؟

کیم: چاکم بیرە.

مارسا: ماوەیەک دوای ئەوە باوکم پەیوەندی پێوە کردم ووتی وەرەوە بۆ ئیشێکی خۆمان تۆم پێویستە. باشترین کارمەندی باوکم وازی لە ئیشەکەی هێنابوو و باوکیشم هیچی لەدەست نەدەهات کە بیکات. ووتی کچم وەرەوە، تەنها دوو مانگ هاوکاری باوکی خۆت بکە تا کەسێکی تازە دەدۆزمەوە. من خۆم چونکە لەو دنیاییەدا گەورە بووبووم، ئەو ئیشەم زۆر باش دەزانی. بەڵام کێشەکە ئەوەبوو کە دنیای بزنس و پارەپەیدا کردن ئەو دنیایە نییە کە من بەدوایدا وێڵم. بۆیە بە ناچاری ئیشەکەی خۆمم بەجێهێشت و ڕۆیشتمەوە بۆلای باوکم بۆ یەک دوو مانگ.

نازانم بۆ؟ بەڵام ئەو دوو مانگە بوو بە ساڵێک و دوو ساڵ و بۆخۆم ئەوە سێ دانە ساڵی ڕێکە لێرە گیرم خواردوە.

باوکم ئیشەکەی فرۆشت و بۆخۆمان ژیانێکی سادە و خۆش دەژیاین. بەڵام ماوەیەک دوای ئەوە باوکم نەخۆش کەوت و پارەیەکی زۆرمان بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە خەرج کرد لەو پارەیەی کە پاشەکەوتی کردبوو. لەوەتای باوکم کۆچی دوایی کردووە، وەک ڕۆبۆت دوو ئیش ئەکەم بەس بۆ ئەوەی نەمرین لەبرسا.

ووتم: پات ووتی دایکت نەخۆشە، وایە؟

ووتی: ئێستا شکور باشترە. بەڵام لەبەرئەوەی من تاقانەم، ئێستا لەگەڵ من دەژی. هەر لەبەر ئەمەیە دوو ئیش دەکەم چونکە دایکم چووەتە تەمەنەوە و تەندرووستی جێگیر نییە. ڕاستە بیمەی تەندرووستیمان هەیە، بەڵام بەخوا بەشی ئەم هەموو دەرزی و دەرمانە ناکات. بۆیە ڕاستت دەوێ، ئەم ساڵانەم زۆر بە قورسی تێپەڕاندووە.

ئەوەی بەلامەوە سەیرە ئەوەیە کە لە سەرەتاوە ژیانم زۆر بە خۆشی و سادەیی تێدەپەڕاند لێرە. هەمووشتێک بەدڵی من دەڕۆیشت بەڕێوە. کێشەی کرێ خانووم نەبوو و پارەیەکی باشم لە ئیشەکەم دەستدەکەوت و سەیارەم هەبوو. جا شوقەکەم دوو دەقە لە دەریاکەوە دوور بوو و کەی بمویستایە دڕۆیشتم بۆ قەراغ دەریاکە. ژیانم زۆر ئاسودە و ئاسان بوو. بەڵام وابزانم لەبەر ئەوەی بەو ئاسوودەییە ڕاهاتبووم، وای لێ کردم لێرە بمێنمەوە.

مارسا بەردەوام بوو لە قسەکردن و ووتی: ئەو ژیانە ئاسودەیەی من تیایا دەژیام دوو کێشەی هەبوو: یەکەم حەز و خولیای وێنەگرتنی بیربردمەوە. دووەم وای لێ کردم کە بە ژیانی خۆش ڕابێم و و ئێستا گۆڕاوە بۆ ژیانێکی زۆر قورس. ئەوکاتە تەنها بۆ ئەو ڕۆژە دەژیام کە تیایدام. هەمیشە لە گەڕان و قەراغ دەریا بووم. هەرچی هەموو و نەمبوو لە ئاهەنگ و کەشخەیی و کەیف و سەفادا سەرفم کرد. بەڵام ئەو ڕۆژانە ڕۆیشتن! ئێستا داهاتوویەک لەبەر دەممدایە کە بووە بە دێوەزمە لێم و ناوێرم ڕووبەڕووی ببمەوە.

بۆیە داوای لێبوردن دەکەم کە لەگەڵتاندا کۆنەبوومەوە. چونکە لەڕاستیا لەم کێشانەدا دەژیم و کەڵکی ئەوەم نییە لەناو گرووپێکی وەک ئێوەدا بم.

دڵنیام کردەوە و ووتم: دڵنیا بە زۆر باش لە گوزەرانت تێدەگەم، بەڵام هاوڕێیەتی ئێمە زۆر لەوە توندوتۆڵترە کە لەسەر شتێکی ئاوا دووربکەوینەوە لەیەک.
مارسا: زۆر زۆر سوپاست دەکەم کیم. لەڕاستیا نازانم بەرەوکوێ هەنگاو دەنێم.
مارسا زۆر بێتاقەت بوو، بۆیە خێرا لێم پرسی: مارسا دەتەوێت هەندێک گۆڕانکاری بکەیت و خۆت لەم دۆخە ڕزگار بکەیت؟
مارسا: بەدڵنیاییەوە دەبێت شتێک بگۆڕم. ناکرێ هەتاهەتایە ئاوا بەڕێی بکەم. بەڵام کێشەکە ئەوەیە هیچ هیوایەکم بە ژیان نەماوە.
کیم: ئەگەر پێشنیاری کتێبێکت بۆ بکەم دەیخوێنیتەوە؟
مارسا: بەدڵنیایەوە.
کیم: دە باشە. بۆت دەنێرم و هەرکات تەواوت کرد پێم بڵێرەوە. دەزانم وەڵامی هەموو پرسیارەکانی تۆی تێدا نییە. بەڵام ئەگەر چێژت لێ وەرگرت، ئەوە بزانە کە سەرەتایەکی باشە.
بە گەشبینیەوە ووتی: بەدڵنیاییەوە هەرکات بەدەستم گەیشت ڕاستەوخۆ دەیخوێنمەوە.
لێرەداماڵئاواییمان لەیەکتر کرد و منیش کتێبی (باوکی زەنگین و باوکی هەژار)م بۆ نارد و چاوەڕوان بووم هەرکات خوێندیەوە پەیوەندیم پێوە بکات.

ئامادەم

دوای مانگێک مارسا هاتە خەیاڵم و سەیربوو لەلام کە تا ئێستا پەیوەندی پێوە نەکردوومەوە. ویستم تەلەفۆنێکی بۆ بکەم، بەڵام ووتم ئەگەر خۆی بیەوێت تەلەفۆنم بۆ دەکات. ئەگەر خەمی گۆڕینی ژیانی خۆی هەبێت، دەبێت خۆی یەکەم هەنگاو بنێت. من ناتوانم لەجیاتی ئەو هەنگاو بنێم.

دوای کەمێک تەلەفۆنەکەم زەنگی لێدا. سەیردەکەم (لێسلی)یە. وەڵامم دایەوە ئەویش بە جۆش و خرۆشێکەوە ووتی: من ئامادەم!

کیم: ئادەی بزانم بۆ چ شتێک ئامادەیت؟

لێسلی: ئامادەم بۆ کردن و ئەنجامدان و فێربوونی هەمووشتێک، کە لەڕووی دارایییەوە وام لێ بکات پێویستم بە کەس نەبێت. بێتاقەت بووم لەم ژیانە ڕۆتینە و دەمەوێت دەستبەکار بم. وە ئەمەی دەیڵێم هەر قسە نییە و بەڕاستمە.

کیم: پێتەوە دیارە! بەڵام پێم بڵێ چ شتێک وای لێ کردیت ئەم بڕیارە بدەیت؟

لێسلی: دوو مانگ لەمەوپێش ناووم نووسی بۆ کۆرسێکی هونەری وێنە کێشان. ڕۆژێک بە خۆمان و تەختەی وێنەکێشانەکەوە لە دەرەوە بووین، لە لادێیەکی جوانی (ڤێرمۆنت) کە بەلای منەوە خۆشترین ڕۆژ بوو. هەمووشتێکم ئامادە کردبوو و ڕۆژێکی پایزمان هەڵبژارد کە گەڵاکان جوانترین ڕەنگیان هەبوو. تا بڵێی دڵم بەو ڕۆژە خۆش بوو.

بۆ نەگبەتی ڕۆژێک پێش ئەوە بەڕێوبەرەکەم پەیوەندی پێوە کردم و ووتی کە ئیشێک هاتۆتە پێش و دەبێت کە سبەی ئامادە بم لەسەر ئیش. ڕاستە خۆی پێی نەووتم بەڵام بە تۆنی دەنگیا دیار بوو کە دەڵێت: ئەگەر بەیانی نەهاتیتەوە، هەر مەیەرەوە!

کیم: ئەی تۆ چیت کرد؟

لێسلی: ڕازی بووم بە قسەی بەڕێوبەرەکەم و وازم لە حەزەکەی خۆم هێنا و ڕۆژی دواتر ڕۆیشتم بەدەم قسەی بەڕێوبەرەکەمەوە. لەمەوە بۆم دەرکەوت کە هەرکاتێک بێت، دەکرێت لەپڕ شتێک بێتە پێشەوە و پلانەکان تێکبچن. ئینجا هەستم پێکرد کە چەندە بێدەسەڵاتم لە ئاست ژیانی خۆمدا و هۆکاری ئەو هەموو بێدەسەڵاتیەش نەبوونی پارەیە. ئەم ڕووداوە خەبەری کردمەوە. ئیتر خۆم ساغ کردەوە کە دەبێت من گۆڕانکاری بکەم و جارێکی تر نەگەڕێمەوە سەر ژیانە کۆنەکە.

کیم: واو! زۆرم پێ خۆشە وا دەڵێیت، دیارە هەڵوەشاندنەوەی پلانی وێنەکێشانەکە خێری تێدا بووە.

لێسلی: ئەرێ وەڵا وبزانم وابوو.

کیم: ئەی بەنیازی چی بکەیت؟

لێسلی: گوێم بۆ شل بکە بزانە بەتەمای چیم؟ پێویستم بە هاوکاری تۆیە. پێم باشە هەموومان دوو ڕۆژ مۆڵەت وەربگرین و جارێکی تر لەگەڵ گرووپەکەی (هەوایی) یەکبگرینەوە. بەڵام ئەم جارە لە (فینیکس) و لە ماڵی ئێوە. تۆش باسی ئەزموونی خۆتمان بۆ بکە کە چۆن دەستت پێکردووە. ئەڵێیت چی؟

کەمێک بێدەنگ بووم و ووتم: سەیرکە! من خۆشم ئێستا لە سەرەتادام و لە پرۆسەی فێربووندام و هەموو وەڵامەکانم لا نییە. جگە لەوە، من وەک ئەو خەڵکە ئیش ناکەم و شێوازی کۆن پەیڕەو ناکەم. من ڕۆژانە قسە و ئامۆژگاری لە چەندین کەسی زیرەکەوە وەردەگرم پێش ئەوەی هەرکارێک بکەم.

لێسلی قسەکانی پێ بڕیم ووتی: دە ئەزانم کچێ! منیش پێم خۆشە شێوازکەی تۆ وەربگرم و پاشان بۆخۆم بەردەوام دەبم لە

فێربـــوون. قســـەکەی تـــۆ ڕوونە، بەڵام ئەو کەســـانەی ئێســـتا لەچواردەوورتن و قســـەیان لـــێ وەردەگریـت، کە دەســـتتپێکردووە لەوێ نەبـوون، چـونکە وەک خـۆت ووتـت لە سـفرەوە دەسـتت پێکردووە. ئـێ ئێستا منیش لە هەمان دۆخی تۆدام و لە سفرەوە دەمەوێت دەستپێبکەم. مـن ئێسـتا خـاوەنی یەک شـت نـیم، جگە لەوەی کە خـاوەنی ئیرادەیەکی بەهێـز و ویسـتێکی زۆرم هەیە بۆ فێربوون و جێبەجێکردنی ئەوانەی تۆ پێم دەڵێیت.

جا بۆیە دەمەوێت بزانم کە تۆ چۆن دەستت پێکردووە و چیت کردووە و یەکەم هەنگاوت چۆن بووە؟ تۆ خۆت وتت کە خانمان زۆر باش لەیەکترەوە فێردەبن و منیش لەسـەر هەمـان قسە پێم باشە جارێکی تر یەکبگرینەوە و لەیەکترەوە فێربین. ئەوکاتەی کە پێکەوەین هیچ شەرم ناکەین لە هەر پرسیارێک کە هەمانبێت. نەک وەک ئەو سـیمینارانەی کە ئەوانەی پرســـیار دەکەن تەنهـــا بـــۆ خۆدەرخسـتن پرسـیار دەکەن. کاتێـک تەنهـا خۆمـان بـووین، زۆر باشتر لەیەک تێدەگەین.

بە پێکەنینەو ووتـم: ئـاخێر جارێـک وتـت کە مـن بـاش نـیم لەوەی کەسـی بەرامـبەر ڕازی بـکەم شـتم لـێ بکڕێـت. ئـێ یەکێـک لە هەنگاوەکانی زەنگین بوون ئەوەیە کە باش بیت لە شت فرۆشتندا.

لێسلی: دەی ئەمە مانای وایە ڕازیت بە دانیشتن و فێرکردنمان!

کیم: ڕازیـم، بەڵام بە دوو مەرج. یەکەم: کۆبوونەوەکەمـان تەنها بۆ ئەوانەیە کە دەیانەوێـت فێـر بـن و بەڕاسـتی ئامانجیـان فێربـوونە. ئەگەر بۆ یەکتربینین و دەمەتەقێ و قسـەوباس دێن، ئەوە باشترە کە نەیەن. دەبێت لەناخەوە ئامادەی گۆڕانکاری بن، دەنا من ناتوانم هیچیان بۆ بکەم بە قسە.

لێسلی: منیش ڕازیم، هەر ئێستا بانگهێشتنامەیەک ئامادە دەکەم بزانم کێ دێت. ئەی مەرجی دووەم؟

کیم: دەبێت هەمووتان لەوە تێبگەن کە من داری سیحریم پێ نییە. دەرمانێکم پێ نییە کە لەماوەی دوو ڕۆژدا هەمووتان بکات بە بازرگانێکی سەرکەوتوو. وەبەرهێنان و سەرکەوتنی دارایی پرۆسەیەکی بەردەوامە و دەبێت کاری لەسەر بکەیت بۆ ئەوەی بگەیت بە ئامانج. نامەوێت بە کۆمەڵێک خەون و خەیاڵی شاعیرانەوە بێنە ئێرە و وابزانن کە من لێرە بۆیان جێبەجێ دەکەم. دڵنیایت دەتوانیت ئەوەیان تێبگەیەنیت؟

لێسلی ووتی: تەواو، وازی لێبهێنە بۆخۆم. چ ڕۆژێک دابنێین؟

بە پێکەنینەوە ووتم: بەڵام نابێت جارێکی تر ئەو قسەیە بکەیتەوە کە وتت " ناتوانم شت بفرۆشم،" باشە؟ پاشان بە (لێسلی)م ووت کە بانگهێشتی (مارسا)ش بکات. سەیرە ئەوکاتەی لێسلی تەلەفۆنی کرد بیرم لە مارسا دەکردەوە. ئەوە مانگێک دەبێت کتێبێکم بۆ ناردووە کەچی تا ئێستا دەنگی نییە.

## بەشی حەڤدەیەم
## "لە سەدا ٩٠ ی سەرکەوتن، دەرکەوتنە"

کاتێک دەتەوێت کارێک بکەیت، دەرکەوتنت زۆر ئازاترت دەکات. چونکە باوەڕبەخۆبوون لەسەروو هەموویەوەیەتی.

وۆلی ئالین قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێت "لەسەدا ٩٠ ی سەرکەوتن، دەرکەوتنە." بەڕاستی ئەم قسەیە جوانە. خەڵکێکی زۆر دەڵێن کە بێزارن لە قەڵەوی و کێشی زیادە، بەڵام کێ لە قاعەی ئاسنەکە دەردەکەوێت؟ خەڵکێکی زۆر دەڵێن دەمانەوێت خزمەت بە وڵاتەکەمان بکەین، بەڵام ڕۆژی خزمەت کێ دەردەکەوێت؟ خەڵکی هەموو دەڵێن دەمانەوێت ژیانمان باشتر بکەین، بەڵام کێیە لە ماڵەوە دێتە دەرەوە و هەوڵ دەدات؟

ڕاستتان دەوێت، زۆر بە پەرۆش بووم بۆ ئەوەی بزانم کێ دەردەکەوێت و کێ نایەت بۆ دانیشتنەکەی ماڵی ئێمە. لێسلی بە هەمووانی ووتبوو کە ڕۆژی هەینی کاتژمێر ٩ ی سەرلەبەیانی لە ماڵی ئێمە ئامادە بن. هەموویان ووتبوویان ئامادە دەبین. کە لێسلی وای پێ ووتم، ووتم: باشە، بزانین کێ دەردەکەوێت؟

**ڕۆژی هەینی، کات ٩ ی بەیانی:**

قاوەکە لەسەر ئاگر بوو. لێسلی کاتژمێر ٨:٣٠ گەیشتە ماڵی ئێمە و لەگەڵ دەستی هەندێک میوە و شیرینی و بسکیتی هێنابوو.

لێسلی: زۆرم لە یەک کەس نەکردووە. ناونیشانی ماڵی ئێوەم بۆ ناردوون و ووتم کەس تەلەفۆن بۆ من نەکات. ئەگەر بەلاتانەوە گرنگە وەرن و تەواو.

کیم: ئەوانیش ووتیان دێین؟

لێسلی: ئەرەوەڵا هەموویان وتیان دێین، تەنانەت (مارسا)ش.

دوو قاوەم تێکرد و لەگەڵ لیسلی کەوتینە قسەکردن. چەند دەقەیەکی مابوو بۆ کاتژمێر ٩، دەنگی دەرگا هات. من و لیسلی سەیرێکی یەکترمان کرد و وەک دوو منداڵ بە دڵخۆشیەوە ڕامانکرد بەرەو دەرگاکە.

کەسێک بەوپەڕی دڵخۆشیەوە ووتی: واو! ئەوە ناونیشانە. تەکسیەکە ڕیک هێنامیە بەردەرگا. بەڕاستی چاووم ڕوون بووەوە بە بینینتان. ئەو کەسە (ترەیسی) بوو.

ئێمەش بە ڕوویەکی خۆشەوە ووتمان: ترەیسی! زۆرمان پێ خۆش بوو کە هاتیت.

ترەیسی ووتی: چییە بەلاتانەوە سەیرە کە هاتووم؟ گومانی تیا نیە کە من ئەم جۆرە کۆبوونەوانە لەکیس خۆم نادەم. بەتایبەت دوای ئەو ڕووداوەی هەفتەی ڕابردوو.

بەدەم ڕۆیشتنەوە ووتم: ڕووداوی چی؟

ترەیسی: بیرتە پێم ووتن کە دەترسم هاوسەرەکەم دەربکرێت لە کارەکەی، دوای ئەوەی کە خاوەنی کۆمپانیاکەیان نیازی فرۆشتنی کۆمپانیاکەی هەبوو.

ووتمان: بەڵێ بیرمانە.

ترەیسی: هەفتەی ڕابردوو کۆمپانیاکە ڕای گەیاند کە ماوەیەکی زۆرە دەیانەوێت لەگەڵ کۆمپانیایەکی زەبەلاح یەک بگرن. بەڵام ئەو یەکگرتنە سەری نەگرتووە و لەبەر ئەوە ئێستا کۆمپانیاکەمان دەفرۆشین بە یەکێک لە ڕکابەرە گەورەکانمان. هەرچەندە سەرۆکی کۆمپانیاکە ووتبووی کە هەوڵی تەواو دەدەم کە کەس دەرنەکرێت، بەڵام بتەوێ و نەتەوێ ئێمە ترسمان لێ نیشتووە.

لیسلی ووتی: ئەی نازانیت بەنیازی چین؟

ترەیسی: نازانم، بەڵام هەرشتێک بوو پێتان دەڵێمەوە. هەفتەی ڕابردوو هەموومان دەتووت لە مەیتخانە کار دەکەین. قسەی تیا نییە کە هەندێک کارمەند دەردەکەن. هەرکەس کۆمپانیا بکڕێت یەکەم شت بیر لەوە دەکاتەوە. هەموان دێن و دەچن ترسی ئەوەیان هەیە کە دەربکرێن و ئیشەکانیان لەدەست بدەن. بۆیە ئەم کۆبوونەوەیە بەڕاستی لە کاتی خۆیدا بوو. ئەمە تاکە شتە کە دەتوانم ڕووناکیەکی تیا بەدی بکەم. چونکە هیچ ئومێدێکم نەماوە.

لێسلی ووتی: هیچ شتێک وەک ئەو زەنگە ئاگادارکەرەوانە نییە.

ترەیسی ووتی: ئەرێ ئەوە دەنگی دەرگاکە نەبوو؟

ئەوەندە سەرقاڵ بووین کە خەیاڵمان لای دەرگاکە نەبوو. بە پێکەنینەوە ووتم: بزانین کەسی دووەم کێیە؟

هەرسێکمان بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتین و هەریەکەمان لە مێشکی خۆماندا کەسێکمان دیاری کردبوو. دەرگاکەم کردەوە.

کەسی دووەم ووتی: باشە بۆ ١٠ خولەک دواکەوتم؟ خۆ پلانم بۆ هەموو شتێک دانابوو. لە دڵەوە داوای لێبووردن دەکەم. ئەو کەسە دەزانن کێ بوو؟ (پات)!

ووتم: فەرموو پات! باوەشمان بەیەکدا کرد و بەخێرهاتنمان کرد و ڕۆیشتینە ژورەوە. بەدەم قاوە و بسکیت خواردنەوە نزیکەی ٤٥ خولەک قسەمان کرد. بۆمان دەرکەوت کە تەواو، گرووپەکە هەر ئەم چوار کەسەین و کەسی دیکە نایەت.

**مارسا چی بەسەرهات؟**

هەر بۆ ئەوەی بیرتان بخەمەوە، مارسا ئەو کچە بوو کە ئامادە بوو هەموشتێک بکات بۆئەوەی ڕزگاری ببێت. ئەو کچە بوو کە من کتێبەکەم بۆ نارد بۆئەوەی بیخوێنێتەوە. لێسلی ووتی کە بانگهێشتەکەم بۆ ناردووە و ئەو تاکە کەس بووە کە ووتویەتی بەدڵنیایەوە لەوێ دەبم. دواتر بۆمان دەرکەوت کە ئەم کچە یەک لاپەڕەی لە کتێبەکە هەڵنەداوەتەوە و یەک هەنگاوی نەناوە بۆ گۆڕانکاری لە ژیانیدا. مارسا لەو کچانە بوو کە هەر دەم بوو، واتە بە قسە هیچی نەهێشتبووە و بە کردار سفر بوو. لەوانە بوو کە دەیویست ژیانی بگۆڕێت بێ ئەوەی خۆی بگۆڕێت و هیچ شتێکی جیاواز بکات. جا بۆیە من زۆر لام گرنگە لەگەڵ ئەوانە قسە بکەم کە بەڕاستی دەیانەوێت فێربن و گۆڕانکاری بکەن، شتەکە بە زۆر نابێت. هەمیشە ئەو قسەیەم بیرە کە دەڵێت: هەوڵ مەدە بەراز فێری گۆرانی ووتن بکەیت، هەم کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت، هەم بەرازەکە بێزار دەکەیت.

کەسانێکی زۆر هەن وەک مارسا دەیانەوێت ژیانیان بگۆڕن بەڵام ئامادە نین هەنگاوێک بنێن. پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا ئامادەیت ئەو کارە بکەیت کە سەرکەوتن پێویستیەتی؟ من خۆم چەندین جار کردوومە.

بۆ نموونە: پێش ئەوەی ئەم کتێبە بنووسم، سێ ساڵ بوو هەر دەمووت دەمەوێت کتێبێک بنووسم لەسەر مێشکی پارەناس بۆ خانمان. هەر دەمووت و نەمدەکرد. هەر دەمووت و ووشەیەکم نەدەنووسی. هەر دەمووت و سەرقاڵ بووم. تە ئەوەی کە ڕۆژێک دوو هاوڕێی ئەزیز دوو قسەیان پێ ووتم کە وای لێ کردم دەستبکەم بە نووسین. یەکێکیان ووتی: ئەرێ کچی باش! یان

ئەوەتا بینووسە، یان سەرمان مەیەشێنە. ئەوەی تریان ووتی: هەر قسە بکە و بڵێ دەینووسم، دەی کوا؟ ئەم قسانە وایان لێکردم کە دەستبکەم بە نووسین.

**کارۆڵ**

نموونەیەکی تری ئەو کەسانەی کە تەنها قسە دەکەن و کرداریان نییە (کارۆڵ)ە. کارۆڵ بۆ ماوەیەکی زۆر کاروباری ژمێریاری من و ڕۆبێرتی گرتبووە ئەستۆ. بووبووە یەکێک لە نزیکترین هاوڕێکانم. مانگی دووجار یەکمان دەبینی بۆ هەڵسەنگاندنی کار و باری دارایی خۆمان. هەمووجارێک کە حساباتمان دەکرد، کارۆڵ دنیایەک پرسیاری لێ دەکردم لەسەر وەبەرهێنان. ئەمەی بۆتان باس دەکەم هەتا ٢ ساڵ بەردەوام بوو. ڕۆژێک ووتی پرسیارێکم هەیە لەسەر وەبەرهێنان. ڕامگرت و ووتم: نەخێر هیچ پرسیارێک مەکە. ئەوە تۆ دوو ساڵە پرسیار لەمن دەکەیت، ئادەی بزانم چ پرۆژەیەکت هەیە؟چیت کردووە بەچی؟

ووتی: هیچ!

کیم: دە کەواتە هیچ پرسیارێک مەکە. پێویست ناکات من وەڵامت بدەمەوە لەکاتێکدا هیچ پرۆژەیەکت نییە. هەرکات توانیت یەکەم کاری خۆتت هەبێت و شتێک بکەیت بە شتێک، ئەوسا بەسەرچاو پرسیار لەتۆ و وەڵام لە من.

لە کۆبوونەوەی داهاتوودا کارۆڵ با پۆزەوە خۆی کرد بە ژووردا و وەرەقەیەکی بەدەستەوە بوو کە پشکی کۆمپانیایەکی کڕیبوو. ووتی ئێستا دەتووانم پرسیارت لێ بکەم. چەندین پرسیاریشم هەیە لەسەر خانو و زەوی، بەڵام یەک پرسیار ناکەم هەتا ئەوکاتەی موڵکی خۆم نەبێت.

کارۆڵ بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر و لە ماوەیەکی کەمدا توانی خانووەیەک بدۆزێتەوە و لەگەڵ خاوەنەکەی ڕێککەوتن. هەرچەندە کارۆڵ پارەی پێ نەبوو و بە شەریکایەتی کڕیبووی، بەڵام گرنگ ئەوە بوو هەنگاوێکی نابوو. ئێستاش سەرقاڵی ئەو کارەیە و بە بەردەوامی یەکتر دەبینین.

کارۆڵ دواتر پێی ووتم کە ئەو وای زانیوە کردار ئەوەیە کە پرسیاری زۆر بکەیت. بەڵام ئەوکاتە خەبەری بووەوە کە زانی دوو ساڵ تێپەڕیوە و هیچی نەکردووە. هەمووکاتێک خۆی هەڵخەڵەتاندووە و وتوویەتی کە پرسیار دەکات و دەستپێدەکات، بەڵام پرسیارەکان بیانوویەک بوون بۆ ئەوەی دەستپێنەکات. قسەکەمان لەسەرئەوەیە کە هەیە تەنها قسە دەکات و هەیە کرداری هەیە. دەرکەوتن و بەدەمەوەچوون بەشێکە لە کردار.

ئەی جانیس؟

لە مەتبەخەکەوە هەڵساین بڕۆین بەرەو ژووری میوانەکە، تەلەفۆنەکە زەنگی لێدا. سەیردەکەم (جانیس)ە. دەنگەکەیم دا بە دەرەوە و جانیس ووتی: سڵاوتان لێبێت، دەمەوێت بڵێم کە دڵم لاتانە. دەزانم دەبوو ئێستا من لای ئێوە بم، بەڵام هەواڵێکی خۆشم پێیە بۆتان.

لێسلی ووتی: هەواڵە خۆشەکە چییە؟

ووتی: بیرتانە پێم ووتن کە من لەو کچانە نیم باوەڕم بە خۆشەویستی و ئەم شتانە هەبێت؟ بەڵام ئێستا لەوانەیە گۆڕابم. کوڕێکم ناسیوە ناوی (گرێگ)ە. ڕاستە ماوەیەکی کەمە ناسیومە، بەڵام قسەیەک دەکەم خۆشم ناتوانم باوەڕی پێ بکەم، کچینە وابزانم عاشقم!

پات خەریک بوو لەسەر کورسیەکە بکەوێتە خوارەوە، وتی: چیی؟! تۆ؟! تۆ لەو کچانە بوویت کە دەتووت ئەگەر من بڵێم ماست ڕەشە، واتە ڕەشە! تەواو. کەس ناتوانێت قسەی من ڕەت بکاتەوە. کەچی ئێستا عاشقی؟! وەڵام پێم خۆشە. دە بۆمان باس بکە بزانین چۆن ناسیت؟ دەمێکە ناسیوتە؟

جانیس: تەنها ٣ هەفتە دەبێت. دەزانم ماوەیەکی زۆر نییە، بەڵام دیارە قەدەرکە وا بووە. لە قاوەخانەیەکی نزیک ئۆفیسەکەی خۆم ناسیم. لە ڕیزەکەدا وەستابووم بۆ کاپوچینۆیەک، ئەویش هاتە ژوورەوە. کەمێک سەیری یەکمان کرد و دواتر هاتەپێشەوە لێم و دەستمان کرد بە قسە.

ترەیسی: ئەی خەریکی چییە؟ ئیش و کاری چییە؟

جانیس: هێشتا باسی ئەوەمان نەکردووە. پێم وابێت پێشتر ئیشێکی کردووە و زەرەری کردووە. بۆیە پێی خۆش نییە جاریَ باسی ئەو بابەتە بکات. ئەوەندەی بزانم پێشتر لە چەندین کۆمپانیا ئیشی کردووە وەک فرۆشیار، بەڵام ئێستا بێ کارە و دەیەوێت پلان دانیَ بۆ ئەوەی ژیانێکی مسۆگەر دەبین بکات لە داهاتوودا. زۆر زیرەکە و بیرۆکەی زۆر جوانی بزنسی هەیە. لە دەقەیەکدا مێشکی بۆ یەک کیلۆمەتر دوورتر دەڕوات. جا زۆر دڵی بە کارەکەی من خۆشە و جارێک وتی کە حەزدەکات پێکەوە کار بکەین. من تا زیاتر بیری لێ بکەمەوە، زیاتر قسەکەیم بەدڵە. لەبەرئەوەی خۆتان دەزانن کارکردن بە تەنها قورسە و ئەگەر کەسێکت لەگەڵدا بێت باری شانت کەمێک ئاسانتر دەکات.

هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ناتوانم لای ئێوە ئامادە بم چونکە بەنیازین بڕۆین بۆ سانفرانسیسکۆ. هۆتێلێکی زۆر کەشخەی لەویَ دۆزیوەتەوە. ئینجا چێشتخانەیەکی ئیتاڵی هەیە، دەبێت ٣ مانگ لە

سەرەدا بیت بۆ ئەوەی بیگریت، کەچی ئەو توانی بۆ ئەم هەفتەیە جێگە بگرێت.

ترەیسی خۆی پێ نەگیرا و ووتی: ئەی تۆ نەتووت ئێستا بێ کارە؟ ئەمەی لەچی و ئەوەی لە چی؟

جانیس ووتی: گرێگ لە ئیشەکەی پێشتر زەرەری کردووە و ئێستا بەدوای کاردا دەگەڕێت. من خۆم چونکە کاری خۆمم هەیە، دەزانم کە چەندە قورسە زەرەر بکەیت و جارێکی تر بکەویتەوە سەرپێی خۆت. هەڵبەت کچینە گرێگ شەرمەزار دەبێت ئەگەر بزانێت باسی ئەم شتانەم بۆ ئێوە کردووە. بەڵام هەموومان تووشی شکست دەبین و شتێکی ئاساییە. بۆیە بۆمن کێشە نابێت ئەگەر لە دۆخێکی ئاوادا هاوکاری بکەم و بیخەمەوە سەرپێی خۆی.

لێسلی بە دڵێکی پاکەوە ووتی: ئەی کێ پارەی سەفەرەکەی سانفرانسیسکۆ دەدات؟

جانیس ووتی: من دەیدەم! وەک پێم ووتن بۆ من کێشە نابێت ئەگەر لە دۆخێکی ئاوادا هاوکاری بکەم، چونکە کەسێکی زیرەکە و ئەگەر بێتە ناو ئیشەکەی منەوە دڵنیام ئیش لەوە باشتر نابێت.

ئا بیرم چوو پێتان بڵێم، گرێگ بەنیازە لە ماڵەکەی من پێکەوە بژین. دەزانم ئەمەی من دەیکەم شێتانەیە، من دەمووت کە هەرگیز ناتوانم لەگەڵ کەس بژیم، کەچی ئێستا گرێگ بەنیازە بێتە ماڵەکەی من و منیش کێشەم نییە. من شێتم کچینە وایە؟

هەموومان ووتمان: ئەرەوەڵا شێتیت!

ووتی: دەزانم بەخوا دەزانم! هەم دڵم زۆر خۆشە و هەم قەلەقم. من دەبێ بڕۆم هاوڕێیان. کات زۆر درەنگە بۆ فڕۆکەخانە. کاتێکی خۆش بۆ هەرهەمووتان. خواتان لەگەڵ.

تەلەفـۆنەکەی داخستـەوە و بەسەرسـوورمانەوە سـەیری یەکترمان دەکرد. ترەیسی بێدەنگیەکەی شکاند و ووتی: ئەوەی من گـوێم لێبوو ئێوەش گوێتان لێبوو؟ ئەوە جانیس بوو ووتی ئەو کـوڕەی کە سێ هەفـتەیە دەیناسـێت، ئەم هەمـوو خەرجیەکـی گرتووەتە ئەستۆ؟ وە بەنیازە لە ماڵەکەی خۆیدا نیشتەجێی بکات؟ خۆ هیچی نەدەزانی دەربارەی ڕابردووی و کەچی بەنیازبوو بیکاتە هاوبەشی خۆی؟ پێم بڵێن ئێوەش ئەمانەتان گوێ لێبوو؟

لێسلی ووتی: بەڵێ منیش گوێم لێبوو!

ترەیسی ووتی: باشە ئەم کچە ئەقڵی لەدەست داوە؟ کوێر بووە؟ کێشەی چییە؟

ووتـم: ئەی نـاڵێن عاشـق کـوێرە؟ ئەمە نمـوونەیەکی زینـدوو لەبەردەستماندایە.

پات ووتی: وابزانم بەپێی کات هەمووشتێک دەردەکەوێت.

ترەیسی ووتی: من بە قۆڵبڕێکی بەلاش خۆر دێتە بەرچاووم ئەو کوڕە.

هەموومان لە دڵماندا دنیایەک گومانمان هەڵگرتبوو.

ترەیسـی ووتـی: واز لە هەمـووی بهێـنە، بەڵام مەعقـوولە ئـێمەی ئیهمال کردووە بۆ کوڕێک؟ زۆر ڕقم لەوەیە کە کچێک ئاوا خۆی سووک ئەکات بۆ کوڕێک،، ئەوپەڕی بێ ئەقڵیە!

پات لەژێر لێوەوە ووتی: کچێ لەوانەیە زۆر قۆز بێت.

لێسلی ووتی: لەوانەیە هەم گەنج بێت و هەم قۆز بێت.

منـیش ووتـم: لەوانەیە هەم گەنـج و قـۆز بێـت، هەم میراتگـری کابرایەکی ملیۆنەریش بێت.

بەدەم قاقای پێکەنینەوە ترەیسی ووتی: ئێ دە وابڵێن. ئێستا شتەکە کەمێک ڕوونە لەلام.

هەموومـــان پێکەنینمـــان بەخۆمـــان دەهـــات کە دانیشـــتووین شاســواری خەونەکــان بــۆ جــانیس دەدۆزیــنەوە. بەڵام لە دڵەوە هەموومان خەممان بوو بۆ حاڵی جانیس.

# بەشی هەژدەهەم
# "با پرۆسەکە دەستپێبکات"

"لە هەمـوو قۆناغەکـانی ژیانـدا دەتـوانین فێـربین. بەڵام ئەگەر وەک کەسـێکی سـەرەتایی سـەیری خـۆت بکەیـت، ئەگەر فێربیـت چێـژ لەوە وەربگریـت کە تـۆ کەسـێکی سـەرەتاییت، ئەوسا ژیـان دەرگـای فێربوونت بۆ واڵا دەکات." - بارباراشێر -

هەرچوارمـان لە مەتـبەخەکەوە بەڕێکەوتـین بەرەو ژووری میوانەکە کە ئێمە گۆڕیبوومان بە ئۆفیسێکی بچکۆلە. بڕیار وابوو ئەم دوو ڕۆژە لەم ژوورە وانەکـان وەربگـرین. هەریەکە قەڵەم و لاپەڕەیەکـی بەدەسـتەوەگرت و دانیشـت. لێسـلی ووتـی: واو! ئەم ژوورە لە شوێنێکی زۆر فەرمی دەچێت. لەکوێوە دەستپێبکەین؟

**یەکەم: وەڵامی پرسیاری "بۆچی"؟**

با لە وەڵامی ئەم پرسیارەوە دەستپێبکەین. بۆچی ئێوە لێرەن؟ بـۆچی ئامـادەن هەمووشـتێک بـکەن تەنهـا بـۆ ئەوەی لەڕووی داراییەوە سەربەخۆ بن؟

ترەیسی ووتی: خۆت دەردی من باش دەزانیت. کۆمپانیاکەی کاری لـێ دەکەیـن لەوانەیە بەم نزیکـانە بفرۆشـرێت و ئـێمەش بکەوینە سەرجادە. وابزانم فرۆشتنی کۆمپانیاکە زەنگێکی ئاگادارکەرەوەی زۆر بـاش بـوو بـۆمن، کە وای لێکـردم لەو ڕاسـتیە تێـبگەم کە کۆنترۆڵی ژیانی خۆم تا ئێستا بەدەست خۆمەوە نەبووە.

کاتێـک بـۆم دەرکەوت کە نـاوی مـن لە لیسـتێکدایە و دەچێـتە بەردەستی کەسێک کا تا ئێستا منی نەبینیوە و دەکرێت هەرکات ویستی خەتێکی بەسـەردا بهێنێت و مـن دەرکا، بـۆم دەرکەوت کە ئەوە بڕیـار لەسـەر داهـاتووی مـن دەدات نەک خـۆم. هۆکـاری

سەرەکیم ئەوەیە کە نامەوێت جارێکی تر بکەومەوە ناو ئەو دۆخە. ژیان ژیانی خۆمە و لەمەولا خۆم بڕیار دەدەم دەبێت داهاتووم چۆن بێت. وە هەنگاوی یەکەمم ئەوەیە کە دەمەوێت خۆم کۆنترۆڵی پارەکانی خۆم بکەم. بەم ژیانەوە کە ئێستا تیایدا دەژیم، دەزانم کە پارەکانم منیان کۆنترۆڵ کردووە.

دوای ترەیسی، لیسلی کەوتە قسە:

کێشەکەی من زۆر سادەیە. من دەمەوێت وێنە بکێشم. تەواو! چونکە کاتێک وێنە دەکێشم هەست دەکەم دڵم گۆرانی دەچڕێت. هەست بە خۆشی دەکەم، هەست بە باوەڕبەخۆبوون دەکەم. کاتێک تابلۆیەک لەبەر دەممدایە و منیش بە فڵچەیەکەوە سەرقاڵی تەواوکردنی تابلۆکەم، ڕۆحم هەست بە ئارامی دەکات. جا لەبەر ئەوەی من زۆرترین کاتەکانی ژیانم سەرقاڵی ئیش کردنم، کەمترین کاتم ماوە بۆ ئەو ئارامیەی دەروونم. ئەمە هۆکارە سادەکەی منە.

ئینجا سەرەی (پات) بوو.

زۆر بە پەرۆش بووم گوێم لە قسەکانی پات بێت، چونکە ڕاستتان بوێت من خۆم سەرم سوڕما کاتێک بینیم پات هاتووە. لەبەرئەوەی چاوەڕوانی ئەوە نەبووم پات بێت.

پات بە دەنگێکی لەسەرخۆوە دەستی پێکرد:

دوای ئەوەی بۆ یەکەم جار نانی نیوەڕۆمان پێکەوە خوارد، زۆر گەرام بەدوای ئەو شتانەدا کە دەروونم ئاسوودە دەکەن. بۆمدەرکەوت کە من ساڵانێکە لە هەوڵی بەدیهێنانی خەونی کەسانی تردام، نەک خەونی خۆم. من بە تەواوەتی پاڵپشتی خەونی هاوسەرەکەم و منداڵەکانم بووم، بەڵام خەونی خۆمم لە دوای دواوە فەرامۆش کردبوو. دوای ئەوەی لە نیویۆرک پێکەوە نانمان

خوارد، لە خۆمم پرسی: من دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی خەونەکەی خۆم بهێنمە پێشەوە. پێویستم بە چییە؟ ئەزانن وەڵامەکەی توشی سەرسووڕمانی کردم؟

ئەو قسانەی کە کردمان دەربارەی پارە و وەبەرهێنان، وای لێ کردم کە گەڕامەوە ماڵەوە زیاتر بەدوایدا گەڕام لە ئینتەرنێت. ئێ خۆتان دەزانن من هیوایەتم ئەوەیە بگەڕێم بەدوای شتدا و زانیاری لەسەر وەربگرم. ڕۆیشتم لەسەر دنیای وەبەرهێنان زۆرم شت خوێندەوە. لەسەر بازاڕی پشک و ئاڵوگۆڕی دراو و موڵک کڕین و مادده بەهادارەکان و زۆر شتی دیکە. باوەڕبکەن دوو کاتژمێر وون بووم لەناو ئەو بابەتانەدا. بەڵام هەموو ئەمانەم بە تەنها کرد و لای کەس باسم نەکرد، تەنانەت هاوسەرەکەشم. بەڵام لێرەوە بەشە قورسەکە دەستپێدەکات.

وەک دەزانن لە ماڵی ئێمەدا هەموو ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە پارەوە هەیە، هاوسەرەکەم قسەی تیا دەکات و ئێمە ئاگامان لە هیچ نییە. دەمزانی ئەگەر لەم سەرەتایەوە بۆی باس بکەم، شتێکە ناچێت بە ئەقڵیدا و دواتر دەکەوینە دەمەقاڵێ. هاتم چیم کرد؟ لەگەڵیدا دانیشتم و هەموو ڕاستیەکانم پێ ووت. پێم ووت کە چەندین ساڵە من خۆمم فەرامۆش کردووە و ئێستا حەزدەکەم شتێک بکەم بۆخۆم. پێم ووت کە بەنیاز نەبووم ئەم بابەتەت لەگەڵ باس بکەم، چونکە لەوەتەی ئێمە هاوسەرگیریمان کردووە، بابەتی پارە هەر لای تۆ بووە. پێم ووت کە لە ئینتەرنێت زۆر شتم لەسەر خوێندوەتەوە و دەمەوێت بەدوایدا بڕۆم. نەک وەک خەونێک، بەڵکو وەک ئامانجێکی ڕاستەقینە و گەورەی ژیانم. پێم ووت کە زۆر شتی تر هەیە دەبێت فێری بم و لەم نێوەندەدا پێویستم بە

هاوکاری تۆیە. پاشان بێدەنگ بووم و چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بووم.
کیم: ئەی ڕازی بوو؟
پات: خۆزگە ئاوا ئاسان بووایە. لەڕاستیا تا ئێستا وەک پێویست هاوکارم نییە، بەڵام ئومێدم هەیە کە لە داهاتوودا ڕازی دەکەم و وای لێ دەکەم هاوکارم بێت. هەرچەندە باوەڕم وایە کە دەتوانم خۆم ببەمە پێش بێ ئەوەی پێویستم بە هاوکاری هیچ کەسێک بێت. هاوسەرەکەم لەو کەسانەیە کە دەبێت شتەکەی بۆ بسەلمێنیت ئینجا بەقسەت دەکات بۆیە هەرکاتێک بۆم سەلماند، دڵنیام هاوکارم دەبێت.

لە ئێستادا زۆر وابەستەی کارەکەی بووە و هەر خەیاڵی لای کارەکەیەتەی. ناڵێم زۆر دڵی پێی خۆشە، بەڵام ئەوە تاکە ئیشە کە دەیزانێت و وەک سەرچاوەی سەرەکی بژێوییە لەلای. دەزانم هەتا زیاتر کار بکات کەمتر چێژی لێ وەردەگرێت، بۆیە من دەمەوێت دنیایەکی تری نیشان بدەم و پێی بڵێم کە ئەمە هەیە و زۆر لەوە باشترە. واتە ئەوەی من دەیکەم هەم لەبەر خاتری خۆمە و هەم لەبەر خاتری ئەو. دڵنیام لە داهاتوودا ئەمە هاوسەرگیریەکمان زۆر بەهێزتر دەکات و دەبێتە دیاریەکی گەورە بۆمان.
لیسلی چەپڵەیەکی بۆلێدا و ووتی: هەی ئافەرین، دەستخۆش، پیرۆزە!
ترەیسی: سێ هۆکاری زۆر گەورەمان باس کرد.
کیم: ڕاستە، ئەم هۆکارانە دەبێت بەهێز بن چونکە ئەم هۆکارانە دێنەوە ناو مێشکت کاتێک پلانەکانت وەک خۆی ناڕوات و دەتەوێت وازبهێنیت و گومانت بەرامبەر خۆت بۆ درووست دەبێت و خەڵکی دژت دەوەستنەوە. کۆڵ نەدان بڕیارێکی ڕاستە، ئەو

هۆکـارانەش ئێـوە وتتـان، واتـان لـێ دەکـات کە کـۆڵ نەدەن و بەردەوام بن.

دووەم: دۆخی ئێستات چۆنە؟

پـێش ئەوەی باسـی ئەوە بکەیـن کە دەتەوێـت بگەیـت بە کـوێ، دەبێت بزانین کە ئێستا لەکوێدایت؟ ئەتوانین تەکسیەک بگرین بێ ئەوەی بزانین خۆمـان لە کـوێین و دەچـین بـۆ کـوێ؟ بەدڵنیـایەوە نەخێر!

بۆیە زانینی دۆخی ئێستامان زۆر گرنگە و وە ڕێگەیەکی ئاسان هەیە بـۆ زانینـی ئەمە. جارێـک لەگەڵ (جـانیس)یش ئەمەمـان کـرد. ڕێگەیەکتان پێ دەڵێم کە بەهۆیەوە دەزانیت سـەرمایەکەت چەنـدە و تا چ ڕادەیەک تۆ سەرمایەداریت.

لێسـلی پێـی بـڕیم و کەوتە بۆڵەبـۆڵ: بووەسـتە توخـوا! پـێش هەمووشتێک من بەخۆم ناڵێم سەرمایەداربا بزانیت.

دەسـتم کـرد بە پێکەنـین و ووتـم: پێناسـەی مـن بـۆ سـەرمایە ئەمەیە: ئەگەر ئەمـڕۆ واز لە ئیشـکردن بهێنیـت، چەنـد ڕۆژی تـر بەرگە دەگریت تا پارەکانی ئێستات تەواو دەبن؟

هەمـان ئەو ڕێگەیـانەم بـۆ بـاس کـردن کە لەبەشـی ١١ دا بـۆ جانیسم باس کرد. ئەوانیش هەمان ڕێگەیان گرتە بەر:

١- پات و لێسلی و ترەیسی هەریەکەیان لیستێکیان درووست کرد و خەرجی مانگانەی خۆیان تیا نووسی

٢- دواتـر ئەو پارانەیـان نووسـی کە ئێسـتا هەیـانە، یـان لە سـەرچاوەی جیـاوازەوە مانگـانە دەسـتیان دەکەوێـت (جگە لەو ئیشانەی کە خۆیان دەیکەن)

٣- دواتر (داهات) دابەشی (خەرجی مانگانە) = سەرمایە

واتە (خاڵی دووەم) دابەشی (خاڵی یەکەم) یەکسانە بە سەرمایە

لێرەوە دەستیان کرد بە بۆڵەبۆڵ:

لێسلی ووتی: وەڵا من سەر لەمە دەرناکەم. ئەنجامێکم بۆ دەرچووە نازانم ڕاستە یان نا، بەڵام دڵنیام باش نییە.

ترەیسی ووتی: ئەوەی من ٧.٢ دەکات، ئەمە واتای چییە؟

ووتم: ئەمە واتای ئەوەیە ئەگەر ئەمرۆ واز لە کارکردن بهێنیت، بەشی ٧ مانگ و چەند ڕۆژێک پارەت پێیە. دوای ئەوە دەبێت بیر لە داهاتی دیکە بکەیتەوە.

ترەیسی: ئەی قوڕبەسەرم! جا خۆ بەشی سەفەرێکی خۆش ئەکات.

لێسلی: کچێ من لەجیاتی تۆ بم قسە ناکەم، ئەگەر ئەوەی من دەبینیت؟ ئەوەی من ٠.٦ دەرچووە. واتە کەمتر لە مانگێک. وابزانم من لەم تاقیکردنەوەیەدا شکستم هێنا.

بە پێکەنینەوە ووتم: نا، ئەمە ڕاست و هەڵە و دەرچوون و شکستی تیا نییە. ئەنجامەکەت دۆخی ئێستات نیشان دەدات. ئامانجی ڕاهێنانەکە ئەوەیە کە دۆخی ئێستات بزانیت، ئێ ئەوە زانیت.

پات: بەپێی ئەو زانیاریانەی من هەمە لەسەرماڵی خۆمان، ئەوەی ئێمە تەنها بەشی ١٠ مانگ دەکات. وابزانم لەمەولا دەبێت من خەبەرم بێتەوە و خەمی خۆم بخۆم. چونکە من وام داناوە کە هاوسەرەکەم تا هەتایە ئیش دەکات. ئەی باشە ئەگەر بە هەر هۆکارێک بێت نەتوانێت کار بکات؟ ئەوکاتە تەنها ئەم ١٠ مانگە مەجال هەیە بۆ ئەوەی من کارێک بدۆزمەوە و خێزانەکەمان ڕزگار بکەم. منیش کە ڕۆژنامەنووسێکی کۆنم و ١٧ ساڵە کارم نەکردووە، بڕوا ناکەم بتوانم ژیان بگەڕێنمەوە بۆ هاوسەر و منداڵەکانم.

**سێیەم: پلانەکەت چییە؟ دەتەوێت بگەیت بە کوێ و چۆن دەتەوێت پێی بگەیت؟**

ئێستا هەریەکە لە ئێوە زانیتان لەکوێدان و دۆخی ئێستاتان چۆنە. پیرۆزە! هەنگاوی داهاتوومان ئەوەیە کە بزانین بەرەوکوێ دەڕۆین. بۆ زانینی ئەمە، دوو پرسیار هەیە کە دەبێت وەڵامی بدەینەوە.

**یەکەم:**

پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە تۆ بە چی ڕێگەیەک پارە پەیدا دەکەیت؟ لەڕێگەی داهاتێکی زۆری یەکجارەکیەوە؟ بۆ نموونە لە ڕێگەت فرۆشتنی خانو و زەوی و ئۆتۆمبێل و ئەم شتانەوە کە یەکجار دەیفرۆشیت و بڕێکی زۆر پارە وەردەگریت. یان لە ڕێگەی داهاتی مانگانەوە؟ وە بەکرێدانی دووکان و خانو و هەرشتێکی تر کە مانگانە پارەت بۆ بهێنێت. بۆ نموونە ئەگەر پشک بکڕیت، یان ئاڵ وگۆڕی دراو دەکەیت. دەیکڕیت و چاوەڕوانیت نرخەکەی بەرزبێتەوە و بیفرۆشیتەوە. ئەمە جۆری یەکەمە. بەڵام ئەگەر جێگەیەکت هەبێت و بیدەیت بە کرێ، دەبێت بە جۆری دووەم چونکە مانگانا پارە وەردەگریت.

من خۆم هیوایەتم جۆری دووەمە. پارەهێنێک کە مانگانە پارەم بۆ بهێنێت. بە مەرجێک خۆم نەڕۆم بەلایدا و بە بوون ونەبوونی من ئەو هەر پارەم بۆ بهێنێت.

ترەیسی تێبینیەکی جوانی درکاند: باشە، کەواتە ئەگەر من وا بکەم لە چەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە داهاتی مانگانەم بەدەست بگات. ئەو کاتە داهاتی مانگانەم هێندە زیاد دەبێت کە لە خەرجیەکانم زیاتر دەبێت و بەم جۆرە پێویستم بەوە نییە کار بکەم. بەڵام ئەگەر بە داهاتی یەکجارەکی بێت، واتە دەبێت

بەردەوام ئاگام لە نرخەکان بێت و کڕین و فرۆشتن بکەم، هەتا ئەوکاتەی پارەکانم هێندە زۆر دەبێت پێویستم بە کارکردن نابێت و هەتا ئەمرم بەشم دەکات. ڕاستە، ئەمانە دوو ستراتیجی جیاوازن.

کیم: زۆر ڕاستە. ئینجا تکایە ئاگاداری ئەوە بن کە من نالێم ڕێگەیەکیان باشە و ئەوەی تر هەڵەیە. دەڵێم کە من لەگەڵ ڕێگەی دووەم ئاسوودەترم. لە ساڵی ١٩٨٩ وە من ئەو کارە دەکەم و ساڵی ١٩٩٤ من و ڕۆبێرت گەیشتینە سەربەخۆیی دارایی. بیرتان دەخەمەوە کە سەربەخۆیی دارایی واتە ئەو دۆخەی کە داهاتی مانگانەت زیاتر بێت لە خەرجی مانگانەت بێ ئەوەی خۆت بڕۆیت بەلایدا و کار بکەیت.

کاتێک دەڵێم سەربەخۆیی دارایی، پێویست ناکات پارەیەکی زۆرت هەبێت. تەنها ئەوەندە بەسە کە داهاتەکەت لە خەرجیەکانت زیاتر بێت و تۆ خەریکی گەڕان و ژیانی خۆت بیت.

ئینجا من خۆم زۆر حەزم لە بواری خانووبەرە و موڵکە. پڕبەدڵ چێژی لێ وەردەگرم کە خانوویەک دەکڕم و عەیب و عارەکانی چاک دەکەمەوە و دەیدەم بە کرێ و مانگانە پارەم بۆ دەهێنێت. ئەمە ئەو بوارەیە کە من خۆم تیا دۆزیوەتەوە. لەوانەیە بۆ تۆ وا نەبێت. شتێکی ئاساییە ئەگەر تۆ وەک من بیرنەکەیتەوە. بەڵام هەر دەبێت بوارێک بدۆزیتەوە کە خۆت حەزت لێیەتی و بۆ تۆ گونجاوە. دەنا وون دەبیت و سەرکەوتوو نابیت. ئێستا بۆ نموونە هاوڕێیەکم هەیە هەمیشە باسی خانووبەرەی بۆ دەکەم بەڵام نەچێت بە مێشکیدا. جارێک لە سیمینارێک باسی بازاڕی پشک کرا. دڵی گرتی و زۆر حەزی لێی بوو، ئێستا دەستی پێ کردووە و زۆر سەرکەوتووە تیایدا. قسەکەم لەسەر ئەوەیە کە دەبێت لە بوارێکدا ئیش بکەیت کە خۆت حەزت لێی بێت.

پرسیاری دووەم:

بیرتان دەخەمەوە کە پرسیاری یەکەم ئەوە بوو داهاتی مانگانە هەڵدەبژێریت یان یەکجارەکی؟ پرسیاری دووەم ئەوەیە کە تۆ ئامانجت چییە؟

لێسلی هاواری کرد: من ئامانجم ئەوەیە بە تەواوەتی سەربەخۆ بم. سەیارەی شاز و خانووی گەورەم ناوێت. ئەسڵەن هەر تاقەتی حساب و کتابی پارەم نییە. بەس بگەم بە سەربەخۆیی دارایی ئیتر هیچم ناوێت. دەمەوێت تەنها وێنە بکێشم. حەزم لەوە نییە ئیشێک بمبەستێتەوە و بڵێن ئەو کاتە وەرە و ئەو کاتە بڕۆ. دەمەوێت ئازاد بم و ئەگەر پێویستی نەکرد ئیش نەکەم. من خۆم ساغ کردووەتەوە کە حەزم لە داهاتی مانگانەیە. داهاتێک کە گشت خەرجیەکانم پڕبکاتەوە. ئێستا خەرجی من ئەگەر هەزار دۆلار بێت، پێویستم بە داهاتێکی هەزار دۆلارییە بۆ هەر مانگێک.

پات: ئێستا ئەوەی تۆ ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام من ئامانجم نییە. من تەنها دەمەوێت کارێک بکەم کە پارەی زیاتر و زیاترم بۆ بهێنێت. ئێستا دەزانم کە پاشەکەوتی مووچەی هاوسەرەکەم تەنها بەشی ساڵێک دەکات. کەواتە دەبێت شتێک بکەین کە لێی پەشیمان نەبینەوە. چونکە خوا دەیزانێ سبەی چی ڕوودەدات. دنیا هەزار شتە. لەڕاستیا ئێمە ئامادە نین بۆ هەر ڕووداوێکی نەخوازراو.

چۆن بگەین بە ئامانجەکەمان؟

لێسلی خۆی پێ نەگیرا و ووتی: باشە ئەوە من زانیم ئامانجم چییە. ئەی چۆن بگەم بە ئامانجەکەم؟

کیم: ئینجا لێرەوە ئەرکی تۆ دەستپێدەکات. دەبێت پلانێک دابنێیت کە دەتگەیەنێت بە ئامانجەکەت. چەندین ڕێگە هەیە، بەڵام کاری تۆ ئەوەیە کە ڕێگەیەک بدۆزیتەوە کە خۆت حەزت لێیەتی.

ناخۆشترین شت ئەوەیە کە لە بوارێکدا بیت کە خۆت حەزت لێی نییە. بیری سەردەمی دواناوەندیم دەکەوێتەوە کە ئەو هەموو وانەیەمان دەخوێند حەزمان لێی نەبوو و نەماندەزانی ئەمە لە ژیانی دەرەوەی خوێندنگە چۆن بەکاردێت و چۆن سوودی لێ وەردەگرین.

ترەیسی: وابزانم هەر لەبەر ئەوە بوو من لە زیندەوەرزانیدا کەوتم.

ئاخێر توخوا شیکاری جەستەی بۆق کەی ئیشی منە؟

پات: وەک کیم ووتی، چەندین ڕێگەی بزنس هەیە کە دەتگەیەنێت بە خەونەکەت. من لیستێکم ئامادە کردووە کە چەندین جۆر بزنسی تێدایە و کیم هەندێکی بۆ زیاد کردووە. لیستەکەم پێیە ئێستا.

لێسلی: ئیشێکی زۆر باشت کردووە کە هێناوتە.

ئەمەی خوارەوە لیستەکەی پات بوو:

موڵک: بۆ نموونە خانو و زەوی و خانووی کرێ و دووکان و شوقە و ئۆفیس و کۆگا و گەراج ...هتد.

کاغەز: لە پشک و کۆمپیالە و بۆند و بەڵێننامە و هەر نووسراوێکی سەر کاغەز.

بزنس: هەر کار و پیشەیەک کە دەیکەیت و پارەت بۆ دەهێنێت. یان هێنانی لقی کۆمپانیایەکی گەورە یاخود بازرگانی شەبەکی (تۆڕیی). بازرگانی خۆراک و ئاو و نەوت و بەنزین و مادەگرانبەهاکان و شەکر و گۆشت ...هتد.

ئاڵ و گۆڕی دراو ، داهێنان، یان نووسینی کتێب و هەر بەرهەمێکی هوونەری.

پات سێ جۆری گرنگی باس کردووە لە سەرەوە، ئەوانیش موڵک و کاغەز و بزنس، بەڵام ئەمانە تاکە ڕێگە نین و چەندین جۆری تر هەیە کە ئاماژەیان پێ نەدراوە. تەنانەت ئێستا باوی

ئەوەیە کە سەرمایەدارێک دەستیان کردووە بە درووستکردنی یاریزان و ئەستێرەی سینەمایی. بۆ نموونە کەسێک دەبینن کە بەهرەیەکی هەیە، بەڵام توانای دارایی نییە. دێن و دەستگیرۆیی دەکەن و گەورەی دەکەن، پاشان پشکیان هەیە لە هەر کار و چالاکی و ڕیکلامێک کە ئەو کەسە دەیکات.

ترەیسی: ئەوە ڕوونە کە هەموومان ئازادین لەوەی چ بوارێک هەڵدەبژێرین، بەڵام پرسیارێک! کاتێک زانیمان دەمانەوێت بوارێک هەڵبژێرین، ئەوسا پلانەکە چۆن دەتگەیەنێت بەوە؟

کیم: پرسیارەکەت جوانە. زۆربەی کات کە بەکەسێک دەڵێت پلان دابنێ، زۆر لەخۆی قورس دەکات. لەڕاستیا کە دەڵێین چۆن دەتەوێت بە پلانەکە بگەیت بە ئامانجەکەت، مەبەستمان ئەم خاڵانەیە:

١- من چ بوارێکی وەبەرهێنان هەڵدەبژێرم؟

دەتوانیت زیاتر لە بوارێک هەڵبژێریت، کەس لاریی لەوە نییە. بەڵام بە ئەزموونی خۆم، من ئەو کاتانە سەرکەوتوو بووم کە لە یەک بواردا کارم کردووە. چونکە هەموو خەیاڵ و تەرکیزم لەسەر ئەو بوارەیە و کاتی تەواوی بۆ تەرخان دەکەم.

٢- لەو بوارەی هەڵتبژاردووە، کار لە چی بەشێکیدا دەکەیت؟

مەبەستمان لەوەیە کە دەبێت لەناو ئەو بوارەدا، بەشێک هەڵبژێریت کە خۆت حەزت لێیەتی. بۆ نموونە ئەگەر لە بواری پشکدا کار دەکەیت، دەبێت بزانیت پشکی چ جۆرێکی کۆمپانیا دەکڕیت.

---

مەبەستی نووسەر لەوەیە کە ئەگەر تۆ بواری (بازرگانی) هەڵدەبژێریت، دەبێت دیاری بکەیت کە بازرگانی پۆشاک دەکەیت؟ یان خواردن؟ یان مۆبایل؟ دەبێت لە بواری بازرگانیدا، بەشەکە دیاری بکەیت.

ئێستا من خۆم هەرگیز پشکی کۆمپانیای تەکنەلۆجیا ناکڕم، چونکە هیچی لێ نازانم. یان دەڵێم بواری موڵک هەڵدەبژێرم. باشە، بەڵام چ جۆرێک؟ خانوو؟ زەوی؟ یان ئۆفیس و شووقە و دووکان؟ من پێم باشە بەشەکە ڕوون بکەیتەوە و خۆت تەرخان بکەیت بۆ ئەو بەشەی کە حەزت لێیەتی.

**پرسیاری سێهەم:**

چەندەم کات هەیە بۆ گەیشتن بە خەونەکەم؟

کاتم چەندە بۆ ئەوەی پلانە بچووکەکانم جێبەجێ بکەم بۆ ئەوەی بەبۆنەی ئەوانەوە بگەم بە پلانە گەورەکەم؟

ئەمە کلیلی هەموو پلانەکەیە، دەتوانیت زۆر لە خۆتی قورس بکەیت، بەڵام بە قسەی من دەکەین شتەکە سادە و ئاسان وەرگرە. پلانە بچووکەکانت جێبەجێ بکە، کە دەتگەیەنێت بە ئامانجە گەورەکە.

لیسلی: پلای تۆ چی بوو کاتێک کە دەستت پێکرد؟

بە خەندەیەکەوە ووتم: پلانی من و ڕۆبێرت زۆر چڕوپڕ بوو. پلانمان وابوو کە ساڵی ٢ هۆبەی بەکرێدان بکڕین، وە بەردەوام بین لەسەر ئەم پلانە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ. خەیاڵمان تەنها لای ئەو خانوانە بوو کە بۆ خێزانی کەم کراوون. دامانئابوو دوای ١٠ ساڵ خاوەنی ٢٠ هۆبە بین، کە لەوێوە داهاتێکما دەست دەکەوت کە زۆر زیاتر بوو لە خەرجیەکانمان.

ترەیسی: ئەی پلانەکە وەک خۆی ڕۆیشت؟

کیم: بەڵێ، بەڵام بە هەمان شێوەی سەرەتا نا!

لێرەدا هەرسێ خانمەکە هەستیان بە نائومێدی کرد.

کیم: کاتێک دەستمان کرد بە پلانەکە، خانووی یەکەم و دووەم و سێهەم لەو هۆبە بچووکانە بوو کە بۆم باس کردن. دواتر

سەیرمان کرد کە مامەڵەی خانووی گەورە و شوقە بە هەمان شێوە کارێکی قورس نیە. بۆیە دەستمان کرد بەوەش. جالێرەوە، لەجیاتی ئەوەی بە ١٠ ساڵ بگەین بە ئامانجەکەمان، تەنها بە ١٨ مانگ گەیشتین.

ئەو ڕۆژە، هەتا دەمەو ئێوارە، هەرسێ خاتوونەکە خەریکی نووسینی پلانەکەیان بوون. زۆر دڵیان خۆش بوو بەوەی کە شتێکیان بە شتێک کردووە.

لێسلی سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و دەستی کرد بە پێکەنین: وەی! خۆ ئەوە سەعات ٧ ە. ئەوەندە سەرقاڵ بووین بیری ئەوەمان نەمابوو نانێکی کچانەی خۆش ئامادە بکەین.

پات: کچینە با نانی ئێوارە بخۆین.

لە کۆتایی ڕۆژەکەدا گەیشتینە ئەمە:

کاتێک پلانەکەت دادەنێیت:

ئامانجەکەت دیاری بکە

پاشان ئەم سێ پرسیارە لەخۆت بکە:

یەکەم: دەمەوێت لە چ بوارێکدا وەبەرهێنان بکەم؟

دووەم: لەو بوارەدا چ شتێک هەڵبژێرم؟

سێهەم: چەند کاتم هەیە بۆ ئەوەی بگەم بە ئامانجەکەم؟

## بەشی نۆزدەهەم
## "سێ جۆر پیاو، سێ جۆر وەبەرهێنان"

لە سەرەتای نانی ئێوارە، هەموومان سەرقاڵی و هیلاکی ئەو ڕۆژەمان پێوە دیار بوو. قسەکانمان وورده وورده ڕووی کردە باس و خواسی پیاو.

کیم: کچینە! من و (چێری) هاوڕێم جارێک پێکەوە باسی پیاومان دەکرد. هەروەک چۆن پیاوان یەک دەگرن و باسی ئێمەی خانمان دەکەن، ئێمەش هەمان شێوە سەیری کەسەکانی چواردەورمان دەکرد و هەڵسەنگاندنمان بۆ دەکردن.

چێری دەیووت: دەزانیت کیم، لەم دنیایەدا تەنها ٣ جۆر پیاو هەیە؟

منیش ووتم: چی؟ ئەوە تۆ تەواویت؟ تەنها ٣ جۆر؟ ئەو هەموو جۆرە هەیە سێ جۆر چی و شتی چی؟

ووتی: دە وەرە من ئەم ٣ جۆرەت بۆ باس دەکەم، ئەگەر تۆ هەر جۆرێکی ترت دۆزیەوە پێم بڵێ.

ووتم: دەی بڵێ.

ووتی: سێ جۆر هەیە:

کوڕی چوختی و خراپ

کوڕی چاک و بەڕێز

کوڕی ترسنۆک و دەبەنگ

ووتم: دەی گوێم گرتووە.

ووتی: کوڕی چوختی و خراپ ئەوانەن کە باوکت پێی ناخۆشە بیانناسیت. جەویان خۆشە و سەرنجڕاکێشن، خانمان ناتوانن خۆیان لێیان بەدوور بگرن. قورسە لە مێشک و خەیاڵت دەرچن و هەمیشە خەیاڵت لایانە و چاووت لەسەریانە. ئیزعاج نین و ئەوە دەکەن کە تۆ دڵت پێی خۆشە. بەڵام سەرت سوور نەمێنێت کاتێک

دڵت دەشکێنن و بەجێت دەهێڵن. هەرکەسێکت خۆش دەوێت، یان ڕقت لە هەرکەسێکە، ئەوا ئەگەری زۆرە ئەو کەسە یەکێک بێت لەم جۆرە کوڕانە.
بەردەوام بوو و ووتی: جۆری دووەم کوڕە بەڕێز و باشەکانن. هەموومان چەند کەسێکی وا دەناسین، هاوڕێی چاکن و هەمووکەس حەز بە ناسینیان دەکات. لە خۆتەوە حەزدەکەین قسەیان لەگەڵ بکەیت و کاتێک کێشەیەکت هەبێت گوێت لێ دەگرن و هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت لەگەڵیاندا. بەدەگمەن لەگەڵ ئەم جۆرە کوڕانەدا تووشی کێشە و دەمەقاڵێ دەبیت، چونکە پێش ئەوەی بابەتەکە گەورە ببێت، ئەوان باسی دەکەن و ناهێڵن گەورە ببێت و لەکۆنترۆڵ دەرچێت. بێ سەرئێشە و لەسەرخۆن. سوپرایزیان نییە و پلانەکانیان دیارە و دەزانیت بەتەمای چین. ئەگەر لەگەڵ ئەم جۆرە کوڕانەدا چویتە دەرەوە، هەرگیز لێیان مەترسە کە ماچت بکەن، چونکە بەڕێز و بە ئەتەکێتن.
ووتم: ئەی دەبەنگ و ترسنۆکەکان؟
ووتی: ئەم جۆرە تەنها ژیانیان لەگەڵ بەڕێ دەکەیت. کەسانی مردوون و هیچ تام و چێژێکی ژیانیان تیا نییە. پەیوەندی لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا زۆر زوو کۆتایی دێت. نەکەی چاوەڕوانی ئەوە بیت سوپرایزێکت بۆ بکات و ئێوارەیەکی ڕۆمانسی بتباتە دەرەوە و لە ناو ڕووناکی مۆمەکان و لەژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرەدا نانێک بخۆن. ئەمانە باوەڕیان بە سوپرایز و شت نییە. هیچ کات دەستکەوتی گەورە بەدەست ناهێنن لە ژیاندا، چونکە ئامادە نین ئیسراحەت و ئارامی لەخۆیان تێکبدەن. دەیانەوێت هەمووشتێک ئارام و ڕێک و ڕەوان بڕوات و تاقەتی بەرز و نزمییان نییە و زۆربەی شت بەلای ئەمانەوە جێگەی مەترسییە،

بۆیە پێیان دەڵێم ترسنۆکەکان. بە کوردیەکەی بوون و نەبوونیان وەک یەک وایە و تەنها جادەیان قەرەباڵغ کردووە و تەواو.
ووتم: هەرسێ جۆرەکە ڕوونە. ئێستا بە قسەی تۆ بێت هەرپیاوێک هەیە لەسەر ئەم زەویە، هەر دەبێت یەکێک بێت لەم سی جۆرە؟
ووتی: ئادەی تۆ پێم بلی. بەدڵی خۆت بیر لە کەسێک بکەرەوە، ئایا یەکێکە لەو سێ جۆرە یان نا؟
ووتم: وەڵا وایە!
ووتی: ئادەی چ جۆرێک بوو؟
ووتم: جۆری یەکەم
بە پێکەنینەوە ووتی: تەواوە! بەدڵی خۆت بیر لە کێدەکەیتەوە بیکەرەوە. دڵنیا بە یەکێکە لەم سێ جۆرە. منیش دوو سێ خولەک بیرم دەکردەوە لەو کەسانەی ناسیوومن. بیرم لە هەرکەسێک دەکردەوە یەکێک بوو لەم سێ جۆرە.
ووتم: قسەی تۆیە! بەڕاستی جوان ڕوونت کردوەتەوە هاهاها.

**کوڕە خراپەکان، کوڕە چاکەکان، کوڕە ترسنۆکەکان**

که تەواو بووم، پات و لیسلی و ترەیسی هەرسێکیان قاقا پێدەکەنین. هەستم پێکردن کە لەناو مێشکی خۆیاندا بیریان لەو پیاوانە دەکردەوە کە ناسیویانن.
لیسلی: خۆشەویستەکەم لە زانکۆ یەکێک بوو لە کوڕە خراپەکان. بەڵام من شووم کرد بە کوڕێکی چاک. وابزانم ئەوەش هۆکاری ئەوە بوو کە زۆرپێکەوە نەماینەوە، لەوانەیە من لەو کەسانە بم کە لەگەڵ کوڕە خراپەکان ئاسودە بووبم.
ترەیسی بە پێکەنینەوە ووتی: کوڕی چوختی و خراپ، ئەگەر دوای یەکەم ژووان گوڵێکت بۆ بهێنێت، دنیایەک دڵت پێی خۆشە. بەڵام

ئەگەر کوڕی ترسنۆک گوڵت بۆ بهێنێت هەست بە ترس دەکەیت و دەڵێت بەخوا ئیشێکی پێمە و بەتەمای شتێکە.
پات: کوڕە چاکەکان دەتبەنە دەرەوە و کاتێکی خۆش بەسەردەبەن و بەڵام هیچی تر ناکەن. کوڕە خراپەکان ئەوەی بە مێشکتدا نایەت دەیکەن هاهاها.
لێسلی: کاتێک لە دواناوەندی بووم، لەگەڵ کوڕێکی ترسنۆک پەیوەندیم هەبوو. ئەزانی بۆ؟ چونکە کەی بمووستایە لەوێ بوو. بەڵام زۆربەی کچە بەناوبانگ و دیارەکان، لەگەڵ کوڕە خراپەکان پەیوەندیان هەبوو. کاتێک منیش وازم لێهێنا و کوڕێکی خراپم ناسی، دەم و دەست لە مەکتەبەکەم بەناوبانگ بووم و کەوتمە بەر قسە و باس.
پات ووتی: بابەتەکە زیاتر پەیوەندی بە ڕەفتار و هەڵس و کەوتەوە هەیە، نەک شکڵ و شێوە. کەسی وا هەیە نە باڵای بەرزە و نە هیچ تایبەتمەندیەکی تێدایە، بەڵام دڵنیام لەوەی کە یەکێک بوو لە کوڕە خراپە چوختیەکان.
منیش پرسیم: باشە بۆچی خانمان حەزیان لە کوڕە خراپەکانە؟
هاوڕێم هەیە دنیایەک کوڕی باش دێتە سەر ڕێگەی، کەچی هەر ناتوانێت ئەو کوڕە خراپەی لەبیربچێتەوە کە پێنج ساڵ لەمەوپێش ناسیویەتی.
ترەیسی: کوڕە خراپەکان ترسناکن! ژیانیان پڕە لە نهێنی. ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە و چانسیان بۆ گەورە بوون زیاترە. هاوسەرەکەم لە کوڕە چاکەکانە، منیش وام، کاتێک هاوسەرگیریمان کرد هەردووکمان ئەوەمان دەویست، ژیانێکی بێ سەرئێشە و بێ سەرکێشی.

لێسلی ووتی: بەڕای من ژیان لەگەڵ کوڕە خراپەکان، لە نزمیدا نزمە. بەڵام کە بەرز بووەوە زۆر بەرز دەبێتەوە و چانسەکان لە ژماردن نایەن.

دواتر هەریەکەمان چەند نموونەیەکمان هێنایەوە بۆ کوڕی خراپ و باش و ترسنۆک لەنێوان ئەکتەر و کەسایەتیە بەناوبانگەکاندا و تا درەنگ پێکەنین.

**سێ جۆر وەبەرهێنان**

خۆ دەمانتوانی تا نیوەشەو دانیشین و هەرچی پیاو هەیە لە زەویدا باسی بکەین، بەڵام لەجیاتی ئەوە ڕێڕەوی قسەکانم برد بە لایەکی تردا.

کیم: کچینە دەزانن، وەک چۆن سێ جۆر پیاو هەیە، ئاوهاش سێ جۆر وەبەرهێنان هەیە.

لێسلی: جارێ بەم دووعایە ناڵێم ئامین.

کیم: باشە ئەگەر بێین و وەک سێ جۆرەکەی پیاو، سێ جۆری وەبەرهێنانیش جیا بکەینەوە، بزانم دەزانن وەبەرهێنانی (کوڕی خراپ) کامەیە؟

پات: دەزانم دەتەوێت بڵێیت چی، واتە وەک چۆن پەیوەندی لەگەڵ کوڕی خراپ پڕە لە ململانێ، ئەم جۆرەی ئیش کردنیش پڕە لە ململانێ. دە بڵێ وا نییە؟

کیم: ڕێک وایە! کوڕە خراپەکان پڕن لە ململانێ و دەبێت هەمیشە چاوت لەسەریان بێت. نابێت بەجێیان بهێڵیت، چونکە ئەگەری زۆرە کە گەڕایتەوە لەدەستت دەرچووبن. دەبێت هەمیشە چاووت لەسەریان بێت و دەستت پێیانەوە بێت چونکە ئیشەکانیان چاوەڕوان نەکراوون و سوپرایزیان زۆرە. کوڕە خراپەکان کەمێک سەرئێشەیان زۆرە و دەبێت زیاتر ئیشیان لەسەر بکەیت و

سەرقاڵ بیت پێیانەوە، بەڵام ئەگەر بزانیت چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەیت، چەندین قات قازانج دەکەیت لەوسەرەوە
ترەیسی: بەڵام کوڕە چاکەکان هەرگیز دڵت ناشکێنن
کیم: ڕاستە، بەڵام ئەمانیش نابێت فەرامۆشیان بکەیت. ڕاستە پێویست ناکات وەک کوڕە خراپەکان هەمیشە چاووت لەسەریان بێت، بەڵام نابێت پەیوەندیان لەگەڵ بپچڕێنیت بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە گرنگن بۆت. ئەمان گیانی لێبوردنیان زیاترە لە کوڕە خراپەکان. ڕاستە پاداشتی گرنگیپێدانیان وەک کوڕە خراپەکان نییە، بەڵام جۆرێکیش بەجێتناهێڵن کە ئاوات بە مەرگ بخوازیت.
کیم: ئەی باشە کێ دەزانێت ترسنۆکەکان کامانەن؟
لێسلی: ترسنۆکەکان بێزارکەر و بێتامن. هیچ کەیف و خۆشیەکیان نیە.
بە پێکەنینەوە ووتم: وایە، ئەمانە ساڵێک بەجێیان بهێڵە، کە هاتیتەوە هەر وەک خۆیانن و هیچ شتێک نەگۆڕاوە. پێویستیان بەوە نییە گرنگیان پێ بدەیت، ئەسڵەن هەر چاوەڕوانی ئەوەت لێ ناکەن کە گرنگیان پێ بدەیت. پەیوەندی لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە هیچ ترسێکی تێدا نییە، بەڵام هیچ خۆشیەکیشی تێدا نییە.
لێسلی: ئەی بژی! وەبەرهێنانەکانیش ڕێک و ڕەوان وەک پیاو وان، بەڵام ئەوەی جیاوازە وەبەرهێنانەکان بەجێتناهێڵن بۆ وەبەرهێنەرێکی جوانتر و گەنجتر.
ترەیسی بە گاڵتەوە ووتی: وەبەرهێنانەکان لە پاشەمله باست ناکەن.
پات: وە کێشەت نییە و ناترسیت کە وەبەرهێنانەکەت نیوەشەو لە کوێیە و دڵت لای نییە.

ئەوەندە پێکەنین، کە بیرمان نەمابوو شاگردەکان سەیرمان دەکەن لە چێشتخانەکە.

کامە کامەیە؟

ترەیسی: باشە بزانین کامە کامەیە؟ کام وەبەرهێنان کوڕە خراپەکەیە و کامە کوڕە چاکەکە و کامە ترسنۆکەکە؟
منیش لیستی سێ جۆرەکەی پیاوم درووست کرد لەسەر وەرەقەیەک. ووتم: وەرن بە لیستی چەند وەبەرهێنانێک درووست بکەین و پاشان بڕیار دەدەین کە کامە کامەیە؟
پات: ئەگەرمن شتێک بکڕم و دای بنێم هەتا نرخەکەی بەرز دەبێتەوە، ئەوە کوڕە باشەکەیە. چونکە پێویستم بەوە نییە هەموو دەقەیەک چاووم لەسەری بێت، تەنها جار جار سەیرێکی نرخەکان دەکەم بۆ ئەوەی بزانم هیچ گۆڕاوە یان نا.
کیم: ئەی ئەگەر بتەوێت ڕۆژانە ئاڵ و گۆڕی پێ بکەیت، ئەوسا دەبێت کە هەموو دەقەیەک ئاگات لە نرخەکان بێت و هەرکات نرخ بەرز بووەوە بیفرۆشیتەوە.
ترەیسی: ئەوسا دەبێت بە کوڕە خراپەکە، چونکە دەبێت هەمیشە خەیاڵت لای بێت و نابێ چاوی لێ غافڵ بکەیت.
کیم: زۆر ڕاستە، کەواتە ئاڵ و گۆڕی ڕۆژانە دەکەینە لیستی کوڕە خراپەکە و ئاڵ و گۆڕی ماوەدرێژ دەخەینە لیستی کوڕە چاکەکە.
ترەیسی: کەواتە ئەگەر بابەتەکە پشک بێت یان موڵک یان هەرشتێکی تر بێت، ئەوا بەپێی جۆری مامەڵەکە دەگۆڕێت.
کیم: ڕاستە، باشە ئەگەر من بڕێک پارە بدەم بە کەسێک و لە قازانجی ئیشەکەی بەشێکم بداتێ، ئەوکاتە چ جۆرێکە؟
ووتیان کوڕە باشەکەیە.

لیسلی بە پێکەنینەوە ووتی: بەڵام ئەگەر کابرا بە باشی ئیشەکەی نەکرد، ئەوسا دەبێتە کورە خراپەکە و دەبێت چاووت لەسەری بێت نەکا لەدەستت دەرچێت.
کیم: ئەی ئەگەر خانوویەکم هەبێت و کرێچی تیا نەبێت و خانوەکەش خەریکە کۆن دەبێت.
هەموویان ووتیان: کورە خراپەکە!
ووتم بۆ؟ ووتیان: لەبەرئەوەی کۆنە و کرێچی تیا نیە. دەبێت چاووت لەسەری بێت و ئیشی لەسەر بکەیت بۆ ئەوەی بیهێنیتەوە سەر خەت.
پات: ئێستا دەزانم بۆچی دراوسێکەم هێندە کێشەی هەیە لەگەڵ مێردەکەی، چونکە شووی کردووە بە کورێکی خراپ و دەبێت ئاگای لێی بێت.
لیسلی: ئەگەر خانوەکەت چاک کردەوە و کرێچیت بۆ دۆزیەوە، دەبێتە کورە چاکەکە. کەمێک ئاگات لێی دەبێت، بەڵام فەرامۆشی ناکەیت. منیش قسەکەیم بەدڵ بوو.
پات: ئەی نموونەی ترسنۆکەکان؟
کیم: ئادەی تۆ چی دێت بە مێشکتدا؟
پات: بۆ نموونە پارەپاشەکەوت کردن. هیچ ترسێکی نییە و ئەگەر یەک ساڵ بەجێی بهێڵیت هەروەک خۆیەتی و هیچ زیادەیەکی ناچێتە سەر.
کیم: دەستخۆش، جوانترین نموونە.
ترەیسی: ئەی ئەگەر ئاڵتوون و زیو بکڕیت؟
کیم: بەڕای من کورە چاکەکەیە، چونکە ترسم لێی نییە و جار جار چاوێک بە نرخەکاندا دەخشێنمەوە.

پات: ئاگادار بن وەبەرهێنانی کوڕی خراپ، دەکرێت زیانێکت لێ بدات تێکبشکێیت و ئاوات بە مردن بخوازیت. ئێمە بۆیە لێرەین بۆ ئەوەی کیم پێمان بڵێت چی بکەین ئەگەر تێکشکاین؟
کیم: راستە لەوانەیە لە هەر ئان و ساتێکدا تێکبشکێیت، بەڵام کاتێک زیاتر فێردەبیت، ئازاری تێکشکانەکە کەمتر دەبێتەوە.
لێسلی: باشە شتێکی تر، ئەی ئەگەر پارەیەک بخەینە بزنسێکەوە؟
کیم: بزنسەکە هی خۆتە یان خەڵکی تر؟
لێسلی: با بڵێین کە بەشێکی ئیشەکە دەکرمەوە و خۆم بەڕێوەی دەبەم و دەسەڵاتم دەبێت بەسەریدا.
ترەیسی: من تا ئێستا بیرم لەم جۆرەیان نەکردووەتەوە. براکەم هەندێک پارەی داوە بە هاورێیەکی و ئیشی پێوە دەکات. ئەگەر قازانجی کرد بەشی براکەمی لێ دەدات و ئیتر براکەم ئاگای لە هیچ نییە.
کیم: ئەگەر ئاگای لە هیچ نەبێت، ئەوسا وەک قوماری لێدێت.
لێسلی: ئەی ئەگەر خۆم لە ئیشەکەدا بم؟
ترەیسی: گومانی تیا نییە کە کوڕە خراپەکەیە، چونکە دەبێت بەردەوام ئاگات لێی بێت نەوەک بکەوێت و زەرەر بکەیت.

**داهاتی (ئاگایی) و (نا ئاگایی)**

ووتم: لێرەوە دەڕۆین بۆ بابەتێکی زۆر گرنگ، ئەویش داهاتی ئاگایی و داهاتی نا ئاگاییە. داهاتی ئاگایی ئەوەیە کە خۆت کاری بۆ ئەکەیت و ئاگات لێیەتی. داهاتی نا ئاگایی ئەوەیە کە تۆ ناچیت بەلایدا و ئاگات لێی نییە و خۆی زیاد دەکات. ئەگەر دەتەوێت بگەیت بە سەربەخۆیی دارایی، ئەوا دەبێت چاووت لەسەر داهاتی (ئاگایی) بێت. ناکرێت تەنها بە داهاتی (نائاگایی) بگەیت بە سەربەخۆیی دارایی.

پات ووتی: چۆن بزانین داهاتەکەمان (ئاگایی)ە یان (نا ئاگایی)
ووتم: هەرکاتێک پارەیەکت دا بە کەسێک و ئەو ئیشی پێوە کرد و تۆ ئاگات لە دنیا نەبوو، ئەوە داهاتی نا ئاگاییە. بەلام ئەگەر بە هەر شێوەیەک خۆت لە ئیشەکەدا بوویت، ئەوە دەبێتە داهاتی ئاگایی. واتە ئاگات لێیەتی.
ترەیسی ووتی: کڕینی زەوی یان هەرشتێکی تر کە مامەڵەی پێوە بکەیت، ئاگاییە؟
ووتم: بە دڵنیاییەوە.
لێسلی: وابزانم هەموو ئەو ناوانەی لە ژێر لیستی کوڕی خراپدا دامانناوە هەموویان (ئاگایی)ن. ناوی خۆیان بە خۆیانەوەیە، دەبێت ئاگات لێیان بێت وەک چۆن ئاگات لە کوڕە خراپەکەیە.
ترەیسی: ئاخێرجۆری کوڕە باشەکانیش هەر داهاتی ئاگایین، بەڵام کەمتر ئاگات لێیانە.
پات: بەو قسانە بێت کوڕە خراپەکان لەسەدا سەد نائاگایین.
لێسلی: وایە، بۆ نموونە مووچەی خانەنشینی داهاتێکی نائاگاییە. تۆ ئاگات لێی نییە و مانگانە دێت.
ترەیسی: زۆر کەس دەناسم پارە دەدەنە دەست کەسێک و ئەویش شتێکیان بۆ دەکڕێت. خاوەنی پارەکە بۆی هەیە نرخی شتەکە بزانێت، بەڵام ناتوانێت مامەڵەی پێوە بکات، چونکە داویتیە دەست ڕاوێژکارێک کە مامەڵەی بۆ پێوە بکات.
کیم: ئەگەر کەسێکی تر مامەڵە بە پارەکانتەوە بکات ئەوە نائاگاییە. لەبەر ئەمەیە من پێم باش نییە زۆر چاووت لەسەر داهاتی نائاگایی بێت، بەڵکو لە بوارێکدا کار بکەیت کە خۆت کۆنترۆڵت هەبێت بەسەریدا و ئاگات لە بار و دۆخەکە بێت.

لێسلی: باشە ئێستا پرسیارەکەم ڕوونە. ئەگەر من پارەیەک بخەمە ناو ئیشێکەوە و خۆم دەسەڵاتم هەبێت تیایدا و بەڕێوەی ببەم، ئەوە ئاگاییە. ئەگەر خۆم بەڕێوەی نەبەم بەڵام دەسەڵاتی بڕیاردانم هەبێت، ئەوەش هەر ئاگاییە. بەڵام ئەگەر نە بەڕێوەی ببەم و نە ئاگام لێی بێت، ئەوە نا ئاگاییە.

کیم: بژی! خۆت وەڵامی خۆتت دایەوە.

**لەکۆتاییدا**

ترەیسی: لە کۆتاییدا من ئەمە تێگەیشتم: سێ جۆر پیاو هەیە، خراپەکان و باشەکان و ترسنۆکەکان. بە هەمان شێوە سێ جۆر وەبەرهێنانیش هەیە کە وەک سێ جۆرەکەی پیاو وان. تۆ دەتوانیت هەم وەبەرهێنانێکت هەبێت کە ئاگایی بێت و خۆت شەو و ڕۆژ ئاگات لێی بێت، هەم وەبەرهێنانێکت هەبێت کە نائاگاییە و خۆت ئاگات لێی نییە. جا من لێرەوە ئەوەم بۆ دەرکەووت کە ئەوەی ئاگایە و بێ ئاگایە ئێمەین وەک وەبەرهێنەر، نەک خودی وەبەرهێنانەکە.

ووتم: ئای دەستخۆش، ئەوە جوانترین کورتکردنەوە بوو. بەڵام ئەوە بزانن کە من ناڵێم ئەم جۆرە لەو جۆرە باشترە. دەبێت وەک کەسێکی زیرەک خاڵی باش و خراپی هەریەکەیان لێک بدەیتەوە و ئەوە هەڵبژێریت کە بۆ تۆ گونجاوە. پێت وا نەبێت تەنها بە مووچەی خانەنشینی دەتوانیت زەنگین بیت. پێت وا نەبێت تەنها بە کرێخانوویەک دەتوانیت پێداویستیەکانت پڕ بکەیتەوە. وورد ببەوە و بزانە کە کامیان لەگەڵ تۆ دەگونجێت. بەڵام ئەوە بزانە ئەگەر نیازی ئەوەت هەیە لە ڕووی داراییەوە سەربەخۆ بیت، دەبێت وەبەرهێنەرێکی بە ئاگا بیت.

## بەشی بیستەم
## "چوار کلیلی سەرەتا، بۆ وەبەرهێنانێکی سەرکەوتوو"

ئەگەر پەروەردەی پیاوێک بکەیت، پەروەردەی کەسێک دەکەیت.
بەڵام ئەگەر پەروەردەی خانمێک بکەیت، پەروەردەی خێزانێک دەکەیت.

بەیانی دواتر، هێشتا پێدەکەنین بە بابەتی سێ جۆرەکەی پیاو کە دوێنێ باسمان دەکرد. بەدەم قسە کردنەوە ڕۆیشتین بەرەوە ژووری میوانەکە. دوای ئەوەی کە هەرکەسە و لەسەر کورسی خۆی دانیشت، پێم ووتن کە پێم خۆشە چەند کلیلێکتان پێ بڵێم بۆ ئەوەی ببن بە وەبەرهێنەرێکی سەرکەوتوو.

زۆرینەی ئەم کلیلانە، خۆم دوای چەندین هەڵە و ئەزموون فێریان بووم.

لیسلی: کێ خوا دەیداتێ لە ئەنجامی هەڵەی کەسانی دیکەوە فێرببێت؟! دڵنیام هەندێک لەو هەڵانە وای کردووە کە زیانی زۆر گەورە بکەیت.

کیم: بە دڵنیاییەوە. ئەو هەڵانە تەنها زیانی پارەیان لێ نەداووم، بەڵکو هەم دەرفەتەکانم لە کیس چووە و هەم کاتی زۆرم بە فیڕۆ داوە.

پات: ئادی با گوێمان لێیان بێت.

**کلیلی یەکەم:**

کلیلی یەکەم لای زۆربەتان ئاشکرایە. ئەویش ئەوەیە پێش ئەوەی دەست بکەیت بە هەر کارێک، سەرەتا دەبێت خۆت پڕ زانیاری بکەیت چونکە هەتا زیاترفێربیت، زیاتر بەرەوپێش دەچیت. پیش ئەوەی هەر کارێک بکەیت، برۆ زیاتری لەسەر بخوێنەرەوە و خۆت فێر بکە. هەر لە چواردەوورت چەندین ڕێگەی فێربوون

هەیە. دڵنیا بە ئەو زانیاریانەی پێش کارەکەت کۆی دەکەیتەوە، جیاوزی نێوان پارەپەیداکردن و پارەبەفیڕۆدانت بۆ درووست دەکات.

ناکرێت و نابێت، پێش ئەوەی فێری مەلەکردن بیت خۆت هەڵبدەیتە ناو ئاوێکی قووڵەوە، چونکە گومانی تیا نییە کە نوقم دەبیت و دەخنکێیت. خۆهەڵدانە ناو دنیای وەبەرهێنانیشەوە وایە، بێ زانیاری نوقم دەبیت.

هۆکارێکی سەرەکی ئەوەی کە من بازرگانی (تۆڕئاسا)م پێ باشە ئەوەیە، کە ئەگەر کۆمپانیاکە ڕاستگۆ بێت، بەشداربوانی پەروەردە دەکات و چەندین کۆڕ و سیمیناریان پێ دەدات لەسەر گەشەسەندن و بازاڕکردن و ڕیکلام کردن و گەشەپێدانی خود. کۆمپانیا باشەکان ناگەڕێن کە تەنها فرۆشیار پەیدا بکەن، بەڵکو هاوکاری کارمەندەکانیان دەکەن کە لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانیاندا سەرکەوتوو بن.

بۆ نموونە ئێمە لە کۆمپانیای (باوکی زەنگین) نایەین بە خەڵک بڵێین کە ئەم ئیشە بکە و ئەم ئیشە مەکە. ئێمە پەروەردەی داراییان فێردەکەین، دواتر کەسەکە بەو پەروەردەیە ئازادە چکارێک دەکات.

دیارە کە مرۆڤ هەمیشە بە جێبەجێکردن و کردار فێردەبێت. بۆیە من و ڕۆبێرت هاتین بۆردێکمان درووست کرد بەناوی (cashflow). بۆ ئەوەی بەشداربوان یاری بکەن و لەڕێگەی یارییەوە فێربن کە چۆن پارە خەرج دەکەن و چۆن ئیشی پێوەدەکەن. مەبەستمان ئەوە بوو کە وا بکەین خەڵکی بە کردار کارەکە بکەن، چونکە مرۆڤ لە کردارەکانیەوە فێردەبێت.

ئەمەی لە خوارەوە دەیبینن پێی دەڵێن سێگۆشەی فێربوون. ئەم هێڵکاریە لە ئەنجامی توێژینەوەیەکەوە دۆزراوەتەوە کە (دەیل) کردوویەتی ساڵی ١٩٦٩. بەشی سەرەوەی سێگۆشەکە کاریگەرترین ڕێگاکانی فێربوون نیشان دەدات و بەشی خوارەوەی سێگۆشەکە ئەو ڕێگایانە نیشان دەدات کە کەمترین کاریگەریان هەیە. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە سیستەمی خوێندنی ئێمە ڕێک و ڕەوان ئەو ڕێگایانەی هەڵبژاردووە بۆ وانەووتنەوە کە کەمترین کاریگەریان هەیە لەسەر فێربوون. وەک لە وێنەکەدا دیارە، کاریگەرترین رێگە ئەوەیە کە بە کردار کارەکە ئەنجام بدەیت. هەر لەبەر ئەوەش بوو ئێمە ئەو یاریەمان درووست کرد.

ترەیسی: ئێ با ئەمشەو ئەو یاریە بکەین.

لێسلی: بەو یاریە کۆتایی بە پرۆگرامە دووڕۆژیەکەمان دەهێنین.

کیم: جگە لەو یاریە و کتێبی باوکی زەنگین و باوکی هەژار، چەندین ڕێگەی تر هەیە لە کۆمپانیاکەمان وەک کتێب و سی دی و سیمینار و چەندین ریگەی جیاواز. وە بیرتان بێت باشترین ڕێگەی فێربوون ژیانە. بۆیە دامەنیشە چەندین ساڵ هەر بە فێربوونەوە بەسەرببەیت. نا، وەرە ماوەیەک خۆت فێربکە و پاشان دەستبەکار بە و لە ژیانەوە فێربە.

**کلیلی دووەم:**

کلیلی دووەم کە چارەسەری بەشێکی باشی ترسەکەت بۆ دەکات ئەمەیە:

'سەرەتا بە بڕێکی کەم دەستپێبکە'

سەرەتا دەست دەکەیت بە هەر کارێک، بە بڕێکی کەم دەستپێبکە و پارەیەکی کەم بخە ناو ئیشەکە و چاوەڕوانی ئەوە بە کە هەڵە دەکەیت. چونکە بە دڵنیایەوە هەڵە دەکەیت. هەر خانمێک پێم بڵێت کە ناوێرێت ئیشێک بکات چونکە دەترسێت هەڵە بکات، منیش ڕاستەوخۆ پێیان دەڵێم: پێویست ناکات لە هەڵە بترسیت، چونکە بە دڵنیایەوە هەڵە دەکەیت. من گرەنتیت دەکەم کە هەڵە دەکەیت. ئەگەر ئەمە بزانن، ئەوسا کەمتر دەترسن.

خۆم هەرگیز یەکەم هەڵەی خۆمم بیرناچێتەوە کە خانوویەکی کرێم کڕی. دوای ئەوەی کە کرێچیەکەم شەش مانگ تیایدا بوو، ڕۆژێک ووتی دەڕۆم. منیش زۆرم پێ خۆش بوو چونکە ووتم هەرکەسێکی تر هاتە ناوی، بە ٢٥ دۆلار گرانتر دەیدەمێ.

من نەمزانی نرخی خانووەکانی چوواردەورم چۆنە، بۆیە سێ دانە مانگ تێپەڕی و کەس هەواڵی نەپرسی و هەر بە چۆڵی مایەوە. دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەو کرێیەی من داوای دەکەم زۆر زۆرە. لە جیاتی ئەوەی قازانج بکەم، سێ مانگ خانوەکەم بەتاڵ بوو و پارەی سێ مانگم لە کیس چوو. ئەوە وانەیەکی باش بوو.

بۆیە هەرکاتێک کارێک دەکەیت بە کەم دەستپێبکە. ئەگەر موڵک دەکڕیت، ئەگەر ئاڵ و گۆڕی دراو و پشکسازی دەکەیت، پەلە مەکە و بە کەم دەستپێبکە و وردە وردە کارەکەت گەورە بکە. وەک مەلەوانیەکە، سەرەتا نووکی پەنجەت بخە ناو ئاوەکەوە و پاشان وردە وردە. بەو شیوەیە کلیلی قاسەکەت دەستدەکەوێت.

خەڵکێکی زۆر گیرۆدەی ئەوە بوون کە دەیانەوێت ئیشێکی باش بدۆزنەوە و پارەیەکی زۆری تێ بکەن. دەیانەوێت ئیشێک بدۆزنەوە کە بە زووترین کات زەنگینیان دەکات. ئەمە پەکت دەخات، چونکە کەس نازانێت باشترین ئیش چییە، دەبێت هەتا هەتایە هەر بگەڕێیت بۆخۆت. بەڵام ئەگەر بە کەم دەستپێبکەیت، دەتوانیت لە چەند بوارێکی جیاوازدا کار بکەیت و پاشان باشترینیان هەڵبژێریت لەناویاندا.

**کلیلی سێهەم:**

هەندێک پارە لابدە

سێ هۆکار هەیە کە وای کردووە ئەم کلیلە زۆر گرنگ بێت:

هۆکاری یەکەم ڕوونە، ئەویش ئەوەیە کە هەتا کەمێک پارەت پێ نەبێت ناتوانیت بێیتە ناو دنیای وەبەرهێنانەوە. تا ئێرە ئەم قسەیە تیۆریە و کرداری تیا نییە. کاتێک کردار دەکەیت، کەواتە تۆ هاتوویتە ناو یاریەکەوە. وە من پێی دەڵێم یاری چونکە هەندێک کات دەیبەیتەوە و هەندێک کات دەیدۆڕێنیت. بەهەرحاڵ، ئێناسەی کەسی وەبەرهێن ئەوەیە کە پارەی خستبێتە وەبەرهێنانێکەوە ئیتر هەر کارێک بێت. خۆ ئەگەر هیچ پارەیەکت نەخستبێتە ناو یاریەکەوە، کەواتە تۆ وەبەرهێن نیت.

لێرەوە دەڕۆین بۆ هۆکاری دووەم: پارەیەکی کەم بە واتای ترسێکی کەم دێت و پارەیەکی زۆر بە واتای ترسێکی زۆر دێت. من بۆ هەر کارێکی نوێ کە دەستپێدەکەم، دەزانم کە هەڵە دەکەم و وە لە دنیای وەبەرهێناندا باجی هەڵە بە پارە دەدرێت. بۆیە ئەگەر پارەیەکی کەمی تێ بکەم، باجی هەڵەکە کەمترە.

هۆکاری سێهەم سەرنجراکێشە. هەرگیز دیقەتی ئەوەت داوە کاتێک پارەیەک دەخەیتە ئیشیکەوە، وورده وورده زۆر حەزت بۆ ئەو ئیشە درووست دەبێت. هاوڕێیەکم ئۆتۆمبێلێکی کڕی، دوای هەفتەیەک بوو بە فیتەر ئەوەندە تیایدا شارەزا بوو، بۆ؟ چونکە پارەی دابوو بە سەیارەکەیی و خەمیپارەکەی بوو و حەزی لە سەیارەکەی بوو. لە کاتێکدا پێشتر هیچ سەرەوەدەری لێ نەدەکرد.

جارێکی تر منداڵی هاوڕێیەکم پەیوەندی پێوە کردم و ووتیان کە دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات. ووتی: سڵاو کیم! هەندێک زیووم کڕیوە و دەمەوێت کە نرخەکەی بەرز بووەوە بیفرۆشمەوە. دوای ماوەیەک نرخەکان بەرز بووەو و مامۆستاکەی بانگی کردبوو لە خوێندنگە و داوای لێ کردبوو کە چیرۆکی خۆی بۆ خوێندکارەکان باس بکات و پێیان بڵێت کە چۆن قازانجی کردووە.

ئەم کوڕە هێندە خولیای کڕینی زیو بوو، دەقە بە دەقە ئاگای لە نرخەکان بوو و لەمەوە هەندێک شتی دیکەی کڕیبوو. هێندە قازانج و زیانی خۆی لێکدابووەوە توانای بیرکاری باشتر بووبوو. ئەو کوڕە ئەم شتانە لە خوێندنگە فێرنەبوو، بەڵکو لە ئەزموونکردنی بابەتەکە فێربوو. جا ئەمەم بۆیە بۆ باس کردن بۆ ئەوەی تێبگەن کە دەبێت بە کردار فێر ببن، بەڵام ئاگادار بن پارەیەکی کەمی تێ بکەن.

**کلیلی چوارەم:**

قسەیەک هەیە دەڵێت هەمیشە گیای ئەودیوی پەرژینەکەی خۆت بە سەوزتر دێتەبەرچاو. مەبەستی ئەم قسەیە لەوەیە کە مرۆڤ هەمیشە پێی وایە گڵی دوور دەرمانە و ئەوەی نزیکی خۆی باش نییە و تا دوورتر بڕوات باشترە. بەڵام من دەڵێم:

هەمیشە لە دەوری ماڵی خۆت بسوڕێوە.

مەبەستم لەم قسەیە ئەوەیە کە بڵێم گرنگ نییە ئەگەر کەسێکی سەرەتایت یان لەمێژە خەریکیت. هەمیشە گرنگی بەو توانایانە بدە کە هەتە و شارەزایت تیایدا. کێشەکە لەوەدایە کە خەڵکێکی زۆر گرنگی بە زانیاریەکانی خۆی نادات و دوای قەرەباڵغی دەکەوێت. هەر ئەوەندە ووترا کە پشکی کۆمپانیاکانی بواری تەکنەلۆجیا باشن، ئیتر ئەو خەڵکە بە جارێک پارەی هەڵگرت و کەوتە پشک کڕین. لە کاتێکدا بۆمان دەرکەوت کە وا نەبوو و زۆربەی خەڵک پارەکانیان فەوتا.

پیتەر لینک، نووسەری Learn to Earn زۆر جوان باسی پشک دەکات و دەڵێت:

" هەرجارێک دەڕۆیت و شتێک دەکڕیت، بۆ نموونە چاویلکەیەک دەکڕیت، یان لەفەیەک، یان هەرشتێکی تر، سەیرێکی چواردەوورت بکەیت دەزانیت چی باش دەفرۆشرێت و چی نافرۆشرێت. هەر بە چوواردەورتا بڕوانە دەزانیت کە چی مارکەیەک باشە هەتا پشکەکەی بکڕیت.

خەڵک هەیە دکتۆرە و دەزانێت چی دەرمانێک باشە. خەڵک هەیە لە بانکە و دەزانێت چی بانکێک باشە. کەسی وا هەیە لە مۆڵێکدا کاردەکات و دەزانێت چی مارکەیەک باشە، کەچی سەیرەکە لەوەدایە کەسیان ئامادە نین پشکی ئەو کۆمپانیا و مارکانە بکڕن."

دەرفەتەکانی زەنگین بوون نەک هەر نزیکن لە ماڵی خۆتانەوە، بەڵکو هەر ڕێک لەبەردەمتان. جارێک دەڕۆیشتم بۆ سەنگافورا. ئافرەتێکم بینی بەنیاز بوو لە (ئۆرلاندۆ) پارچە زەویەک بکڕێت لە ئەمریکا. ووتم تا ئێستا چوویت بۆ ئۆرلاندۆ؟ ووتی نەخێر، بەنیازم لە ئینتەرنێتەوە بیکڕم. ووتم شتی وا نەکەیت. یەکەم دەبێت سەرەتا

کۆرسێک وەربگریت دەربارەی کڕین و فرۆشتنی موڵک، دووەم هیچ کاتێک موڵکێک نەکڕیت کە نەتبینیوە.

من کێشەکەم لە هەڵە کردندا نیە، هەمووکەس هەڵە دەکات، بەڵام نابێت گەمژە بیت. هەندێک کەس هەیە بە دەستی خۆیان چاڵ بۆخۆیان هەڵدەکەنن. بۆ دەڕۆیت زەوی لە ئەمریکا دەکڕیت لەکاتێکدا لەبەردەم خۆتدا دەرفەت هەیە!

**سێ هۆکار هەیە کە دەبێت چاوت لەبەردەمی خۆت بێت و دوور نەڕۆیت:**

یەکەم: کاتێک باسی موڵک کڕین دەکرێت، هەمیشە من دەوروبەری خۆم هەڵدەبژێرم، چونکە هەر گۆڕانکاریەک لە دەوری خۆم بکرێت دەیزانم و ئاگادارم. کەی نرخ بەرز دەبێتەوە کەی دادەبەزێت، پلانی حکومەت چییە بۆ ئەو ناوە؟ ئایا کەس نیازی هەیە بازاڕوو و دووکان لەو ناوە بکاتەوە؟ ئەگەر نزیک بم، ئەمانە هەمووی دەبیستم.

دووەم: ئەگەر کێشەیەک ڕوبدات، پێویست ناکات پارە و کاتی دنیا سەرف بکەیت بە هات و چۆوە. بەڵکو هەر لەبەردەستی خۆتدایە.

سێیەم: ئەگەر پێم وابێت دەرفەتەکان لە دەرەوەن، دەبێت هەتا هەتایە چاووم لەسەر دەرەوە بێت، لەجیاتی ئەوە وەرە چاوێک بە دەوروبەری خۆتدا بخشێنە، سەرت سووڕدەمێنێت ئەوەندە دەرفەت هەیە.

**گەورەترین هەڵەم لە وەبەرهێناندا:**

ئەزانی بۆچی ئەوەندە لەسەر ئەم بابەتە دەدوێم؟ چونکە گەورەترین هەڵەی ژیانم تا ئێستا ئەوە بووە کە ئامۆژگاریەکانی خۆم پشتگوێ خستووە. جارێک من و ڕۆبێرت لە فلۆریدا دەڕۆیشتین. شوێنێکمان بینی کەبەلای منەوە زۆر باش بوو بۆ ئەوەی بیکڕین. بەڵام کێشەکە ئەوە بوو هیچ شارەزای فلۆریدا و یاساو ڕیساکانی نەبووم. بەڵام کێشەی لەوە گەورەتر ئەوە بوو کە من بریکارێکم هێنابوو مامەڵەم بۆ بکەت کە خەڵکی فلۆریدا نەبوو و خەڵکی ئەریزۆنا بوو. جا ئەوەی بەزمەکەی قووڵ کردبووەوە ئەوە بوو کە بریکارەکەی کابرای فرۆشیاریش کەسێک بوو کە چارەی بریکارەکەی منی نەدەویست و بە پێچەوانەشەوە. ئیتر لەو نێوەندەدا موڵکەکەی من بووبوو بە سووتوی ئاگری نێو ئەم دوو بریکارە. منیش ڕێگەم دابوو کە بریکارەکەم لەجیاتی من قسە بکات و مامەڵەکەم بۆ بەجێ بکات.

سەرتان نەیەشێنم، ئێمە بۆ ماوەی ٥ مانگ سەرقاڵی ئەم بابەتە بووین، بەڵام بریکارەکان نەگەیشتبوونە ئەنجام. ڕۆژێک قۆڵم لێ هەڵماڵی و لەگەڵ ڕۆبێرت ڕۆیشتین بۆ فلۆریدا و لەگەڵ کابرای خاوەن موڵک بە دوو قسە هەمووشتێکمان بڕاندەوە. بۆ ڕۆژی دواتر بریکاری خاوەن موڵکەکە هەندێک نوسراوی گرێبەستەکەی بۆ هێنابووم کە ئیمزای بکەم. کاتێک خوێندمەوە تەماشا دەکەم هەندێک لە خاڵەکانی گۆڕیوە و کابرای خاوەن موڵکیش تازە ڕۆیشتبووە دەرەوەی وڵات.

لە کۆتاییدا دوای چەند مانگێکی تر، نزیک کاتژمێر ١٠ ی شەو بوو پەیوەندیەکەم پێوە کرا و ووتیان کە موڵکەکە فرۆشتراوە. لەو کاتەدا ئاگر لەناوچاوانم دەباری! دوای ئەو هەموو سەرئێشە و

ئەمسەراوسەرە، تازە پێم دەڵێن کە مامەڵەکە هەڵوەشاوەتەوە. پەیوەندیم بە خاوەن موڵکەکەوە کرد و پشتڕاستی کردەوە کە بەڵێ مامەڵەکە هەڵوەشاوەتەوە. کات خەریک بوو دەبووە نیوەشەو، هێندە توڕە بووم وەخت بوو بتەقمەوە لە داخا. دەزانن لەچی توڕە بووم؟ لە خۆم! لە خۆم توڕە بووم کە لەشوێنێک وەبەرهێنانم دەکرد، کە هیچم لێ نەدەزانی. لە خۆم توڕە بووم چونکە باوەڕم بە تواناکانی خۆم نەبوو و بریکارێکم خستە شوێنی خۆم. ئەوە یەکێک بوو لە هەڵە گەورەکانی ژیانم.

ئەو شەوە تا درەنگانێک دەهاتم و دەچووم و پەنجەی پەشیمانیم دەگەزی. دەمووت هەر دەبێت مامەڵەیەکی تر بکەم بۆ ئەوەی شوێنی ئەمە پڕ بکەمەوە. نزیک ٢ ی شەو بوو کە لەسەر کۆمپیوتەرەکەم بابەتێکم بینی، کە تیایدا ٥ مانگ لەمەوپێش ڕیکلام بۆ موڵکێک کرابوو بۆ فرۆشتن. موڵکەکەم زۆر بەدڵ بوو. بەیانی زوو کاتژمێر ٧ پەیوەندیم بە هاوڕێیەکمەوە کرد بۆ ئەوەی بزانم ئەو موڵکە ماوە یان نا؟ ئەویش ووتی ئێستا پەیوەندی پێوەدەکەم و وەڵامت دەدەمەوە. دوای نیوکاتژمێر پەیوەندی پێوە کردمەوە و ووتی کە هێشتا نەفرۆشراوە، بەڵام داوای تەواوی پارەکە دەکات، نەک بە قیست و قەرز و پێشەکی. منیش ووتم: موڵکەکە قابیلی ئەوەیە پێشەکی هەموو پارەکە بدەیت؟ هاوڕێکەم ووتی بەڵێ. منیش ووتم دە کەواتە دەمەوێت!

سەیر و سەمەرەکە ئەوە بوو کە ئەو موڵکە ڕێک وەک موڵکەکەی فلۆریدا وابوو. بەڵام لەبەرئەوەی خۆم شارەزای ناوچەکە بووم، لە ماوەیەکی کەمدا موڵکەکەم کڕی. وە لە میانەی مامەڵەکەدا بریکارێکی زۆر باشم ناسی کە دووبارە متمانەی بۆ گەڕاندمەوە بە بریکارەکان. وە دواجار ئەو موڵکە بوو بە یەکێک لە

باشترین موڵکەکانم. واتە ئەو هەڵە گەورەیەی ژیانم بوو بە مایەی قازانجێکی زۆر و تەواوی کات و پارەکەی بۆ قەرەبوو کردمەوە.

جا ئەزانن لە هەمووی سەیرتر چی بوو؟ ئەو موڵکە ڕێک دوو کۆڵان تەنیشت ماڵی خۆمان بوو. بۆیە دەڵێم هەرگیز دوورمەکەورەوە، چونکە دەرفەتەکان لە چواردەورەتن.

# بەشی بیست و یەک
## "پێنج کلیلی دیکە بۆ سەرکەوتن"

"سەربەخۆیی گەورەترین خۆشی ژیانە. سەرچاوەی هەموو ڕاستیەکانە"
- ماری وۆڵستۆنکرافت -

ترەیسی: باسی خاڵیکی زۆر گرنگت کرد ئەویش باوەڕبەخۆبوونە.
پات: پێم وابێت باوەڕبەخۆبوون گەورەترین کێشەی خانمانە. ئێمە باوەڕبەخۆبوونمان کەمە، چونکە زۆرینەمان بۆ ئەم کارە نوێین و باوەڕمان بە تواناکانی خۆمان نییە. کیم! پێم بڵێ چ وانەیەکت لەو هەڵەیەوە وەرگرت؟
کیم: دەتوانم بڵێم ئەو شەوە هیچ ترس و قەلەقی و دڵە ڕاوکێیەکم نەما. هەرچی هەبوو ئەو شەوە لەناوچوو. پێم وابێت هەموو ئەو ترس و دڵەتەپەیەی کە هەمبوو هەمووی خۆم بۆ خۆمم درووست کردبوو و هیچی پەیوەندی بە ئیشەکەوە نەبوو. لێرەوە توانیم ترس و ئیش لەیەک جیا بکەمەوە و نەهێڵم ترسەکانم خۆیان هەڵبقورتێنن لە ئیشەکانم. ئێستا کاتێک ئیشێک هەڵدەسەنگێنم، زیاتر خەیاڵم لای باش و خراپی ئیشەکەیە، نەک ترس و دڵەڕاوکێی خۆم.
ترەیسی: ئەو قسانە زۆر گرنگن بۆ من. زۆر بەرچاووم ڕۆشن دەکەنەوە. هیچی تر فێربوویت؟
کیم: پێنج کلیلی تر هەیە کە پێم وایە سوودی لێ وەردەگرن ئەگەر گوێم بۆ ڕادێرن.
ترەیسی ووتی: دەی قوربانی، پێمان بڵێ!

کلیلی پێنجەم

**ئەو کلیلانەی دیکە، دەتبەن بەرەو ئەمە:.**

**خۆت بۆ بردنەوە ئامادە بکە.**

هەمووومان عەزمان لە بردنەوەیە ئەوە گوومانی تیا نییە. وە هەمووومان ئەم یاریە بۆ بردنەوە دەکەین. ئەگەر لەم یاریەدا تازەیت و سەرەتایت، ئەوە شتێکی زۆر باش دەبێت ئەگەر لە یەکەم یاریدا براوە بیت. جا بە ڕەچاوکردنی ئەو چوار کلیلەی سەرەتا (پەروەردەکردنی مێشکت، بە کەم دەستپێکردن، لادانی هەندێک پارە و دوورنەکەوتنەوە) چانسی سەرکەوتنت و بردنەوەت بۆ یەکەم یاری زۆر زیاتر دەبێت.

ئەزانی بۆچی گرنگە لە یەکەم یاریدا براوە بیت؟

یەکەم: ئەگەر لە یەکەم کارتدا سەرکەوتوو بیت، هێزی باوەڕبەخۆبوونت زیاتردەکات. بەڵام ئەگەر شکست بهێنیت، گومان دزە دەکاتە ناختەوە و ساردت دەکاتەوە. زوو زو بەخۆت دەڵێیت: بەخوا ئەم ئیشە بۆ من نابێت! با چیتر پارەکانم بەفیرۆ نەڕۆن و دانیشم بە دەردی خۆمەوە. خۆم دەزانم کە من و ئەمەیان نەوتووە. بەڵام ئەگەر لە یەکەم کارتدا سەرکەوتوو بیت، بە گڕوتینێکی ترەوە دەڕۆیت بەرەو کاری دواترت.

خەڵک دەیەوێت لە یەکەم کاریدا سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بەدەست بهێنێت، بۆیە دەچێت پاروویەکی زۆر گەورە دەکات و ناچێت لە کەمەوە دەست پێبکات. نازانێت کە ئیشی گەورە پێویستی بەوەیە بەردەوام چاووت لەسەری بێت و ئەزموونێکی باشت هەبێت تیایدا. بۆیە ئەم کە نوێیە، پێی ناوێرێت و زیانێکی زۆر دەکات و دواتر دەڵێت: خۆم هەر ووتم ئەم ئیشە باش نییە.

جگە لەوە، ئەو سەرکەوتنەت باوەڕبەخۆبوونت بۆ زیاد دەکات و وا دەکات لە ئیشەکانی تردا زیات باوەڕت بە بڕیارەکانی خۆت هەبێت. وە هەتا زیاتر باوەڕت بە خۆت هەبێت، کەمتر دەکەویتە ژێر کاریگەری ترسەوە.

لە ساڵی ١٩٩٥، لێکۆڵینەوەیەک کە لەلایەن (دامەزراوەی وەبەرهێنانی نەتەوەیی)ەوە کرابوو، ڕایگەیاند کە لە ١٥ ساڵی ڕابردوودا، نۆ ساڵ کۆمپانیاکانی تایبەت بە خانمان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. وە لە لایەکی ترەوە، ئەم ئامارەی خوارەوە لەلایەن بەڕێوەبەری وەبەرهێنان (مێریل لینک)ەوە ئاشکرا کراوە. تیایدا جیاوازی نێوان خانمان و پیاوان دەردەخات بۆ وەبەرهێنان:

| | خانمان | پیاوان |
|---|---|---|
| مانەوە لە کارێکدا کە شکستی تێدا هێناوە | ٣٥٪ | ٤٧٪ |
| نەفرۆشتنی کاڵایەک لە کاتی خۆیدا | ٢٨٪ | ٤٣٪ |
| کردنی کارێک بێ ئەوەی بەدواداچوونی بۆ بکەن | ١٣٪ | ٢٣٪ |
| دووبارەکردنەوەی هەمان هەڵە | ٤٧٪ | ٦٣٪ |

**پیاوان یان خانمان:**

هەزاران نووسراو و قسە هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایا پیاوان باشترن بۆ بزنس، یان خانمان. من گوێ لە هیچیان ناگرم چونکە پێم وایە ئەمە هەمووی پەیوەندی بە ڕەگەزەوە نییە بە تەنها. بەڵکو پەیوەندی بە توانای تاکەکەوە هەیە. چۆن هونەرمەندی سەرکەوتوو و هونەرمەندی خراپ هەیە، چۆن شێفی بەتوانا و شێفی بێ توانا هەیە. بە هەمان شێوە بەزرگانی زیرەکمان هەیە و

بازرگانیش هەیە هیچی لێ نازانێ. بۆیە بابەتەکە پەیوەندی بە لێهاتوویی و ئەزموونی کەسەکەوە هەیە.

بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا، چەند هۆکارێک هەیە لەناو ئێمەی خانماندا کە وامان لێ دەکات زۆربەی دۆخەکان بە قازانجی خۆمان بشکێنینەوە و هەلەکان بقۆزینەوە و سوودی لێ وەربگرین بۆ دنیای وەبەرهێنان. ئەمانە لە سرووشتی ئێمەدا هەیە، بەڵام کاری ئێمەیە کە وایان لێ بکەین بۆ سوودی خۆمان بەکاری بهێنین.

دووەم: بە دووری مەزانە کە لەچواردەورت چەندین کەس هەیە کە ساردت دەکەنەوە و دەڵێن ئەمە بۆ تۆ نابێت و پڕمەترسییە. ئەمانە هیوایەتیان ئەوەیە چیرۆکی ئەو کەسانەت بۆ باس بکەن کە دەستیان کردووە بە کاری خۆیان و شکستیان هێناوە. ئەمانە لەو کەسانەن کە تەنها خۆیان بە ڕاست دەزانن و ئەگەر خوانەخواستە شکستێکت بۆ هاتەپێش، یەکسەر پێت دەڵێن " پیمان نەووتی؟" دڵنیام ئێستا چەندین کەس لە مێشکتدایە کە لەو جۆرەن چاوەڕوانن شکست بهێنیت و یەکسەر تەلەفۆنت بۆ بکەن بڵێن: دە برۆ دەی! پێم نەووتی کچێ ئەم کارە مەکە؟ بە قسەت نەکردم! دەبخۆ دەردت بێ!.

ئینجا باش بزانە کە تۆ بەم شکستەت دڵی ئەوان خۆش دەکەیت. کەواتە با چیتر دڵی کەس خۆش نەکەین و دڵی خۆمان خۆش بکەین. بۆیان بسەلمێنە کە هەڵە بوون. سەرکەوتنت، باشترین تۆڵەیە.

سێیەم: تۆ نیازی پارەپەیداکردنت هەیە. یاریەکە ئاوایە. بەڵام دڵنیات دەکەمەوە کاتێک یەکەم قازانجی دەکەیت، خۆشیەکی سەرسووڕهێنەر ڕووت تێدەکات. بیرتدەخەمەوە کە ئەمە یارییە، لە

یاریدا هەم بردنەوە هەیە هەم دۆڕان. وە لەبیری نەکەیت کە یاری بۆ خۆشییە و پارەپەیداکردنیش خۆشیەکی لەرادەبەدەری تێدایە.

وەبەرهێنانی پڕمەترسی

لە خاڵی دووەمدا باسی ترسم بۆ کردن. زۆربەی خەڵک پێی وایە وەبەرهێنان کارێکی پڕمەترسییە. من لەگەڵ ئەو قسەیەدا نیم. زۆربەی ئەو کارانەی من دەیکەم کەمترین مەترسیان تێدایە. ئەوانەی کە پێیان وایە ئیشی خۆت پڕمەترسییە، تا ئێستا ئیشی خۆیان نەبووە. یان هەیانبووە، بەڵام بەبێ بوونی هیچ ئەزموون و زانیاریەک دەستیانپێکردووە. بۆ نموونە ئەو خانمەی کە دەیویست لە سەنگافورەوە پارچە زەویەک بکڕێت لە فلۆریدا، ئەمە پڕ مەترسی بوو. ئەمە لە مەترسی زۆر خراپترە، گەمژانەیە. هیچ زانیاریەکت لەسەر موڵک نەبێت، هیچ لە بازاڕی فلۆریدا نەزانیت، هیچ ئەزموونێکت نییە، هەزاران کیلۆمەتر لە موڵکەکەتەوە دووریت، ئێ ئەمە قوڕ بۆخۆی دەگریتەوە. خۆ ئەگەر بڕۆیشتایە و ئەو مەڵکەی بکڕیایە و زەرەری بکردایە، دەبوو بە یەکێک لەو کەسانەی کە دەیووت کڕین و فرۆشتنی موڵک پڕمەترسییە و زەرەری لێ دەکەیت.

ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە کە وەبەرهێنان پڕمەترسی نییە، وەبەرهێنەرەکە پڕمەترسییە. کاتێک وەبەرهێن دەیەوێت بێ هیچ زانیاریەک و خۆ ڕۆشنبیرکردنێک زەنگین بێت، ئەوە مەترسی درووست دەکات.

یان کەسێک پێت دەڵێت کە نرخی فلان شت بەرز دەبێتەوە و تۆش هیچی لێ نازانیت و دوای قەرەباڵغی دەکەویت. ئەم دواکەوتنی کوێرانەیە پڕمەترسییە. یان بەدیار تەلەفزیۆنێکەوە دانیشتوویت و تەلەفزیۆنەکە هەرچی ووت تۆ ئەشەوبیلای بۆ

بکەیت و لەسەر قسەی ئەوان بڕۆی بازرگانی شتێک بکەیت، ئەمەش پڕمەترسییە، چونکە بەبێ هیچ زانیاریەک دوای قسەی خەڵک کەوتوویت.

بۆیە بەنیازی هەر کارێکیت، سەرەتا زانیاری لەسەر کۆ بکەرەوە. لە کەمەوە دەست پێبکە. هەندێک پارەی بۆ لادە. دوور مەڕۆ و سەیری چوواردەوری خۆت بکە. خۆت بۆ بردنەوە ئامادە بکە بەتایبەت لە یەکەم کارتدا. باوەڕت بەخۆت هەبێت. دڵنیا بە کە هەڵە دەکەیت، بەڵام هەتا زیاتر هەڵە بکەیت، زیاتر فێردەبیت تا زیاتر فێربیت، کەمتر تووشی مەترسی دەبیتەوە و تا کەمتر تووشی مەترسی ببیتەوە، زووتر دەڕۆیت بەرەو سەرکەوتن. بۆیە هەر لە سەرەتاوە خۆت بۆ بردنەوە ئامادە بکە.

**کلیلی شەشەم**

بزانە کێ لە دەوری خۆت کۆدەکەیتەوە

ئەم کلیلە بۆ خانمان زۆر گرنگە. هەریەک لە ئێمە، چەندین بازنەمان لە دەوری خۆمان درووست کردووە. بۆ نموونە بازنەی خێزانیی، کە پێکهاتووە لە دایک و باوک و برا و خۆشک و کەسە نزیکەکانت. بازنەی ئیش و کار و بازنەی هاوڕێکانت و بازنەی خولیا و حەزەکانت.

کاتێک دەست دەکەیت بە وەبەرهێنان، بازنەیەکی ترت بۆ درووست دەبێت کە پێکهاتووە لەو کەسانەی لە چواردەورتن و هانت دەدەن لە پرۆسەکەدا. کە پێکهاتووە لە هاوڕێکانت و کەسانێک کە پرس و ڕایان پێ دەکەیت (تەکبیرکەر) و گرووپی خانمان.

یەکەم: هاوڕێکانت

هـــاوڕێیەکم هەیە نـــاوی (جەیـــن)ە. چەندســـاڵێک لەمەوپـــێش ئامۆژگـــاریەکی زۆر باشـــی کـــردم. دانیشـــتبووین باســـی خەونێکـــی خۆمم بۆ دەکرد. پێم وابوو هەتا زیاتر بۆ خەڵکی باس بکەم، زیاتر لە مێشکمدا چەسپ دەبێت و زیاتر دەڕوات بەرەوە ڕاستیی.

جەین ووتـی: کـارێکی بـاش دەکەیت کە ئامـانجەکەت بـۆ خەڵـک بـاس دەکەیـت، بەڵام ئاگـاداری ئەوە بە کە بـۆ کێـی بـاس دەکەیـت. هەمووکەس پاڵپشتت نییە و دەستخۆشییت لێ ناکات.

بـاوەڕم نەدەکـرد! ئـاخێر مـن خـۆم لەو کەسـانەک کە هەمیشـە پاڵپشـــتی خەڵـــک دەکەم و هانیـــان دەدەم لەســـەرئەوەی کە خەونەکەیان بەدی بهێنن. کەچی ئێستا جەین پێم دەڵێت خەونەکەت بە هەمووکەس مەڵێ!

دواتر خۆم بۆم دەرکەوت کە قسەکەی جەین زۆر ڕاستە و ئەو لەسـەر هەقە. جارێـک لە ئـاهەنگی سـەری سـاڵ لەگەڵ کۆمەڵێـک هاوڕێ کۆبووینەوە و هەرکەسە باسی پلان و خەونی خۆی دەکرد بۆ ساڵی داهاتوو. هاوڕێیەکمان ووتی: پلانم وایە بۆ سـاڵی داهـاتوو زیاتر ئاگام لە تەندرووستی خۆم بێت و لەش و لارم جـوانتر بکەم و لەگەڵ ڕاهێنەرێکی بەتوانـا پەیوەنـدی بگرم و ئەم کێشـە زیـادەی کە هەمە لای بـبەم. تەواو بـــاوەڕم بە خـــۆم هەیە و دەزانـــم کە دەتوانم ئەنجامی بدەم.

هەموومان دەستخۆشیمان لێ کرد و چەپڵەمـان بـۆ لێدا. هەر کە ڕووی کـرد بەولادا، یەکێـک لە خانمەکـان چپانـدی بە گوێمـدا و ووتی: بڕوا ناکەم سەرکەوتوو بێت، پێشتر هەوڵی داوە و شکستی هێناوە. توانای ئەوەی نییە خۆی کۆنترۆڵ بکات زۆر نەوسنە.

جەیـن، ڕێـک مەبەسـتی ئەوە بـوو کاتێـک ووتـی خەونەکەت بە هەمـووکەس مەڵێ. تێنـاگەم ئەو خـانمە بـۆچی ئەو قسـەیەی کـرد لەسەر ئەو کەسەی کە بە حساب هاوڕێیەتی. نازانم! لەوانەیە لەبەر حەسوودی بێت، یان لێی وەڕس بووبێت، یان بە ڕکابەری خۆی بزانێت. بەهەرحاڵ، لەبەر هەر هۆکارێک بێت، دڵنیام کە قسـەکەی لە بەرژەوەنـدی هـاوڕێکەی نەبـوو. جـا بـۆیە هەرکاتێـک خەونێکـت هەبـوو، کۆتـا کەس گـوێ لەوانە بگرە کە قسـەی نەرێنـی دەکەن. فەرامۆشـیان بـکە، مێشـکی خۆمـان خـۆی لە خۆیـدا دنیـایەک بەربەست درووست دەکات، ئیتر چ پێویستیەکت بە ئەوانە هەیە؟

هەنـدێک کـات، سـەرکەوتنی تـۆ، یان هەوڵـدانت بـۆ سـەرکەوتن لەوانەیە بەرژەوەنـدی کەسـێک بخـاتە ژێـر مەترسـییەوە و بە شکسـتی خـۆی بزانێـت. ئەوانە هەم خۆیـان نـابنە کەسـێکی سـەرکەوتوو لە ژیانیانـدا، هەم دەبنە بەربەسـت لەبەردەم ئەوانەدا کە دەیانەوێت سـەرکەوتوو بن. جا بەوەی کە تۆ سارد دەکەنەوە، هەست بە ئارامی خۆیان دەکەن. چونکە کاتێک تۆ سـەردەکەویت، خەڵکی شکستی ئەویان بۆ دەردەکەوێت و ئەویش پێی ناخۆشە لەبەرچاوی خەڵکدا ئەم بە شکستخواردوو ناوزەند بکرێت.

هاوڕێیەکم ناوی (مارگارێت)ە و چەندین ساڵە لە تەلەفزیۆن کار دەکـات. قسـەیەکی جـوانی کـرد جارێـک. ووتـی: هەمیشـە ئەو بەرنامـانەی کە باسـی کێشـەی خەڵکـانی تـر دەکـات، زۆرتـرین بینەریان هەیە. دەزانی بۆ؟! لەبەرئەوەی خەڵک پێی خۆشە کێشەی کەسانی دیکە ببینێت، چونکە کاتێک کەسانی دیکە دەبینن کە نوقمی کێشـە بـوون، هەسـت بە ئـارامی دەروون دەکەن و دەڵـێن ئەهـا شکور لە ئێمەش خراپتر هەیە. ئیتر گلەیی لە خراپی خۆیان ناکەن.

وایان لێ دەکات کە بە داماویەکەی خۆیان ئاسوودە بن، چونکە دەڵێن لە ئێمە داماوتریش هەیە.

بە ئاشکرا هەست بەوە دەکەیت کاتێک کەسانێک بە گەرمی پیرۆزبایی سەرکەوتنت لێ دەکەن و کەسانێکیش بە ساردی دەڵێن "پیرۆزە" بە ئاشکرا هەست بەو ڕۆحیەتە دەکەیت کە لە یەکێکیاندا هەیە و لەوەی تردا نییە.

من دانی پیا دەنێم کە هەستی ڕکابەریم تێدایە. کاتێک هەواڵی سەرکەوتنی کەسانی دیکە دەبیستم، بە خۆم دەڵێم کە دەبێت منیش سەرکەوتوو بم. من ئەو سەرکوتنەی ئەوان دەکەمە دەرفەتێک کە منیش سەرکەوتوو بم و هانی خۆم دەدەم. بەڵام هەرگیز نابمە ڕێگر لەبەردەمیاندا.

کەواتە کورتەی قسەکە لێرەدا ئەوەیە کە تۆ چواردەورت بکەیت بەو کەسانەی کە بە ڕاستی هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازن. من چەندین ساڵ لەمەوپێش ئەو بڕیارەم داوە کە دەبێت تەنها لەگەڵ ئەوانەدا کار بکەم کە ئاوات بە سەرکەوتنم دەخوازن. جا لەبەر ئەمەیە کە پێت دەڵێم خەونەکەت تەنها بۆ ئەوانە باس بکە کە وەک تۆ بیردەکەنەوە و هەوڵی سەرکەوتن دەدەن. ئەمەش لەوانەیە وا بکات کە واز لە هەندێک هاوڕێت بهێنیت و کەسی تازە بناسیت.

دووەم: تەکبیر کەرێک بدۆزەرەوە. (ئامۆژگاریکار).

ئامۆژگاریکار کەسێکە کە ئەو ئیشەی کردووە کە تۆ بەنیازی بیکەیت و سەرکەوتوو بووە تیایدا. بۆ هەر بوارێکی ژیانت، ئامۆژگاریکارێکی جیاوازت دەوێت. لایەنی بزنس، لایەنی سەرکەوتنی ژیان، لایەنی وەرزش و هەموو لایەنەکانی دیکە.

(کین) هەم هاوڕێمە، هەم ئامۆژگاریکار، هەم هاوبەشی بزنسمە. کین خاوەنی گەورەترین کۆمپانیای وەبەرهێنانی خانووبەرەیە.

هەرکاتێک دەیبینم، بە کۆڵی زانیاری نوێوە دەگەڕێمەوە ماڵەوە. لێرەدا ئێوەش مافی خۆتانە پرسیارێک بکەن، ئەویش ئەوەیە کە چۆن و بەچی ڕێگەیەک ئامۆژگاریکارێک بدۆزنەوە؟ لە ڕاستیا نازانم! هەموو ئەو کەسانەی کە من ئامۆژگاریان لێ وەردەگرم، بە سوتفە ناسیومن. قسەیەک هەیە دەڵێت: هەرکات خوێندکارەکە ئامادە بوو، مامۆستاکە خۆی دەردەکەوێت. من ئەمەم بەلاوە ڕاستە. هەرکات تۆ ئامادەی فێربوون بوویت، مامۆستاکەت لە سووچێکدا چاوەڕوانتە.

سێهەم:

من پێم وایە خانمان زۆر باش لەیەکتر تێدەگەن. بۆیە کارێکی باشە ئەگەر خانمان پێکەوە لە جێگەیەکدا کۆ ببنەوە و ئاڵ و گۆڕی بۆچوونەکانیان بکەن. دووبارەی دەکەمەوە، من باسی ئەو گرووپانە دەکەم کە پەروەردەیین و پێکەوە بۆچوون دەگۆڕنەوە. نەک ئەوانەی پارە تێکەڵ دەکەن و پێکەوە کار دەکەن. چونکە هەڵبژاردنی هاوبەش هەروا ئاسان نییە. دەبێت زۆر بە زیرەکانە بکرێت.

دەبێت ئەم گرووپانە کەسانی زۆر شارەزا و شیاوی تێدا بێت. کەسانێک نا کە بۆ کاتبەسەربردن هاتوون، بەڵکو کەسانێک کە خەمی داهاتووی خۆیانە و هاتوون خۆیان بنیادبنێن. کەسانێک کە وەک یەکتر بیردەکەنەوە و مێشک کراوەن و بیرۆکەی باشی وەبەرهێنانیان لایە. من پێم باشە کە ئەو کەسانە زۆر باش گرووپەکان بەڕێوە ببەن. کاتی دەستپێکردن و کاتی کۆتایی دیاری بکەن و بزانن باسی چی دەکەن. سەرکەوتووترین گرووپەکان ئەوانەن کە یاسا و ڕێسای تێدایە و هەر لە سەرەتاوە بە بەشداربوان دەڵێن.

یان دەتوانن زوو زوو کەسێکی شارەزا و قسەزان بانگ بکەن قسەتان بۆ بکات. ئامانجەکە ئەوەیە کەسانی چواردەورت بکەیت بەو کەسانەی کە ئەرێنین و لە هەموو بار و دۆخێکدا پاڵپشتت دەکەن و لە کاتی هەڵەدا دەستت دەگرن و لە پشتتن.

**کلیلی حەوتەم**

زۆرینەی خەڵک کاتێک دەست دەکەن بە پرۆسەی وەبەرهێنان، وەڵامی کورت و پوختیان دەوێت. ٥٠ وەرەقەم پێیە بیکەمە چی ئیشێکەوە؟ وەڵامی کورت و پوختم پێ بڵێ!

کەسی سەرکەوتوو پێویستە هەمیشە شتێک بهێنێتە مێشکی خۆیەوە، ئەویش ئەوەیە کە:

"وەبەرهێنانی سەرکەوتوو، پرۆسەیەکی لێک نەپچڕاوە"

گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی شتێک نییە لە شەو ڕۆژێکدا ڕووبدات. شتێک بوونی نییە بەناوی زەنگینبوونی خێرا و بەردەوام. بابەتەکە وەک فێربوونی زمان وایە، ناتوانیت بە شەو و ڕۆژێک وەک کەسێکی بیانی قسە بکەیت. سەرەتا ووشە فێردەبیت و پاشان ڕستە و پاشان دوای چەندین ڕاهێنان ئینجا فێردەبیت. ڕاستە چەندەین هەڵەی زەق دەکەیت، بەڵام ئەگەر بەردەوام بیت دەگەیتە ئەنجام.

لای من پرۆسەکە تەواوبوونی نییە و ڕۆژانە شتی نوێ فێردەبیت. وە هەڵە کردن بەشێکە لە پرۆسەکە. تۆ وا دەزانیت من حەزم لە هەڵە کردنە؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر، ئەو کاتانەی هەڵە دەکەیت هەست بە ناخۆشیەکی زۆر دەکەیت. بەڵام دەبێت ئەو هەڵەیە بکەیت بۆ ئەوەی فێربیت. ئەگەر ئەو ئۆفیسە دوو ملیۆن دۆلاریەی من لە مێشکی خۆمدا دامنابوو لە سەرەتای کارکردنمدا

سەری بگرتایە، ئەوسا تووشی دوو حاڵەت دەبووم: یان خۆم بە بلیمەت دەزانی، لە کاتێکدا بە بەخت و شانس زەنگین بووم، یان ئەوەتا دووبارەم دەکردەوە و ئەوسا تووشی زیان دەبووم، چونکە هەر لە سەرەتاوە نەمزانیوە هۆکاری سەرکەوتنەکەم چییە. بەڵام کاتێک بە پرۆسەکەدا تێپەڕ دەبیت و هەنگاو بە هەنگاو گەشە دەکەیت، ئەوسا دەتوانیت هەتاهەتایە ئەزموونەکان دووبارە بکەیتەوە بە سەرکەوتوویی.

ئێلیزابێث تەیلەر دەڵێت: ناتوانیت لە چاوتروکانێکدا ببیتە خاوەنی، بەڵکو پرۆسەیەکە و دەبێت بەدەستی بهێنیت. بەخاوەنبوون نییە، بەدەستهێنانە.

**کلیلی هەشتەم:**

بۆ ئەوەی هەمیشە لە گەشەسەندند بیت، هیچ ڕێگەیەکی تر نییە جگە لە:

بەردەوام لە فێربووندا بە!

ئەمە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنە. چونکە هیچ شتێک وەک خۆی نامێنێت. بازاڕ لە گۆڕانکاریدایە، یاساکان لە گۆڕانکاریدان. جا بۆ ئەوەی تۆش سەرکەوتوو بیت، ئەبێت لەگەڵ بارو دۆخەکەدا تۆش بگۆڕێیت. ئەوەش واتای ئەوەیە کە دەبێت هەمیشە لە فێربووندا بیت. کاتێک گۆڕانکاریەک دێتە پێش، دەتوانیت بە ٣ شێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت:

یان لەگەڵ گۆڕانکاریەکان تۆش دەگۆڕێیت.
یان پێش گۆڕانکاریەکان دەکەویت
یان بەلای گۆڕانکاریەکاندا تێدەپەڕیت

کارین هاوڕێیەکمە، زۆر شارەزا و لێهاتووە لە بوارەکەی خۆیدا. جارێک کۆرسێکی دوو ڕۆژی هەبوو لەسەر ئەو بوارەی ئەو کاری تیا دەکات. ئەویش بەنیاز بوو بڕوات بۆی. هاوڕێیەکی پێی ووت ئەوە تۆش دەڕۆی کارین؟ تۆ بۆ؟ خۆ تۆ زۆر لێهاتوویت و سەرکەوتوویت لە بوارەکەتدا. کارین جوان وەڵامی دایەوە ووتی: هەر ئەمە هۆکاری سەرکەوتنمە، چونکە هیچ هەلێکی فێربوون لەکیس خۆم نادەم.

ئەو هاوڕێیەی کارین، هەمان کاری کارین دەکات. بەڵام ئەوە ٣ ساڵە چەقی بەستووە. چونکە بە ڕێگەی کۆن کار دەکات و بڕیاری داوە هیچی تازە فێرنەبێت.

هاوڕێیەکمان هەیە ناوی (فرانگ)ە. فرانک تەمەنی لە ٨٠ کاندایە. وابزانم فرانک نیازی نییە بمرێت! چوونکە تا ئێستا بەردەوام لە فێربووندایە. هەموو هەفتەیەک فرانک زانیاری نوێم بۆ دەنێرێت لەسەر دنیای وەبەرهێنان و ئیش. ڕۆژێک لە چین سەرقاڵی مامەڵەی ئاڵتوونە و ڕۆژێک لە کەنەدا وانەی هونەری وەردەگرێت. لەم ڕۆژانەدا من و (ڕۆبێرت)ی بانگهێشت کردووە بۆ پێشانگایەکی نوێی تەلارسازی. لە هەمووشتێک سەرەودەر دەکات. جا هەمیشە لە سیمینارەکانی من و ڕۆبێرتدا ئامادە دەبێت. بەو تەمەنەوە، لە تازەترین زانیاریەکانی تەکنەلۆژیا دەزانێت و بەکاری دەهێنێت بۆ باشترکردنی بزنسەکەی. ئەمە هێزی فێربوونە.

پرۆسەی فێربوون هیلاکی دەوێت. ناکرێ بەنیاز بیت لە ئینتەرنێت کورسی فێربوونی ماراسۆن وەرگریت. بەڵکو دەبێت بە کردار بیکەیت. ڕاهێنەرێک دەگریت و سەرەتا ڕاکردنی ماوەکورت دەکەیت. پاشان وورده وورده بەردەوام دەبیت و دەیکەیت بە ڕاکردنی چەندین کیلۆمەتر بەبێ وەستان. جا بۆ ئەمە، تەنها ئیشت

بە ماسولکەی جەستە ناڕوات، بەڵکو دەبێت ماسولکەی مێشک بخەیتە کار. دەبێت ڕاهێنان بە مێشکت بکەیت. کەواتە هەم بۆ ئەوەی تەندرووستی جەستە و مێشکت باش بێت، هەم بۆ ئەوەی باری داراییت باش بێت، هەمیشە لە فێربووندا بە.

**کلیلی نۆیەم:**

ئێستا باسی کلیلی ژمارە نۆ دەکەم بۆتان. ئەمەوێت دڵنیا بمەوە لەوەی کە هەرگیز ئەم خاڵە لەیاد ناکەن. ئەم خاڵە لەوانەیە گەورەترین و گرنگترین خاڵ بێت. بەڵێن دەدەن کە هەرگیز لەیادی نەکەن؟

خانمەکان ووتیان: بەڵێن بێت

کلیلی ژمارە نۆ ئەمەیە:

**چێژ لە پرۆسەکە وەربگرە**

پڕ بە دڵ پێشنیاری ئەوەتان بۆ دەکەم کە چێژ لە پرۆسەکە وەربگرن. هەرکاتێک سەرکەوتن و بردتانەوە، ئاهەنگ بگێڕن و پیرۆزبایی لەیەکتر بکەن. هەرکات بەسەر بەربەستێکدا زاڵ بوون. هەرکات بەسەر ترسێکدا زاڵ بوون. هەرکات گەیشتنە ئەوەی کە خەمی پارەتان نەبێت و باوەڕبەخۆبوونتان زیادی کرد و کۆنترۆڵی ژیانی خۆتان لەدەست خۆتاندا بوو، ئەوا پیرۆزبایی لە خۆت بکە. چونکە سەرکەوتنی دیکە بەڕێگاوەیە و ئەو سەرکەوتنانە پێویستی بە پیرۆزبایی و ئاهەنگ گێڕانە.

گەڕان بەدوای وەبەرهێنانی تردا چێژوەرگرتنە. زیادکردنی داهاتی مانگانەت چێژوەرگرتنە. فێربوونی ڕێگەی تازە و دەستکەوتنی پارەی تازە چێژوەرگرتنە.

له کۆتاییدا

کیم: ئەمە ئەو ٩ کلیله بوون که پێم وایه ئەگەر جێبەجێی بکەن، کەسانی سەرکەوتووتان لێ دەردەچێت. ئێستا پێم بڵێن، هیچ قسەیەکتان هەیە؟
لێسلی: ئەزانی خاڵی کۆتایی بۆ من زۆر گونجاوه؟
به پێکەنینەوه ووتم: ئەیچۆن! ئینجا بیرت بێت بەڵێنت دا.
ترەیسی: ئێستا وێنەکه بۆ من زۆر ڕونه. ئێستا دەزانم که ئەمه پرۆسەیەکه و ئەم پرۆسەیه هەرگیز کۆتایی نایەت و هەمیشه چانسی زیاتر هەیه بۆ فێربوون.
پات: منیش هەموو خاڵەکانم نوسیوه. دەتوانم دوایی بۆتان کۆپی بکەم.

# بەشی بیست و دوو
# پلانەکەم نیشان بدە

خانمان وەک چای ناو کیس وان! بیانخەیتە ناو ئاوی گەرمەوە، بەهێزتر دەبن.
- ئێلینەر ڕۆزڤێت-

هەموومان تا کۆتایی ڕۆژەگە گفت و گۆمان لەسەر ئەوە کرد کە ئامانجمان چییە و پێویستە چی بکەیت بۆ ئەوەی ئامنەجەکە بەدی بهێنین.

لە کۆتایی ڕۆژەکەدا هەموومان فوول ووزە بووین. وەک ئەوە وابوو ڕاهێنانێکی زۆر باشمان کردبێت و جەستەمان سەر ئارەق گەڕابێت. بەڵام هەستمان بە خۆشیەکی زۆر دەکرد چونکە لە کۆتاییدا کارەکان وەک ئەوە ڕۆیشت کە پلانمان بۆ دانابوو.

هەریەکە لە خانمەکان پلانەکەی خۆی نووسیوبوو.

لێسلی دەیووت: خواخوامە زوو بگەمەوەماڵەوە و پلانەکەم جێبەجێ بکەم.

هەرسێکیان ئەوەیان دەویست کە بگەن بە سەربەخۆیی دارایی. بەڵام هەریەکەیان بە ڕێگەیەکی جیاواز. لە کۆتایی ڕۆژەکەدا، هەریەکەیان پوختەیەکی پلانەکەی باس کرد بۆمان. لێسلی حەزی بە ئیش کردن بوو لە بواری موڵک و خانووبەرەدا. ترەیسی چونکە خۆی لە ناو بزنسدا بوو، حەزی لە بزنس و بەڕێوەبردنی پرۆژەکان بوو. بەڵام پات، کاریگەر بوو بە کڕینی پشک.

پات پێی ووتین کە زۆر حەزی لە نووسینی ڕۆمانە. ووتی کە پێشتر ڕۆمانێکی نووسیوە و لە نیوەدا وازی لێ هێناوە. بەڵام ئێستا پێی خۆشە کە دووبارە دەست بکاتەوە بە نووسینی ڕۆمانەکەی.

پات: پێشتر حەزم لە نووسین بوو، بەڵام هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتووە کە کتێب نووسین ببێت بە سەرچاوەیەکی داهات.

(کردار) و (خاوەنداریتی)

لیسلی: ئەرکێکی زۆرمان هەیە بیکەین. نامەوێت کە لێرە ڕۆیشتینە دەرەوە، خەیاڵمان بڕوات بەلای شتی تردا. ئەوەی باشە لە چواردەورم کەسانێک هەیە کە وەک خۆم بیردەکەنەوە. بەڵام پرسیارێک هەر لە مێشکمدایە، ئەویش ئەوەیە کە چۆن وا بکەم ئەم هەموو کارکردنە شەکەتم نەکات؟

کیم: پرسیارێکی جوانە! ئەگەر تەنها خەیاڵت لای ئەو ئیشانە بێت کە دەبێت بیکەیت، ئەوا زۆر هیلاک دەبیت و گرۆتینت نامێنێت. من چەندین ساڵ لەمەوپێش ئەو پرسیارەم کردووە و کەسێک ئاوا بۆی شی کردمەوە:

دەبێت ئاشنا بین بەم ووشانە:

بوون - کردار - خاوەنداریتی

بوون: واتە حاڵەت و دۆخی ئێستات

کردار: واتە ئەو کارانەی کە دەیکەیت

خاوەنداریتی: واتە ئەو شتانەی تۆ دەبیتە خاوەنی.

(بوون) و (کردار) بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن کە تۆ دەبیتە (خاوەن)ی چ شتێک.

بۆ نموونە: ئەگەر بڕیار بدەیت کە منداڵێکت ببێت. پێش هەمووشتێک دەبێت ڕەگەزی مێ بیت (بوون). وە دەبێت دووگیان بیت و سەردانی دکتۆر بکەیت و خواردنی باش بخۆیت و پاشان منداڵت دەبێت (کردار). بەمە، دەبیتە خاوەنی منداڵ (خاوەنداریتی). باشتر وایە کە خەیاڵت لای ئەوە نەبێت کە دەبێت چی بکەیت و

چی نەکەیت، بەڵکو خەیاڵت لای ئامانجەکەت بێت کە تۆ بەنیازی ببیت بە خاوەنی چی. من دەمەوێت ببم بە خاوەنی منداڵ.

زۆر جەخت لەوە دەکەمەوە کە دەبێت خەیاڵتان لای ئامانجەکەتان بێت و چاو بخەنە سەر ئەوەی کە دەبنە خاوەنی چی. چونکە ئەوە زیاتر هانتان دەدات و کاتێک هیلاک بوون، گڕوتینێکتان پێ دەداتەوە.

پرسیم: پات! تۆ بۆ ئەوەی نووسینێکت لە ڕۆژنامەیەک بڵاوبکرێتەوە دەبێت چی بکەیت؟

پات: سەرەتا چەند کۆرسێکی باش وەردەگرم لەسەر ئەوەی کە چۆن ببمە نووسەرێکی باش و پاشان دەگەڕێم بزانم ئەو ڕۆژنامەیە چ جۆرە نووسینێکی بەدڵە، بۆ ئەوەی منیش ئەو جۆرە بابەتە بنووسم. وە دەبێ بزانم کە نووسینەکەم دەدەمە دەست کێ. وە هەرکاتێک ڕەتیان کردمەوە، کۆڵ نادەم و ئەو خاڵانە چاک دەکەم کە بوونەتە مایەی ڕەتکردنەوەم. دواتر بەردەوام دەبم لە هەوڵەکانم هەتا بابەتەکەم قبووڵ دەکرێت. قورسە لە ئێستادا بزانم تەواوی هەنگاوەکان چین. خۆ ئەگەر تەواوی قۆناغەکان و بەربەستەکان بزانم، لەوانەیە دەست پێ نەکەم.

کیم: ڕێک مەبەستم ئەمەیە. خەیاڵت لای ئەوە بێت کە تۆ دەبیتە (خاوەن)ی چی، ئیتر بەشی (کردار) خۆی ڕوودەدات. ئەوەی کە ئێستا ئێوە هەتانە (خاوەندارێتی)، دەرەنجامی بیرکردنەوەی خۆتان (بوون) وە ئەو کارانە بووە کە کردووتانە (کردار). ئەگەر بڕیارە ببن بە خاوەنی شتێکی زیاتر، دەبێت بوون و بیرکردنەوەی خۆتان و کردارەکان و هەوڵەکانتان زیاتر بکەن. چونکە بوون و کردار دەتانگەیەنێت بە خاوەندارێتی. وە ئەوەندەی بزانم، ئێوە دەتانەوێت ئەو دۆخەی ئێستا بگۆڕن، وایە؟

هەموویان ووتیان بەڵێ!

ترەیسی: چۆن بوونی خۆت دەگۆڕیت؟

کیم: هەر وەک نموونەکەی پات. بۆ ئەوەی نووسینەکەت قبوول بکرێت، دەبێت سەرەتا خۆت نووسەرێکی باش بیت. ئێستا پات نووسەرێکی لێهاتوو نییە، چونکە ماوەیەکی زۆرە ڕاهێنانی نەکردووە. ئەگەر پێویست بکات چەند کۆرسێک وەردەگرێت و پەیوەندی لەگەڵ چەند کەسێک دەگرێت کە چاو بە نووسینەکانیدا بخشێننەوە و هەڵەچنی بۆ بکەن. وە دەبێت کە قبووڵی ڕەتکردنەوە بکات و هەڵەکانی چاک بکاتەوە و پاشان هەووڵ بداتەوە و بۆیان بنێرێتەوە. بەم هەنگاوانە، پات (بوون)ی خۆی دەگۆڕێت و دەبێت بە نووسەرێکی لێهاتوو. ڕوونە؟

ترەیسی: کەواتە من بۆ ئەوەی ببمە خاوەنکارێکی لێهاتوو، دەبێت بوونی خۆم بگۆڕم. وە سەرەتا دەبێت ئەوە بخەمە مێشکمەوە، کە دەبمە خاوەنی چی. ئەمە وا دەکات کە بوونم بگۆڕم.

کیم: کێشەکە ئەوەیە کە خەڵک زۆربەیان هەر خەیاڵیان لای ئەوەیە کە دەبێت چی بکەن (کردار)، نەک دەبێت خۆیان چی بن (بوون) وە دەبنە خاوەنی چی (خاوەندارێتی).

پات: جاری وا هەیە دەڵێیت، ئەگەر بمزانیایە کە ئەوەندەی دەوێت، هەرگیز دەستم پێ نەدەکرد.

لێسلی: ئێستا من دەمەوێت ببمە خاوەنی موڵک، ئیتر چیم و چی دەکەم خۆی درووست دەبێت.

**باوەڕت بە خۆت هەبێت**

ترەیسی: دەزانم کات درەنگی کردووە، بەڵام با کۆتا پرسیار بکەم. لە ژیانی خۆمدا هەندێک کات پێویست دەکات بڕیارێکی گەورە بدەم و لەگەڵ خۆمدا دەکەومە مشت و مڕ و پاشان گوێ لە دڵم دەگرم بزانم دڵم داوای چی دەکات. لە دنیای وەبەرهێنانیشدا شتی وا هەیە؟

کیم: با لە ئەزموونی خۆمەوە قسەت بۆ بکەم. یەکەم جار کە ویستم موڵک بکڕم، هەزار مشت و مڕم لە مێشکی خۆمدا کردووە و هەزاران جار بیرم لێ کردووەتەوە. لە کۆتاییدا بە خۆمم ووتی: کیم! پێویست ناکات سەرلەخۆت تێک بدەیت. دڵت دەڵێ چی؟ بیکەم یان نا؟ وەڵامەکەی "بەڵێ" بوو. پاشان کڕیم و ئیشێکی زۆر باش دەرچوو.

بەڵام ئاگادار بە! ئەگەر پێش ئەوە هیچ بەدواداچوونێکم بۆ نەکردایە و هیچ زانیاریەکم لەسەر کۆنەکردایەوە و شوێن قسەی دڵم بکەوتمایە، ئەوسا بڕیارێکی ئاقڵانە نەبوو کە گوێ لە دڵم بگرم. من کاتێک گوێم لە دڵم گرت، کە خۆم هەموو بەدواداچوونێکم کردبوو. جا شتێکی تر! هەتا زیاتر مامەڵە بکەیت، دڵت زیرەکتر دەبێت و باشتر بڕیار دەدات لە قازانجت. جاری وا هەیە لە کاتی مامەڵە کردنا پرسیارێک دەکەم، خۆشم نازانم بۆچی ئەو پرسیارەم کرد. کەچی لە کۆتاییدا دەردەکەوێت ئەو پرسیارە کلیلی سەرکەوتنی مامەڵەکە بوو.

جارێک لە سەرەتای کارکردنمدا پشکی (کۆکاکۆلا)م کڕی و دوای ماوەیەک سەیرم کرد ئەگەر ئێستا بیفرۆشمەوە، قازانجێکی باش دەکات. پەیوەندیم کرد بە کەسێکەوە و ووتم کە دەمەوێت بیفرۆشمەوە. ووتی نا نا نەکەیت! دڵنیام بەم نزیکانە نرخەکان زۆە

بەرزتر دەبنەوە. منیش ووتم: ئێ با بەرز ببنەوە، من قازانجی خۆمم لێ کردووە و دەمەوێت ئێستا بیفرۆشمەوە.

ووتی: من چەندین ساڵە لە ئیشەکەدام و لە خۆمەوە قسە ناکەم. دەزانم کە دوای ماوەیەک پەشیمان دەبیتەوە.

بە هەرحاڵ، قەناعەتی پێ هێنام کە نەیفرۆشمەوە. دوای ماوەیەک بازاڕ شکا و پشکەکانم بە زەرەر فرۆشتەوە. ئەوە حاڵەتێک بوو کە تیایدا باوەڕم بە دڵی خۆم نەکرد و بووە مایەی زیان بۆم.

دەتوانم بڵێم کە گەورەتری هەڵەکانی ژیانم ئەو کاتانە بوون کە دڵم حەزی بە کردنی شتێک نەکردووە، بەڵام باوەڕم بە خۆم نەبووە و ڕێگەم داوە کەسێکی تر لەجیاتی من بڕیار بدات و منیش کوێرانە شوێنی کەوتووم.

جا لەبەر ئەوە هاوڕاتم ترەیسی گیان، دەزانم لە دنیای وەبەرهێنانیشدا هەستەکانمان ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن. من هەمیشە گوێیان لێ دەگرم، بەڵام ناهێڵم پێش خۆم بڕیار بدەن. من کاری خۆم دەکەم، لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی خۆم دەکەم، خۆم پەروەردە دەکەم و پرسیار دەکەم. ئەگەر هەمووشتەکان یەکیان گرتەوە، ئینجا هەنگاوی بۆ دەنێم.

لێسلی بە پێکەنینەوە ووتی: دڵم دەڵێ کە هەموومان سەرکەوتوو دەبین لەم پڕۆسەیەدا.

کیم: با پشوویەک وەربگرین، پاشان پێش ئەوەی کۆتایی پێ بهێنین، بەسەرهاتێکتان بۆ دەگێڕمەوە.

## بەشی بیست و سێ
## "بەوپەڕی خێراییەوە بڕۆ"

کریسمسی ساڵی ٢٠٠٤ بوو. ڕۆبێرت دیاریەکی لەناو پاکەتێکدا بۆ هێنام. هێندە بە پەرۆش بووم بیکەمەوە، پاکەتەم دڕاند ووتم بزانم چی تیایە. کە پاکەتەکەم کردەوە، سەیر ئەکەم دوو بلیتی تیایە نووسراوە:

کۆرسی پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل

خولێکی چوار ڕۆژیی

فێرگەی بۆنراند، بۆ شۆفێرە بەتواناکان

فینیکس، ئەریزۆنا

کەمێک سەرمسووڕمابوو، ئاخێر هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە دیاری سەری ساڵم کۆرسێکی فێربوونی پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل بێت. بە ڕۆبێرتم ووت: ئەمە چییە؟ من ئەمە چی لێبکەم؟

ڕۆبێرت: دە تۆ جوان سەیریکە! دوو دانەیە، دانەیەک بۆ من و دانەیەک بۆ تۆ. کۆرسێکی چوار ڕۆژییە. ووتم با کاتێکی خۆش بەسەر ببەین و پێکەوە فێربین.

ئێستا بابەتەکە کەمێک ڕوون بوو لەلام. هەرچەندە بۆ من تازە بوو، بەڵام بەهەرحاڵ، ڕۆیشتین.

**ڕۆژی یەکەم:**

ڕۆژی یەکەم من و ڕۆبێرت کەمێک دڵەتەپەمان بوو. ئاخێر یەکەم جار بوو کۆرسێکی ئاوا ببینین. مامۆستاکە هاتە ژوورەوە و ووتی: پێشنیار ئەکەم هەمووتان کارتی بیمە بکڕن بۆ ئۆتۆمبێلەکان. چونکە لەوانەیە بشکێن لەکاتی لێخوڕیندا، بۆیە بیمەتان هەبێت باشترە.

لەدڵی خۆمدا ووتم: کورە شکانی چی؟ بەخوا من هەر وێرانی دەکەم پارچەی ساغی ناهێڵمەوە.

دواتر هەموو ئامادەبوان کە ژمارەیان ١٢ کەس دەبوو، هەڵسان و خۆیان ناساند. من و ڕۆبێرت تەماشایەکی یەکترمان کرد و بۆمان دەرکەوت کە هەڵەیەکی گەورەمان کردووە. چونکە من و ئەوی لێ دەرچێ، هەموویان ساڵەها بوو ئەزموونیان لەم بوارەدا هەبوو و گەلێک لێهاتوو و شارەزا بوون.

زۆربەیان لە ئەفریقا و ئەوروپا و یابان و ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمریکاوە هاتبوون. تەنها من و ڕۆبێرت خەڵکی ئەریزۆنا بووین. یەک یەک هەڵساین وەڵامی مامۆستاکەمان دەدایەوە کاتێک پرسی کە بۆچی هاتووین بۆب کۆرسێکی ئاوا؟ دەرکەوت ئەوانی دیکە هاتبوون زانیاریەکانیان تازە بکەنەوە، بەڵام من هەڵسام و ووتم: من تەنها هاتووم کاتێکی خۆش بەسەر ببەم. ئەوەم ووت و دانیشتمەوە. ئا، بیرم چوو پێتان بڵێم، من تاکە خاتوون بووم لەنێوانیاندا. ئەو ڕۆژە دوای خۆ ناساندن، بە ئۆتۆمبێلێکی (کۆرڤێت) ڕاهێنانیان پێ کردین و ڕۆژی یەکەم هەموو شتێک باش بەڕێوەچوو.

**ڕۆژی دووەم:**

ڕۆژی دووەم مامۆستاکە ووتی: دوای ئەوەی کە دوێنێ ڕاهێنانتان لەسەر (کۆرڤێت)ەکان کرد، ئەمڕۆ پێشبڕکێیان پێ دەکەین. سەیرێکی ڕۆبێرتم کرد و ووتم: دە فەرموو! ئەمە بیرۆکە جوانەکانی تۆ بوو.

سەرتان نەیەشێنم، دەستمان کرد بە پێشبڕکێکە و لە جاری یەکەم و دووەمدا من دواکەوتم. بەڵام لە جارەکانی تردا ووتم بەخوا ئەم ناسکیە بۆ ئێرە نابێت، وا باشترە کەمێک توندوتیژ بم. بۆیە لە جاری سێهەمدا توانیم یەکەم بم. دووەمەکە کوڕێک بوو. دواتر بیستمەوە کە زۆر بێتاقەت بووە بەوەی کە کچێک لێی بردووەتەوە. کە زانیم بێتاقەت بووە، ئەوەندەی تر دڵم خۆش بوو!

**ڕۆژی سێیەم:**

ڕۆژی سێیەم زیاتر بابەتەکان تیۆری بوون. بەڵام پێیان ووتین کە ڕۆژی چوارەم، واتە سبەی، چیتر ڕاهینان بە (کۆرڤێت)ەکان ناکەن و لەمەولا ڕاهێنان لەسەر ئۆتۆمبێلی جۆری (فۆرمولا وەن)دەکەن. جا بۆ ئەوانەی کە نازانن فۆرمولا وەن چییە، فۆرمولاوەن ئەو جۆرە ئۆتۆمبێلانەیە کە تایبەت بە پێشبڕکێ دروستکراوە و تەنها جێگەی یەک کەسی هەیە. کەواتە کەس لەگەڵتدا نییە و خۆت خاوەنی خۆتیت. ئەو شەوە بە هەزار حاڵ خەووم لێکەوت. هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت سبەی چی ڕووبدات. هەموو ئەو تێکشکان و پێکدادانەم بیردەکەوتەوە کە لە تەلەفزیۆندا بینیبووم. بە جارێک زیرەم کردبوو.

رۆژی چوارەم:

بە بێدەنگی بەیانیەکەی ڕۆیشتم بەرەو پۆلەکە بە کۆڵێ ترسەوە. کە سەیرم کرد پۆلەکە هەمووی بێدەنگ بوو. بۆم دەرکەوت کە ترسەکە تەنها لە مندا نییە، بەڵکو هەمووی دەترسێت. بەڵام وا خۆیان دەردەخەن کە ناترسن و خەمی ئەوەیان نییە لەم پێشبڕکێیەدا لەناوبچن.

مامۆستاکە دوای ئەوەی کە چەند قسەیەکی بۆ کردین، پێی ووتین کە بڕۆین خۆمان ئامادە بکەین و جلەکان لەبەر بکەین بۆ پێشبڕکێ. لە ژووری خۆ گۆڕینەکەدا هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاخێر من خوا گرتبوومی هاتم بۆ ئێرە؟! کوا من و ئەمەیان ووتوە؟ بەهەرحاڵ، بە دنیایەک ترسەوە ڕۆیشتین بەرەو لێخوڕینی فۆرمولاوەن.

کە ڕۆیشتمە ناو ئۆتۆمبێلەکە زۆر ترسناک بوو. تەنها جێگەی یەک کەس دەبووەو و لێخوڕینی زۆر جیاواز بوو لە ئۆتۆمبێلەکەی پێشتر. وورده وورده مەکینەکەم ئیش پێ کرد و کەوتمە جووڵە. کەمێک ڕۆیشتم هەتا تۆزێک ترسم لێی شکا. دوای دوو کاتژمێر لە ڕاهێنان، بڕیارمان دا دەست بکەین بە پێشبڕکێکە. کاتێک گەڕاینەوە بەرەو خاڵی دەستپێکردن، ئۆتۆمبێلەکە لەدەستم وەری گرت و سووڕا! دوای نزیکەی پێنج سووڕانەوە، ئینجا وەستا. وامزانی خۆم وەستاندوومە زۆر دڵم پێی خۆش بوو. نەمزانی ڕووم کردووەتەوە پێچەوانەیت ئاراستەی ئۆتۆمبێلەکانی دیکە.

**وانەیەک کە ژیانمی گۆڕی**

دوای ئەوەی کە ئۆتۆمبێلەکەم ڕێک کردەوە، دەستم کرد بە ڕۆیشتن. هەرچەندە منیش بە ئاراستەی ئەوان دەڕۆیشتم، بەڵام هەستم دەکرد کە زۆر خاووم و هەموویان پێشم کەوتوون. زۆرم لا سەیر بوو، چونکە لە پێشبڕکێی (کۆرڤێت)دا من پێش هەندێکیانم دەدایەوە، بەڵام لەمەدا هەموویان پێش منیان دایەوە و هەموویان لەمن خێراتر بوون. زۆر بێ تاقەت بووم. ئۆتۆمبێلەکەم لە لایەکەوە ڕاگرت و (لێس) هات بۆلام. لێس مامۆستاکە بوو.

ووتی: وابزانم ئەمڕۆ ئیشەکانت نایەت بەدەستەوە.

ووتم: زۆر سەیرە، لەم پێشبڕکێیەدا هەموویان پێشیان دامەوە.

ووتی: بەنزینی تەواوت داوەتێ؟

ووتم: مەبەستت ئەوەیە قاچم کەپس کردبێ لێی تا خوارەوە؟

ووتی: بەڵێ، بەنزینی تەواوت پێ داوە؟ ئەوە کۆتا خێرایی ئۆتۆمبێلەکەیە؟

ووتم: نەوەڵا

ووتی: بەڵام ئەوان بەنزینی تەواویان داوەتێ، دەزانی؟!

وتم: واتە ئەوان بۆیە پێشم دەکەون چونکە بە هەموو خێراییانەوە دەڕۆن؟

پاشان لێس سەیرێکی کردم و پێکەنی. قسەیەکی کرد کە هەموو ژیانمی گۆڕی. لێس ووتی: کیم! تۆ ئەو هەمووەت بڕیوە بۆ ئەوەی ئاوا لاواز دەرکەویت؟ ئەمەی ووت و ڕۆیشت.

لێس ڕۆیشت، بەڵام قسەکانی هەر لە مێشکمدا مابووەوە. من ئەو هەمووەم بڕیوە حەیفە ئاوا لاواز دەرکەووم. ووردە ووردە ڕۆیشتمەوە ناو پێشبڕکێکە. دەمزانی کە لێس سەیرم دەکات. ئەمجارە بە هەموو هێزی خۆم بەنزینم پێ دا. بەڵێ! ئۆتۆمبێلی

یەکەمم تێپەڕاند! لە ناخی خۆمدا هاوارم دەکرد: هاتمەوە ڕیزی پێشبڕکێکە!

ئەوەی سەیر بوو ئەوە بوو کاتێک خێرا دەڕۆیشتم، لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکە تامێکی تری هەبوو. ئێستا زۆر باشتر دەمتوانی کۆنتڕۆڵی بکەم. هێندە قووڵ ڕۆیشتبوومە ناو بابەتەکەوە، بیرم نەمابوو کە کاتەکە تەواو بووە. کە دابەزیم زۆر دڵم خۆش بوو.

لێس هات بەرەوپیرم و ووتی: زۆر باش بوویت، دەستخۆش! باش ڕۆیشتیت.

ووتم: ئەزانی ئاوا زۆر باشتر بوو؟ هەستم دەکرد هەتا خێراتر بڕۆم باشتر دەتوانم شۆفێری بکەم. ژیانیش هەر وایە، دەبێت بە خێرایی بڕۆیت.

لێس ووتی: شتێکی تر هەیە کە پێم نەوتوویت. نەمدەویست بیانوویەکت بدەمێ کە وات لێ بکا خاو بڕۆیت.

ووتم: چی بوو؟

ووتی: زۆرینەی خانمان کە ئەم کۆرسە وەردەگرن سەرەتا ناوێرن بەنزینی بدەنێ.

ووتم: وەک من.

ووتی: بەڵام یەک جیاوازی هەبوو.

ووتم: جیاوازی چی؟

ووتی: ئەوان، دوای ئەوەی کە ئەو قسانەم بۆ دەکردن کە بۆ تۆم کرد، هێشتا نەیاندەوێرا خێرا بڕۆن. بەڵام ئەوەم بە تۆ نەووت، بۆ ئەوەی تۆش نەڵێیت مادام ئەوان نەیانتوانیوە، منیش ناتوانم. با شتێکت پێ بڵێم: ئەگەر بەنزینی تەواوی نەدەیتێ، خۆشی ئەم یاریە لەدەست دەدەیت.

منیش لە دڵی خۆمدا ووتم: ئەگەر لە ژیاندا خێرا نەڕۆیت، خۆشی ژیان لەدەست ئەدەیت.
ئەو کۆرسە ژیانی منی گۆڕی.

# بەشی بیست و چوار
# "نانی ئێوارە و ئاهەنگ گێڕان"

" لە منداڵییەوە تا ١٨ ساڵیی، کچان پێویستیان بە دایک و باوکێکی باشە. پاشان تا ٣٥ ساڵیی، پێویستیان بە ڕوخسارێکی باشە. دواتر تا ٥٥ ساڵیی، ئیویستیان بە کەسایەتیەکی باشە. لەدوای ئەوە، پێویستیان بە داهاتێکی باشە."

- سوفیتەکەر -

ترەیستی: وابزانم کۆتاییمان پێ هێنا

کیم: دوو ڕۆژەکە تەواو. ئێستا کاتی نانی ئێوارەیە.

خۆمان گۆڕی و ڕۆیشتینە دەرەوە بۆ نانی ئێوارە. لێسلی لەسەر مێزی نان خواردنەکە ووتی: ئەم دوو ڕۆژە ژیانی منی گۆڕی. مێشکم نوقمی هەموو ئەو قسانە بووە کە کردوومانە و لێتانەوە فێربووم. بەڕاستی مایەی سووپاسن.

ترەیستی: دڵنیام لەوەی کە ژیانم هیچ کات وەک پێشتر نابێت. پێش ئەوەی بێمە ئێرە، دەمزانی کە بەو هەموو کێشە داراییەوە کە هەمە، بەبۆنەی داخرانی کۆمپانیاکەوە، ئەگەر شتێک نەگۆڕم، بە دڵنیایەوە هەمان ئەو کێشانە بەردەوام دەبن. بەڵام ئێستا، بۆ یەکەمین جار، هەست دەکەم کلیلی ژیانی خۆم بەدەستی خۆمەوەیە.

ووتم: بەڕاستی دڵخۆشم بۆ ئەو پاڵپشتیەی کە لەیەکترەوە وەری دەگرین. من ئێستا دەبێت لە جاران سوورتر بم لەسەر ئەوەی کە دەبێط بە خەونەکەم بگەم. چونکە ئەگەر پێی نەگەم، ئێوەش بێ هیوا دەکەم. خۆشحاڵ و سووپاسگوزارم کە بەشێکم لەم گرووپە جوانە.

گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەدا.

پات: ئەم بەیانیە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئێمە پێش ٢٠ساڵ، لە (هۆنۆلۆلۆ) پێکەوە بووین. هەموومان بیرمان لای ئەوە بوو کە دابمەزرێین. بەڵام ئێستا، دوای ٢٠ ساڵ دووبارە پێکەوەین، بەڵام ئەم جارە بیر لە پێکەوەنانی سەروەت و وەبەرهێنان دەکەینەوە.

لێسلی: ئەمە گۆڕانکاریەکی زۆر گەورەیە. من وەک هونەرمەندێک دوو ڕۆژم تەرخان کردووە بۆ ئەوەی وانەی سەربەخۆیی دارایی وەربگرم. ئەمە مایەی ئەوپەڕی دڵخۆشیمە. لە کاتێکدا پێشتر دەمووت کە پارەپەیدا کردن و وەبەرهێنان زۆر دوورە لە منەوە. بەڵام نا، ئێستا دەزانم کە دەتوانم بیکەم و زۆریش دڵخۆشم.

ترەیسی: هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە ئەو ترسەی من هەمە لە داخرانی کۆمپانیاکە و هەژاربوونمان، ئەو ترسە هی ئەوەیە کە ڕێگەمان داوە کەسانێکی تر کلیلی خۆشبەختی ئێمە بگرن بە دەستیانەوە و کۆنترۆڵی باری دارایی ئێمە بکەن. ئێمە چاوەڕوانین کە بەڕێوبەرەکەمان و خاوەن کارەکەمان پێمان بڵێ کە داهاتوومان چۆنە.

ئێستا بەوپەڕی ئازایەتیەوە دەڕۆمەوە ماڵەوە و لۆمەی خۆم دەکەم کە پێشتر هەستم بەوە نەکردووە. بەڵام دەی، (ڕەنگ بگەیت باشترە لەوەی هەر نەگەیت) ئێستا ترسم لەوە نییە دەربکرێم، چونکە دەزانم هەنگاوێکی نوێ یە بەرەو بزنسە نوێیەکەم. ئەمە پێی دەڵێن "گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەدا"

ووتم: هەر بژی ترەیسی! دات لە بنی کولەکەکە! ئەمە گۆڕانکارییە لە بیرکردنەوەدا. ئێستا پێت وانییە کە موچەکەت تاکە سەرچاوەی داهاتی تۆیە و ئەگەر ئەوە نەبێت دەمریت لەبرسا. وایە؟

گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەدا.

پات: ئەم بەیانیە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئێمە پێش ٢٠ ساڵ، لە (هۆنۆلۆلۆ) پێکەوە بووین. هەموومان بیرمان لای ئەوە بوو کە دابمەزرێین. بەڵام ئێستا، دوای ٢٠ ساڵ دووبارە پێکەوەین، بەڵام ئەم جارە بیر لە پێکەوەنانی سەروەت و وەبەرهێنان دەکەینەوە.

لیسلی: ئەمە گۆڕانکاریەکی زۆر گەورەیە. من وەک هونەرمەندێک دوو ڕۆژم تەرخان کردووە بۆ ئەوەی وانەی سەربەخۆیی دارایی وەربگرم. ئەمە مایەی ئەوپەڕی دڵخۆشیمە. لە کاتێکدا پێشتر دەمووت کە پارەپەیدا کردن و وەبەرهێنان زۆر دوورە لە منەوە. بەڵام نا، ئێستا دەزانم کە دەتوانم بیکەم و زۆریش دڵخۆشم.

ترەیسی: هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە ئەو ترسەی من هەمە لە داخرانی کۆمپانیاکە و هەژاربوونمان، ئەو ترسە هی ئەوەیە کە ڕێگەمان داوە کەسانێکی تر کلیلی خۆشبەختی ئێمە بگرن بە دەستیانەوە و کۆنترۆڵی باری دارایی ئێمە بکەن. ئێمە چاوەڕوانین کە بەڕێوبەرەکەمان و خاوەن کارەکەمان پێمان بڵێ کە داهاتوومان چۆنە.

ئێستا بەوپەڕی ئازایەتیەوە دەڕۆمەوە ماڵەوە و لۆمەی خۆم دەکەم کە پێشتر هەستم بەوە نەکردووە. بەڵام دەی، درەنگ بگەیت باشترە لەوەی هەر نەگەیت. ئێستا ترسم لەوە نییە دەربکرێم، چونکە دەزانم هەنگاوێکی نوێ یە بەرەو بزنسە نوێیەکەم. ئەمە پێی دەڵێن "گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەدا"

ووتم: هەر بژی ترەیسی! دات لە بنی کولەکەکە! ئەمە گۆڕانکارییە لە بیرکردنەوەدا. ئێستا پێت وانییە کە موچەکەت تاکە سەرچاوەی داهاتی تۆیە و ئەگەر ئەوە نەبێت دەمریت لەبرسا. وایە؟

ووتـی: بەدڵنیـاییەوە وایە. هەمـوو ژیـانم وا بەڕێ کردبـوو کە پـێم وابوو موچە تاکە سەرچاوەی داهاتە. وە هەموو موچەی تۆ ئەوەیە کە خاوەن ئیش بتداتێ و سنووردارە. بەڵام ئێستا شکور مێشکم گۆڕاوە. ئێستا پێم وایە دەتوانم بێ سنوور پارە پەیدا بکەم. ئێستا خۆم بڕیار دەدەم چەند پەیدا بکەم لە ڕێگەی بزنسـەکەمەوە. ئەم گۆڕانکـاریە لە بیرکـردنەوەدا، ئەو دوو ڕۆژەی کـردە دوو ڕۆژی زێڕین.

لێسلی: پێشتر پێم وابوو کە تاکە ڕێگە بۆ ئەوەی پارەی زیاتر پەیدا بکەیت، ئەوەیە کە لەپاڵ ئیشـەکەی خۆمـدا ئیشـی دووەم و سـێهەم بکەم. ئێستا پێم وایە ئیشی خۆم تاکە هۆکارێکە کە من بگەیەنێتە سـەرکەوتن و خەونەکەم. ئێسـتا، زۆر جیـاوازتر دەڕۆمە سـەر کـارەکەم. ئێسـتا، جیـاوازتر دەڕوانـم لە مـووچە و خەرجیەکـانم. ئێستا، لەوسـەری تـونێلەکەوە تروسـکاییەک دەبینم و بەرەوپیـری دەڕۆم.

گۆڕانکاری لە خۆتەوە دەستپێدەکات.

ووتم دەزانن زۆر سەیرە! کاتێک خۆت دەگۆڕێیت، شتەکانی چوواردەورت هەمووی دەگۆڕین بەدواتا.

لێسلی: ئێستا من جیاوازتر سەیری ئیشەکەم و مووچەکەم و خەرجیەکانم دەکەم، خۆ ئەوان هەر وەک خۆیانن، بەڵام ئەوە منم گۆڕاووم. وە ئەم گۆڕانکاریە، وای لێ کردووم بیرکردنەوەم بگۆڕیت بەرامبەر ئەوانیش. باشە کچینە، دەبێ بیرکردنەوەم دەربارەی هاوسەرەکەی پێشووم بگۆڕێت؟

پات بە پێکەنینەوە ووتی: دەزانم دەتەوێت بڵێیت چی. منیش حەزم دەکرد هاوسەرەکەم بگۆڕێت و هاوکارم بێت. بەڵام لە ئێستادا دەزانم کە ئەوە ئەرکی منە. من هەوڵی تەواو دەدەم کە ڕازی بکەم و پاشان وورده وورده هەنگاو دەنێم.

ووتم: کێ ناڵێ بەبۆنەی ئەو گۆڕانکاریانەی مێشکی تۆوە، ئەویش ئێستا گۆڕاوە؟

پات زەردەخەنەیەکی کرد و وەک ئەوەی بیەوێت بابەتەکە بگۆڕێت، ووتی: من پێم باشە بەردەوام بین لەم جۆرە کۆبوونەوانە. ئێوە دەڵێن چی؟

لێسلی: دە وەڵایی من خەریک بوو وا بڵێم!

پات: من پێم باشە تا شەش مانگی تر، هەموو مانگێک یەک کاتژمێر بە تەلەفۆن قسە بکەین بە گرووپ. چونکە ئێمە سەرەتایین و پێویستمان بە هاوکاری کیم هەیە. وا نییە؟ ئێمەش هەموومان پێمان باش بوو. پات کات و ڕۆژی یەکەم پەیوەندی تەلەفۆنی دانا. هەموومان خواردنەوەکانمان بەرز کردەوە و ترەیسی ووتی:

سوپاس بۆ هەمووتان. دوای ماوەیەکی زۆر، ئێستا هەست دەکەم خۆم کۆنترۆڵی ژیانی خۆمم بەدەستە. بۆ ژیانێکی خۆش، بۆ

تەندرووستیەکی باش، بۆ خۆشبەختیی و داهاتێکی خەیاڵی، بەخۆشی!

کۆتایی

ئەها، بیرم چوو پێتان بڵێم. کە گەڕاینەوە ماڵەوە، پات تەماشای کرد کە جانیس نامەیەکی دەنگی ناردووە و دەڵێ: من زۆر شێت و سەرلێشێواو بووم. بەخوا بێ ئەقڵ بووم کە ئەو کۆبوونەوە گرنگەم لەدەست دا بۆ ئەو هەتیوە قوڵ برە. دەرکەوت کە کەسێکی بەلاشخۆری بێ ئەقڵە. دڵنیام کە دوو ڕۆژی زۆر خۆشتان پێکەوە بەسەر بردووە. خۆزگە لەوێ بوومایە. من زۆر دەبەنگ و بێ مێشک بووم کە هەتیوێکی ئاوام بە داهاتووی خۆم دەزانی، لە کاتێکدا دەکرا لەگەڵ ئێوە، خۆم داهاتووی خۆم درووست بکەم.

قسەی کۆتایی:

زۆرینەی خەڵک پێی وایە کە پارە گرنگترین شتی ژیان نییە. خۆ ئەکرێت ئەم قسەیە ڕاست بێت، بەڵام پارە کاریگەری لەسەر هەموو شتە گرنگەکانی ژیان هەیە. بۆ نموونە تەندرووستیت و پەروەردەی منداڵەکانت و جۆری ژیانت.

بە گشتی پارە دەتوانێت دوو شت دەستەبەر بکات: دەکرێ کۆیلایەتیت بۆ بهێنێت، دەکرێ سەربەخۆییت بۆ بهێنێت. کۆیلایەتی ئیش و کۆیلایەتی مووچە و هەندێک کات کۆیلایەتی پەیوەندیە سۆزداریەکانیش. یان ئەوەتا سەربەخۆیی هەڵدەبژێتیت لەوەی کە خۆت چۆن دەتهەوێت ئاوا بژیت.

بەوەی کە پارەم بە گرنگ سەیرکردووە لە ژیانمدا، من سەربەخۆییم دەستەبەر کردووە. ئەمە گرنگترین شتە بۆ من، چونکە من لەو کەسانەم کە پێم خۆش نییە کەس فرمانم بەسەردا بکات!

زۆر سوپاس بۆ خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە.



کیم کیۆساکی، هاوسەری نووسەری بەناوبانگ (ڕۆبێرت کیۆساکی)یە و لەدایک بووی ساڵی ١٩٥٧ ە. کیم یەکێکە لە نووسەر و کەسایەتیە بەناوبانگەکانی ئەمریکا بەو پێیەی لەگەڵ (ڕۆبێرت)ی هاوسەری، لەو کەسانە بوون کە لە سفرەوە خۆیان بنیاد ناوەو ئێستا ملیۆنێرە. کیم خاوەنی نزیکەی ٤٠ ملیۆن دۆلارە لە ئێستادا و وە لە سەرانسەری جیهاندا هانی خانمان دەدات بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی و پشت بەستن بە تواناکانی خۆیان.

کیم نووسەری چەندین کتێبەی بەناوبانگە شان بەشانی ڕۆبێرت کیۆساکی هاوسەری. بەناوبانگترین شاکاریان کتێبی "باوکی زەنگین و باوکی هەژار"ە کە پێشتر لەلایەن بەکوردیکارانی ئەم پەرتووکەوە بەکوردی کراوە و وێنەکەی لە خوارەوە ئاماژەی پێ دراوە.

## ژیاننامەی بەکوردیکار

تاژان جەبار، لەدایبک بووی ساڵی ١٩٩٤ ی شاری سلێمانی.
دەرچووی بەشی ئینگلیزی زانکۆی سلێمانی و خاوەنی بڕوانامەی فێرکاری زانکۆی (ئۆریگن)ی ئەمریکییە.
خاوەنی بڕوانامەی مینی ماستەرە لە بواری بەڕێوەبردنی بزنس دا و ئەزموونی چەندساڵەی بواری وەرگێڕانی هەیە

## بەرهەمەکانی پەیجی زەنگین:






هەرێمی کوردستانی عێراق
Kurdistan regional - Iraq
Council of ministers



سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری ولاوان
بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان
کتێبخانەی گشتی سلێمانی
بەشی سپاردن

ژمارە:
رۆژ: / /کوردی ٢٧١٩

رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
المكتبة العامة/ السليمانية
ژمارە: ٢٦٧٧
بەروار: ٢٢/ ١٢/ ٢٠١٩

بۆ/



بابەت / ژمارەی سپاردن

بەپێی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣
ژمارەی سپاردنی( ٢٧٧٤ ) ی ساڵی ٢٠١٩ تەرخانکراوە بۆ کتێبی (خاتوونی زەنگین ) کە لە نووسینی ( کیم کێوساکی )ە، وە لە وەرگێڕانی ( تاژان جەبار عەلی )ە، بە تیراژی ( ١٠٠٠ ) دانە ، کە بابەتەکەی ( رۆشنبیری دارایی )ە، بە مەرجێك (٥) دانە لە کتێبەکە بۆ بەشی سپاردن رەوانە بکرێت.

لەگەڵ ڕێزماندا



ئالان محمد رؤوف
بەڕێوەبەر

تێبینی:

١- دەستەواژەی سپاردن بەم شێوەیە لەسەر کتێبەکە چاپ بکرێت، لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن ( ) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە.
٢- هەر چاپخانەیەك پابەند نەبێ بە ناردنەوەی (٥) دانە لە کتێبەکە، ژمارەی سپاردنی نادرێتێ.
٣- ئەم نووسراوە سکان بکرێت ولە دوا لاپەڕەی کتێبەکەدا دابنرێت .

وێنەیەك بۆ/
- دوسیەی سپاردن

slemanylibrary@yahoo.com
www.slemanylibrary.com
ژمارەی تەلەفۆن/ ٣٢٠٢٧١٦

بۆ هەموو ئەو خانمانەی کە دەیانەوێت پشت بە خۆیان ببەستن و نەبن بە بار بەسەر کەسەوە. بۆ ئەو خانمانەی کە دەیانەوێت کلیلی سەرکەوتنی خۆیان، بەدەستی خۆیانەوە بێت .

ئەگەر تۆ:

- ناتەوێت جارێکی تر خەم لە بێ پارەیی بخۆیت.
- دەتەوێ خۆت بەرپرس بیت لە سەرکەوتنی خۆت.
- بێزار بوویت لەوەی چاوەڕوانی شاسواری خەونەکانت بیت .
- دەتەوێ بگەیت بە سەربەخۆیی دارایی .

ئەوا ئەم پەرتووکە بۆ تۆیە.

